ناوی کتێب:

# مێژووی جەنگە خاچییەکان

بابەت: مێژوو

نووسەر: پرۆفیسۆر د. ئاراس فەریق زەینەڵ

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ:چاپی یەکەم ٢٠٢٤

نرخ: ٥٥٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی تاران

{قَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ فَإِنِ انْتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ }.

سورة الأنفال - الآية (٣٩)

# پێڕست

## پێشەکی

مێژووی مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە تا ئەمڕۆ ململانێی بەردەوامی نێوان خودی مرۆڤەکانی بەخۆوە دیوە و هەرجارەو هۆکارێ یان چەند هۆکارێ هەبون تا ئەو ململانێیە رەگداکوتێ و بەردەوامی بەخۆوە ببینێ، بەرامبەر بەمەش بەردەوام خـوای گەورە پەیـامە ئاسـمانیەکانی خـۆی نـاردووە تـا ببـنە راستکەرەوەی باری مرۆڤەکان و رێکخەری پەیوەندیەکانی نێوانیان و تەواوکەری پەیامی پێشـوو، بـۆیە لەم رووەوە ئـایینی مەسـیحیەت هـات وەک تەواوکەرێ بـۆ جوولەکـایەتی و ئیسـلامیش وەک کۆتـا ئـایینی ئاسـمانی و تەواوکەری گشـتی ئایینەکانی پێش خۆی، بەڵام هەردەم ئایینی پێشوو هەوڵیداوە بەرامبەر ئایینی نوێ بوەسـتێ، هەر لەم روانگەشـەوە وەک قۆنـاغێکی مێژوویـی مەسـیحیەتی رۆژئـاوا بەهەردوو رەوتـی دژایەتـی قـووڵی مەسـیحیەت و ململانێـی دێرینـی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و بە چەند هۆکارێکی جیاجیا هەڵمەتی خاچیەکانی دەستپێکرد تا بتوانێ لەلایەکەوە هەژمـوونی خـۆی بەسـەر جیهـانی ئیسـلامیدا بسـەپێنێ و خاوەنـدارێتی کڵێسـایی بـۆ خـۆی بەرێـت و لەلایەکـی تریشـەوە رۆژهەڵات بکـاتە پاشـکۆیەکی رۆژئـاواو بیـرۆکەی پاشـاو گەدایـی خـۆی بەسـەر رۆژهەڵاتـدا بسـەپێنێ چـونکە گەورەترین بەربەست بەڵکو باشتر وایە بڵێین هەرەشە بۆ سەر جیهانی مەسـیحیەت و رۆژئـاوا لەو کـاتەدا جیهـان و دەسـەڵاتی ئیسـلامی بـوو کە بە بـزووتنەوەی فتووحاتی چەکداری و هزریش رۆژبەرۆژ پێشڕەوی دەکرد.

بەرامـبەر بەم هەڵـمەتە خاچییـانە بەرگریەکـی بەرچـاو لە جیهـانی ئیسـلامیدا سەریهەڵدا لە کاتێکدا خودی جیهانی ئیسلامی لە ململانێ و نـاکۆکی نێوخۆییدا بـوو و دەسەڵاتە خۆجێییەکان یەکتریـان قبووڵ نەدەکرد و خیلافەتیش لە لاوازیدا بـوو، بەڵام کەسـانێ لەو مەیـدانەدا دەرکەوتـن و توانییـان ئەسـپی خۆیـان تاوبـدەن و بەهۆی دڵسۆزی و لێبڕانیان بۆ سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان هەتاهەتایە ناویان لەبەرچـاوانی خەڵـک و لە پەڕە پرشنگدارەکانی مێژوودا بمێنێتەوە لەوانە نورەدین مەحمودو عیمادەدینی زەنگی و صەلاحەدینی ئەیوبی و زاهیر بیبرسی مەملووکی و چەندێکی تر کە دواجار توانییـان جیهانی ئیسـلامی لەو شاڵاوە خاچیـانە بپارێزن و گورزێکی کوشندە بدەن لە جیهانی مەسیحیەت و رۆژئاواش.

هاوکـات لەمیـانەی ئەو هەڵمەتـانەدا بێـزاری زۆری مەسـیحیەکانی رۆژهەڵات بەرامبەربە خاچیەکان دەرکەوت و بزاڤی موژدەبەری مەسیحیەتیش تەمومژی زیاتر

گرتی بەهۆی ئەو کارە کاولکاری و کوشت و بڕە بێبنەمایانەوە کە خاچیەکان ئەنجامیان دەدان، ئەو بابەتەش تا ئەمڕۆ هەر قسەی لەسەرە و وەک ڕەنگدانەوەیەکی نوێی ئەو بارە لەمڕۆدا کەسانێکی زۆر پێیان وایە سەرلەنوێ هاتنی ڕۆژئاواییەکان بۆ ڕۆژهەڵات بە گشتی و جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی درێژەپێدەری هەمان ئەو هەڵمەتە خاچیانەیە.

بۆیە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ریشەی بابەتەکە و زانینی وردەکاری کێشەو ململانێکانی ئەو دوو قۆناغەو هەروەها وەک بوونی سەرچاوەیەکی نوێ بەزمانی کوردی سەبارەت بە مێژووی خاچیەکان و هەڵمەتەکانیان بۆ جیهانی ئیسلامی بە پێویستمان زانی ئەم نوسینە بخەینە ناو کتێبخانەی کوردیەوە تا خوێنەری کورد بە گشتی و خوێندکارانی مێژوو بە تایبەتی لێی سوودمەند بن و ببێتە سەرچاوەیەکی بەردەستیان بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر لەو بارەیەوە، لەم نووسینەشدا کە دابەشمان کردووە بۆ دوانزەبەش تیایدا باروودۆخی ئەوکاتمان بە گشتی خستوەتەروو و کورتەیەکمان لەسەر مەسیحیەت و ئیسلام و پێشرەوی ئەو ئایینانەمان باسکردووە، دواتر هۆکارەکانی هەڵمەتەخاچیەکان و سەرەتاکانی ئەو هەڵمەتە و بەرگری جیهانی ئیسلامی بەرامبەر بە هەر هەڵمەتێک لە قۆناغی خۆیدا و باسی یەک بە یەکی هەڵمەتەکانمان کردووە، دواجاریش ئەنجامەکانی ئەو هەڵمەتە خاچیانەمان باسکردون ودواتر لیستێکمان هێناوە سەبارەت بە ناو و ماوەی دەسەڵاتدارەکان، لەگەڵ دانانی ژمارەیەک نەخشە و وێنە وەک بەرچاوروونی.

بەو هیوایەی توانیبێتمان بە دیدێکی زانستی و بە شێوەیەکی چڕوپڕ و روون ئەو بابەتەمان خستبێتەروو وخوێنەریش بە هەر رەخنە و تێبینیەک ئەم نوسینەمان دەوڵەمەند بکات مایەی خۆشحاڵیمانە.

**ئاراس فەریق زمینەڵ**

**٢٠١١/١٠/٢٠**

arass72@yahoo.com

**دەروازە**

هێرش و پەلاماری خاچیەکان بۆ سەر ڕۆژهەڵات لە ئەنجامی کۆمەڵێک هۆکار و فاکتەری گرنگی تێکەڵ بە یەک بوو کە هانی دان بۆ ئەم شەڕە پیرۆزە، لەوانەش خراپی سیستەمی دەرەبەگایەتی و هەوڵدانی جوتیاران و کۆیلەکان بۆ ڕزگاربوون لە برسێتی و هەژاری و بیرکردنەوە لە تالان و دەستکەوتنی سەرمایەی چاک لە ڕۆژهەلاتی دەوڵەمەندا، باشترین بەڵگەش بۆ ئەو حاڵەتە بڕینی هەزاران کیلۆمەتر بوو بە بیانوی ڕزگارکردنی گۆڕی نادیاری مەسیح کە بۆ خۆی ڕۆژهەلاتی بووە، ئەمە جگە لە بیانوی گێڕانەوەی (خاچی خاچان- صلیب الصلبوت) کە مەسیحی لەسەر خاچ دراوە، هاوکات بەشداری کردنی دەیان میر و پاشا و خانەدان و پیاوە ئاینییەکانی ڕۆژئاوا لەگەڵ بازرگانەکانی ئیتاڵیا بۆ ئاسانکاری گواستنەوەی خاچیەکان لە ڕێگای دەریاوە بۆ ڕۆژهەلات، جگە لە کاریگەری پاپا و کڵێسا لە وروژاندنی هەست و سۆزی ئەوروپیەکان، ئەمەش بۆ خۆی ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری هەبوو لە پروپاگەندەی دەروونی و کۆنترۆڵ کردنی مێشکیان بۆ جێبەجی کردنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیان، دوور لە بەرژەوەندیەکانی مەسیحیەت لە قاڵبی سیاسەتی دەرەوەدا، ئەمە لەلایەک و لە لایەکی دیکەوە پشێویی و نائارامی و ئاڵۆزی ناوچەکە بەهۆی جەنگ و ململانێی میرنیشینەکان لەناو خۆیاندا، و دەست تێوەردانی زلهێزەکان لە کاروباری دەسەلاتی فاطمی و بێزەنتی، و لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسی بە دەستی سەلجوقیە تورکەکان، جگە لە قەرامیتەکان کە لە تێکچوونی بارودۆخی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی" المشرق الأسلامی " ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، هەروەها نەبوونی سەرکردەیەکی بەهێز و بەتوانا بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دۆخە نائارامە لە گرنگترین هۆکارەکانی هەڵمەتەکانی خاچیەکان بوون.

شەڕی خاچیەکان کە لە سەدەی (١٠)ی زاینیدا دەستی پێکرد، و لە سەدەی (١١) زاینیدا پەرەی سەند، بە لوتکەی زیندووکردنەوەی ئایینی و بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا دادەنرێت.

هاوچەرخەکان ئەم شەڕە بە "شەڕی پیرۆز" و "ڕێگای حەج کردن بۆ " کڵێسای دوا ڕۆژ و "گۆڕی مەسیح" دادەنێن، ئەگەر ئەم شەڕە بە "شەڕی پیرۆز" دابنرێت دەبێ بەپێی بنەماکانی سەردەمی خۆی شی بکرێتەوە، کە گیانی ئایینی بەسەر ئەو

سەردەمەدا زاڵ بووە، بەپێی ئەمەش جیهانی کۆتایی دەسەڵاتێکی ئایینیەو، ڕێگایەکی نوێیە بۆ ئاسمان، و دەبێت ئەم ڕێگەیە ببڕدرێت بۆ گەیشتن بە خۆشی تەواو لە پێناو پاکردنەوەی مرۆڤ هەروەها شەڕی خاچیەکان بە سیاسەتی دەرەوەی پاپا دادەنرێت کە هەڵگرانی بیر و باوەڕی مەسیحیەتی ئاراستە کرد بۆ ئەو شەڕە گەورانەی لە دژی موسڵمانان ئەنجام دەدران، ئەگەر شەڕی خاچیەکان ڕێگایەکی نوێ بێت بۆ پاکردنەوەی ڕۆحی مرۆڤ، ئەوا بەپێی ئەم واتایە ئەم جەنگانە بە بیروباوەڕی "تۆبەکردن" گرێ دراوە، لەبەر ئەوەی بە سیاسەتی دەرەکی بۆ کڵێسا دادەنرێت و شەڕی خاچیەکانیش گرێ دراوە بە پاکردنەوەی ئایینی، ئاراستەکردنی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و ئارەزووەکانی دەناسرێت بە ئاستی خودای لە سیستەمی سوارچاکیش، سەرەڕای بیرۆکەی حەج کردن بە کاریگەی بزوتنەوەی "کلوینە" کە لە سەدەی "١٠"ی زاینیدا دەستی پێکرد، بەمەش ڕێژەوی خاچیەکان زیاتر بووە و "بەیت ولمەقدیس" بوو بە ئامانجی خاچیەکان کە دەبوو بە کۆمەڵ و بە شێوەیەکی یەکگرتوو بۆی بڕۆن لە پێناو پاراستنیان، ژمارەی ئەو حاجیانەی بە سەرکردایەتی"ئوسقفی ماتینر" لە(ساڵی ٤٥٧ک/١٠٦٤ ز) ڕوویان کردە قودس نزیکەی (٧) هەزار کەس دەبوون، بەم شێوەیەش دەتوانرێت شەڕی خاچیەکان بە قۆناغێک لە قۆناغەکانی چاکسازی ئایینی لە ئەوروپا دابنرێت، ئەگەر سوارچاک ئاراستە بکرێت بۆ بەرگری لەسەر ئەوەی کەوا ڕەوایە، ئەوا سوارچاکی بە "کرۆکی" شەڕی خاچیەکان دادەنرێت، و ئەو سوارەی بە سەرپەرشتی و فەرمانی کڵێسا بەشداری شەڕی خاچیەکانی دەکرد حەز و ئارەزووە جەنگیەکانی تێر دەبوو، پێشیان وابوو بەتەواوی لە گوناهەکانیان پاک بوونەتەوە، لە ڕاستیدا پرۆسەی خۆ بەخت کردن لە لایەن هەردوو لاوە لە کاتی شەڕەکان بارودۆخێکی ڕەخساند بۆ ئەوانەی بڕوایان وابوو هەرگیز ناگەنە جیهانی کۆتایی، تەنها بەو شەڕانە نەبێت کە لەسەر زەوی دەیکەن، هەروەها ناگەنە بەرهەم و ئارەزووی خودا پەرستی و شەهیدی تەنها بە وەڵامدانەوە نەبێت بۆ ئارەزووەکانی سروشت، سەرەڕای دوژمنایەتی کۆنی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە هەر بەردەوام بوو، بەڵام بە شێوەیەکی نادیار و لە ژێر پەردەوە ماوەی (١٠٠٠) ساڵی خایاند.

له کۆچکردنی پێغەمبەر "د.خ" له مەککەوه بۆ مەدینه له(ساڵی١ ک/ ٦٢٢ز) تا گەمارۆدانی شاری ڤیەننا لەلایەن تورکەکانەوه له (ساڵی١٠٩٥ ک/ ١٦٨٣ز)، مەترسی داگیرکردنی موسڵمانەکان لەسەر ئەوروپا بەردەوام لەگوێی خەڵکی دەزرنگایەوه، لەم ڕووەوه شەڕی خاچیەکان به وەڵامدانەوەی ڕۆژئاوا دادەنرێت بەرامبەر مەترسیەکانی ڕۆژهەڵات، و وای له ڕۆژئاوا کرد پەلاماری ڕۆژهەڵات بدات و مەملەکەتێکی لاتینی مەسیحی لەسەر کەنارەکانی ئاسیا دابمەزرێنێت، خاچیەکان ویستیان بەم هەڵمەتانەیان ئەوروپا له مەترسی هێرشی موسڵمانەکان بپارێزن، بەڵام دواتر لەسەر دەستی تورکەکان دووبارە دەستی پێ کردەوه.

هێرشی خاچیەکان هەلێکی باش بوو بۆ بەرقەرار بوونی هێمنی و ئاشتی له ئەوروپا، له ئەنجامدا شارەکانی ڕۆژئاوا له سەدەکانی ناوەڕاستدا دروست بوون، هەموو پەیوەندییەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا له کاتی شەڕی خاچیەکاندا، بەشێوەیەکی دوژمنکارانه نەبووه، بەڵکو بەیت و لمەقدیس مەڵبەندی به یەک گەیشتنی هەردوو شارستانیەتەکه بووه و لەسەر ئەم زەویەش تەنها ڕۆژهەڵات زانست و زانیاریَ له ڕۆژئاوا فێر نەبووه، بەڵکو ئەوەی ڕۆژئاوا له ڕۆژهەڵات فێر بووه زۆر زیاتره بووه، هەروەها ئەو شارستانیەتەی له سەدەی (١٣ز)دا له ئەوروپا سەری هەڵدا تەنها به هۆی پارێزگاری و چاودێری و پشتگیری شەڕی خاچیەکانەوه نەبوو، بەڵکو به هۆی ئەو کەرەستانەوه بوو که به هۆی شەڕی خاچیەکان له ڕۆژهەڵاتدا هێنا بوویان.

## خوێندنەوەیەکی مێژوویی

لە سەرەتای سەدەی (٥ک/ ١١ز) جیهانی ئیسلامی ڕووبەڕووی هەڵمەتی خاچیەکان بوویەوە، کە ئامانجیان داگیرکردنی ڕۆژهەڵات و دامەزراندنی دەزگای سیاسی و زەمینە ڕەخساندن بوو بۆ داگیرکردنی سەربازی و دەست بە سەرداگرتنی ئابووری ناوچەکە، ئەمەش بە وروژاندنی هەستی ئاینی وەک فاکتەرێکی چەسپاندنی دەسەڵات، ئەم ڕاستیانەش لە هەڵمەتەکانی خاچیەکاندا دەردەکەون،[1] بە تایبەت لە هەڵمەتی یەکەمی خاچیەکاندا، کە توانیان چوار میرنشینی خاچی لە ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دابمەزرێنن، ئەم هەڵمەتە بەهۆی وتاری پاپا "ئوربانی دووەم"ەوە لە ساڵی (٤٨٩ک/١٠٩٥ز) بە دوو بەش دەستی پێکرد: بەشی یەکەم بە ناوی هەڵمەتی گەلان کە ئاکامێکی ئەوتۆی نەبوو تا هاتنی بەشی دووەم لە هەڵمەتەکە لە ساڵی (٤٩٠ک/١٠٩٦ز) کە بە هەڵمەتی شازادەکان ناسراوە، و بە چوار بەش بەرەو ڕۆژهەڵات پێشکەوتن بۆ بە دەستهێنانی ئامانجەکانیان، لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتانەدا چوار میرنشینی خاچی لە سەر خاکی موسڵمانان دامەزران و بۆ ماوەیەکی زۆر مانەوە.

بە سەرهەڵدانی "عیمادەدین زەنگی"[2] و رزگارکردنی شاری "رەها- ئورفە"[3] لە ساڵی (٥٣٩ک/ ١١٤٤ز)دا سەرەتای قۆناغێکی نوێی ئەم ململانێیە بوو، کە توانی بۆ یەکەم جار بەرەی ئیسلامی لە ناوچەکە یەکبخات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خاچیەکان و کۆنترۆڵ کردنی هەندێ شوێن لە ناوچەکە،[4] لە دوای کوژرانی

---

(١).رنسیمان: تأريخ الحروب الصليبية، ت- السيد الباز العريني، بيروت، لبنان، ج١/ص ١٦٩.

(٢). عماد الدين زنگي: ناوی (عماد الدين زنكي بن قطب الدين مودود بن عماد الدين زنكي) ناسراوە بەخاوەنی شەنگار، لەپاش کوچی دوایی (الملك الصالح اسماعيل) بوو بە والی (حلب) ، سوڵتان سەلاحەددین لە ساڵی (٥٧٩ک/١١٨٣ز) گەمارۆی شاری (حلب)ی دا،پاش ماوەیەک عماد الدين زنكي ناچار بوو شاری (حلب)ی دا بەدەستی سوڵتان سەلاحەددین بەرامبەر (شەنگار، نصيبين،خابور، الرقه،سروج). (ابن خلكان: س.پ، ج٢/ ل٣٣٠-٣٣١؛ابن تغري بردي: س.پ،ج٦/ ل١٤٤).

(٣). الرها: (ئورفە)- ئەم شارە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ڕوباری فورات، لە ناوچەی جەزیرەیە، نزیکەی (٢٤کم) لە شاری بەهاران (حەڕان) دوورە. (أبو الفداء: تقويم البلدان،٢٧٧؛ قدامة بن جعفر: الخراج و صناعة الكتابة،ص١١٣).

(٤). أبن القلانسي: م،ن، ص٢٨٤؛ بڕوانە: عمادالدين خليل: عماد الدين الزنگي، ط١، الدار العلمية، بيروت، ١٩٧١، ص٧١؛ د. الباز العريني: مصر في عصر الايوبيين، ط١، بيروت، ١٩٦٠، ص١٩.

عیمـادەدین لە سـاڵی (٥٤١ک/ ١١٤٧ز) "نـورەدین مەحمـود"[١]ی کـوڕی دەسـەڵات وەردەگرێت و درێژە دەدات بە سیاسـەتی بـاوکی لە یەکبوونی بەرەی ئیسلامی و ئاڕاسـتە کردنیـان بـۆ شـەڕی خاچپەکـان و ڕزگـارکردنی شـاری دیمەشـق، لەسـەردەمی ئەمـدا هەڵمەتـی دووەمـی خاچپەکـان لە نێـوان سـاڵانی(٥٤٠-٥٤٤ک/ ١١٤٥ز- ١١٤٩ز)دا،[٢] بە سـەرکردایەتی ئیمپراتـۆری ئەڵمـانی"کونرادی سـێهەم" و "لویسـی حەوتەم" پاشـای فەڕەنسـا و بە چاودێری پاپا "بجنیوسی سێهەم" دەسـتی پێکـرد، چارەنوسـی ئەم هەڵمەتە شکسـتێکی گەورە بـوو بـۆ خاچپەکـان بە دەسـتی موسڵمانەکان،[٣] دواتـر لەسـەر دەسـت بەسـەراگرتنی وڵاتـی میسـر ململانێ لەنێوان "نورەدین مەحمود" و"عموری یەکەم"سەری هەڵدا، ئەمەش لەپێناو دەسکەوتی مـادی و مرۆیی و کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکە، میسـر لە دوای دابڕانـی بە دەسـتی خیلافەتـی فـاتمی شـیعە مەزهەب بوژانـدنەوەی بەخـۆوەبینی، بەسـەرهەڵدانی "ئەسـەدەدین شێرکۆ"[٤] و وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لە سەردەمی خیلافەتی فاتمیەکان لە میسـر سەرەتای قۆناغێکی تازە دەستی پێکرد.[٥]

لە دوای مردنی(ئەسـەدەدین شـێرکۆ) سـەلاحەددینی ئەیـوبی بـرازای لەسـەر گۆڕەپـانی سیاسـی و سـەربازی میسـر سـەری هەڵـدا و تـوانی دوای ڕووخانـدنی

---

(١). (نورالدين محمود) لەساڵی (٥١١ک /١١١٨ز) لەشاری حەڵەب لەدایک بووە، کوڕی (عماد الدين زنگی)ە، پاش مردنی باوکی ساڵی (٥٤١ ک /١١٤٧ز) دەسەلاتی وەرگرت، فەرمانڕەوای (شام و جەزیرە و مصر) بووە، بەپاشای چاکەخواز ناوبانگی دەرکردووە، هەروەها بەچاکترین و دادپەروەرترین پاشاکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێت. (ابن الجوزی: المنتظم في تأريخ الملوك الامم، ج١٠/ ل٢٤٨-٢٤٩؛ سبط ابن الجوزی: مرآة الزمان في تأريخ الاعيان، ج٨/ ل٣٠٥،ابو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٢٧ -٢٢٩).

(٢). بڕوانە: أبن الاثير: الكامل في التأريخ، ج١١/ ص١٣١؛ أبو شامة: الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية، القاهرة، ١٢٨٧،ج١/ ص٦٩؛أبن القلانسي: م،ن، ص٣٠٤، عاشور: م.ن،ص٦٣.

(٣) . أبن الاثير: م،ن، ج٨ /ص٨- ٩؛أبن القلانسي: م،ن، ص٨٤- ٨٥؛ أبو شامة: م،ن، ج١/ ص١٣٣.

(٤) . ئەسەدەدین شێرکۆ: ناوی (شيركو بن شادی بن مروان) وەزیری خەلیفە (العاضد)ی فاتمی بوو لە مصر، شێرکۆ بەواتای (اسد الجبال-شێری چیاکان) دێت، سەرکردایەتی سێ هەڵمەتی کرد بۆ وڵاتی مصر لە سـاڵی (٥٥٩ک/١١٦٤ز) کە بە هەڵمەتـی یەکەمـی سـەر مصـر ناسـرا، و هەڵمەتـی دووەم لە سـاڵی (٥٦٢ک/١١٦٧ز)، و سێیەم لە ساڵی (٥٦٤ک/١١٦٨ز)، شایەنی باسە تەنها دوو مانگ و پێنج ڕۆژ لە وەزارەت مایەوە و لە ٢٢ی جەمادی الاخرە ساڵی (٥٦٤ک/١١٦٨ز) کۆچی دوایی کرد. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (عطا محی الدين: ئەسەددین شێرکۆ ژیاننامە و ڕۆڵی لە شەڕی خاچپەکاندا ).

(٥) . رنسیمان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٢/ ص ٦٠٠- ٦٠١.

خیلافەتی فاطمی، دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی ڕابگەیەنێت، و دەستی کرد بە ڕێکخستنی کاروباری وڵاتی میسر، دواتر لە شەڕی "حەتین"دا لە ساڵی (٥٨٢ک/ ١١٨٧ز) توانی گەورەترین سەرکەوتن لە مێژووی ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە دەست بهێنێت، کە لە ئەنجامدا بۆ یەکەم جار بووبە هۆی ڕزگارکردنی بەیت ولمەقدیس لە دوای داگیرکردنی لە هەڵمەتی یەکەمی خاچپەکاندا، بەمەش قەوارەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینی و ئابوری خاچپەکان لە ڕۆژهەلات بە دەستی سەلاحەددین لەناوچوو.[١]

دوای ئەم شکستە، خاچپەکان بۆ مانەوەیان لە ڕۆژهەلات بانگەشەیان کرد بۆ هەڵمەتێکی نوێ کە بە هەڵمەتی سێهەمی خاچپەکان ناسراوە، و بەگەورەترین هەڵمەتی خاچی دادەنرێت لە نێو ئەو نۆ هەڵمەتەی بۆ جیهانی ئیسلامی بە ئەنجامیان گەیاند، ئەم هەڵمەتە شێوە علمانیەتێکی لە خۆگرت بەهۆی بەشداری کردنی ئیمپراتۆری ئەڵمانی "فردریک بارباروسا"[٢] و هەردوو پاشا فەڕەنسی "فیلیب ئوگستس"[٣] و ریتشارد شێردڵ"ی[٤] ئینگلیزی، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم هەڵمەتە کاریگەری پاپای لەسەر نەبووە، بەڵکو وێنەیەکی گۆڕی مەسیحیان دروستکرد کە بە دەستی سوارێکی موسڵمان شێواندرابوو،ئامانجیشیان لەم کارە

---

(١) . أبن شداد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٦٤، ص٦٠- ٧٢؛ بڕوانە: أبن الاثير: الكامل في التأريخ، دار صادر لبنان، بيروت، ١٩٦٦، ج٩/ص١٧٦- ١٧٩.

(٢) . فردریک بەربەرۆسا: لە پاش مردنی مامی (کۆنرادی سێیەم)ساڵی (٥٤٧ک/١١٥٢ز)، فەرمانڕەوایی ئەڵمانیای گرتە دەست، بە یەکێک لە بەهێزترین کەسایەتیەکان دادەنرێت کە دەسەلاتی ئەلمانیایان وەرگرتووە، لە ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز)، بەشداری لە هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان کرد، بەلام ئامانجەکانی نەهاتەدی، لە کیلیکیا خنکا و سوپاکەی لەناوچوو .(حامد زيان: الامبراطور فردريک بربروسا و الحملة الصليبية الثالثة، ل١٢).

(٣) . فیلیب ئوگستس: یان فیلیبی دووەم کە ناز ناوی (الفاتح يا الغازی) بوو کوڕی لویسی حەوتەمە، لەساڵی (٥٦١ک/١١٦٥ز) لە شاری غینیس لە دایک بووە، و لە ساڵی (٥٧٦ک/١١٨٠ز) ببووە پادشای فەرەنسا، بەشداری هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکانی کرد بۆ ڕزگار کردنی قودس، شەڕی هەردوو پادشای ئینگلترای کرد (هنری دووەم و ریچاردی شێردڵ)ی کوڕی و توانی سەربکەوێت بە سەریاندا، لە ساڵی(٦٢٠ک/١٢٢٣ز) کۆچی دوای کرد. (بسام العسلي: فن الحرب الاسلامي، ج٤/ل٢٢٣، پەراوێزی (١)).

(٤) . ریتشارد شێردل: فەرمانڕەوای ئینگلترا بوو لە ساڵی (٥٨٥ک/ ١١٨٩ز) لە دوای مردنی باوکی "پاشا هنری دووەم" کە لە ساڵانی (١١٥٨ز/ ١١٨٩ز) حوکمرانی ئینگلترای دەکرد، زۆربەی ساڵانی حوکمی لە سەرکێشی سەربازی دەرەوە بەسەر برد چ لە هەڵمەتی خاچپەکان لە ڕۆژهەلات یاخود لە فەڕەنسا،( بڕوانە: رنسیمان: ن،م، ص٧٥- ٧٦).

وروژاندنی هەستی مەسیحیەکانی ئەوروپا بوو بۆ بە دەنگەوە هاتنی ئەم هەڵمەتە، خاچیەکان بە مەبەستی ڕزگارکردنی شاری قودس بەدوو ڕێگا گەیشتنە ناوچەکە، لەشکری ئەڵمانی بەڕێگەی وشکانی و لەشکری فەڕەنسی و ئینگلیزی لە ڕێگای دەریاوە بەڵام دواتر ئامانجەکەیان گۆڕی بۆ داگیرکردنی عەککا، لەشکری ئەڵمانی پێش گەیشتنی بۆ گەمارۆدانی شاری "عەککا"[1] لە ناو چوو، شەڕ لە ناوچەی عەککا ماوەی دوو ساڵی خایاند، دانیشتوانی شاری عەککا زۆر بێزار بوون و ناچار تەسلیم بوون، بەڵام هەڵمەتەکە بە ڕێککەوتنامەی "الرملە"[2] لە ساڵی(٥٨٨ک/ ١١٩٢ز) لە نێوان سەلاحەددین و "ریتشارد شێردڵ" کۆتای هات، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم هەڵمەتە لە بە دەستهێنانی ئامانجەکەێ شکستی هێنا کە ئەویش داگیرکردنی بەیت ولمەقدیس بوو،[3] بەڵام ئەمە کۆتایی هەڵمەتی خاچیەکان نەبوو، بەڵکو بیریان لە هەڵمەتێکی نوێ کردەوە، بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆر "هنری شەشەم" و بە هاوکاری و یارمەتی پاپا "انوسنتی سێهەم"، کە بە هەڵمەتی چوارەمی خاچیەکان ناسرا، ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە لە نێوان سالانی (٥٩٩- ٦٠١ک/ ١٢٠٢- ١٢٠٤ز) ڕوویدا، ئاڕاستەی ئەم هەڵمەتە بۆ ناوچە ئیسلامیەکان نەبوو، بەڵکو بە داگیرکردنی قوستەنتینیە کۆتایی هات، بەمەش گەورەترین کۆسپیان لە پێش موسڵمانەکان بە گشتی و سەلجوقیەکان بە تایبەت بۆ هێرش کردنە سەر ئەوروپا و داگیرکردنی لەناوبرد، ئەم هەنگاوە دواتر بوو بە بەڵایەکی گەورە بۆ سەر خاچیەکان و خودی پاپا و لاواز بوونی فاکتەری ئایینی و سەرهەڵدانی بەرژەوەندی سیاسی و بازرگانی، ئەمە جگە لە نەمانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی.

---

(١) . (عکا) شارێکی کۆنە دەکەوێتە سەر کەناری دەریای ناوەڕاست، سەر بە (فلسطین)ە لە سەروی حەیفا. ( ناصر خسرو: سفر نامە، ل٥٠-٥٢؛ یاقوت الحموی: معجم البلدان، ج٣/ ل٣٤٣-٣٤٤).

(٢) . (الرملة): شارێکی گەورە و مەزن بوو، دەکەوێتە باشوری رۆژهەلاتی (یافا) بەدووری (٢٢کم). (ناصر خسرو: س.پ، ل٥٤؛یاقوت الحموی: س.پ، ج٢/ ل٤٢١).

(٣) . أبن شداد: م.ن، ص١٢٣- ١٢٦؛ بڕوانە: أبن الاثیر: م.ن،ج٩/ ص٢٠٧- ٢١٤؛ أبن واصل، مفرج الكروب في أخبار بني ايوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٥٧، ج٢/ ص٣١٩- ٣٥٧؛ أبو شامة: م.ن،ج٢/ص١٥١- ١٥٦؛ المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق- محمد مصطفى، القاهرة، ١٩٣٩، ج١/ص ١٠٥، باركر: الحروب الصليبية، ت- الباز العريني، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٠، ص ٨٩١؛ نظير حسان السعداوي: تأريخ الحربي المصري، مكتبة النهضة، القاهرة، ١٩٥٧،ص ٢٥٢- ٢٥٣.

لە ڕاستیدا هەڵمەتی خاچیەکان بۆ سەر ناوچە ئیسلامیەکان لە شێوەی هەڵمەتی بچووک و لە پێناو بەدی هێنانی ئامانجەکانیان بەردەوام بوو، لەوانە هەڵمەتی منالانی خاچی لە ساڵی (٦٠٩ک/١٢١٢ز)دا کە منالێک بە ناوی "شیفن" توانی "٥٠" پەنجا هەزار منال کۆبکاتەوە و لە مارسلیاوە بەڕێکەوت بۆ باشووری ئەفریقیا، ئەم هەڵمەتە نەک ئەنجامی نەبوو بەڵکو هەواڵی منالەکانیش کەس نەیزانی،[1] هەروەها لە ساڵی (٦١٤ک/١٢١٧ز) هەنگارییەکان لەسەر بانگەوازی پاپا "انوسنتی سێهەم" خۆیان ئامادەکرد و توانیان بگەنە شاری عەککا، بەڵام هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێنا،[2] بە لاوازبوونی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵات و نەبوونی کێشە و ململانێ لە نێوان بنەماڵەی ئەیوبی، بۆ ماوەیەک ئاشتی باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەدا، بەڵام خاچیەکان بە نهێنی خۆیان بۆ هەڵمەتی پێنجەم ئامادەکرد و ئەمجارە بیریان لە وڵاتی میسر دەکردەوە، چونکە داگیرکردنی میسر کلیلی کونترۆڵ کردنی وڵاتی شام بوو، ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە لە نێو ساڵانی (٦١٥-٦١٨ک/١٢١٨- ١٢٢١ز) لەسەر خاکی میسر ڕوویدا بە سەرکردایەتی "حنادی برین"، لە هەمانکاتدا پاشای حەبەشەش بانگەشەی دەکرد بۆ رووخاندنی قیبلەی موسڵمانان، خاچیەکان لەم هەڵمەتەدا توانیان شاری دمیاط لە ساڵی (٦١٦ک/١٢١٩ز) داگیر بکەن و بەرەو شاری قاهیرە پێشکەون، بەڵام کەوتنە ناو سێ گۆشەیەکی ئاویی، ئەمەش ناچاری کردن داوای دانوساندن بکەن، لەئەنجامدا لە ساڵی (٦١٨ک/١٢٢١ز) ڕێککەوتننامەیان واژۆکرد بۆ ماوەی"٨"هەشت ساڵ، بەمەش خاچیەکان لە دمیاط کشانەوە و ئەم هەڵمەتە بێ ئەوەی هیچ ئامانجێک بپێکێ کۆتایی هات.[3]

سەرەڕای بەستنی پەیمانی نێوان خاچیەکان و موسڵمانەکان، (حنادی برین) چوو بۆ ئیتالیا بۆ بانگەواز کردن و ئامادەکردنی هەڵمەتێکی نوێ، و چاوی کەوت بە پاپا "أنوسنتی سێهەم" و ئیمپراتۆر "فردریکی دووەم" هەروەها سەردانی فەڕەنسا و

---

(١). بڕوانە: أبن الاثير: م.ن،ج ١٢/ص ٢٨٩- ٣١٤؛ أبو شامة: م.ن،ص٧٦٩؛ رنسيمان: م.ن،ج ٢/ص ٢٢٣.

(٢). عاشور: م.ن،ج٢/ ص٩٥٦- ٩٦٠.

(٣). أبن الاثير: م.ن،ج ١٢/ص٣٥٠؛ أبو شامة: م.ن،ص١٠٩- ١١٠؛أبن تغرى البردي: م.ن،ج ٢/ص ٩٦١- ٩٨٣؛ باركر: م.ن،ص ١٠٩-١١٠.

ئیسپانیای کرد و باسی بارودۆخی خاچپەکانی ڕۆژهەڵاتی بۆ کردن، لە کۆتاییدا ڕازی کردن بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی نوێ، ئەم هەڵمەتە کە بەهەڵمەتی شەشەمی خاچپەکان ناسراوە بە سەرکردایەتی "فردریکی دووەم" دەستی پێکرد، بەڵام پێش دەست پێکردنی هەڵمەتەکە پەیوەندی نێوان "پاپا گریگوری نۆیەم" و "فردریکی دووەم" تێکچوو، ئەمەش بووبە هۆی بێ بەش کردنی فردریکی دووەم لە پارەکانی پاپا و کڵێسا، جیاوازی ئەم هەڵمەتە لەگەڵ هەڵمەتەکانی تری خاچپەکان ئەوەیە فردریک بە ڕێگای دبلۆماسیەت و دانوساندن قەناعەتی بە مەلیک" کامل" کرد شاری "قودس"ی بەپێی ڕێکەوتننامەی ئاشتی نێوانیان لەساڵی (٦٢٦ک /١٢٢٩ز) تەسلیم بکات، بە مەرجێک فردیک هاوکاری خاچپەکان نەکات، ئەم هەنگاوە بۆ خۆی ڕای گشتی هەردوولای وروژاند و بەم ڕێککەوتننامە قایل نەبوون، فردریک بەبێ شەڕ و خوێن ڕشتن توانی بەیت ولمەقدیسی دەسکەوێت، ناچار پاپا بڕیاری "بێبەشی" لەسەر هەڵگرت، دوای ئەم ڕووداوە ناوچەکە بۆ ماوەی "٣٥" ساڵ فەرامۆش کرا.[١]

هاوکات سەرهەڵدانی مەترسی (خەوارزمەکان) لە ناوچەکە بوو بەهۆی بەستنی هاوپەیمانی لە نێوان سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکان دژی "خەوارزمەکان"، دەست پێکردنی ململانێ لە نێو بنەماڵەی ئەیوبیەکان بووبە هۆی لاواز بوونیان لە ناوچەکەدا، دواتر لەسەر داوای ئەیوبیەکان خەوارزمەکان توانیان بەیت ولمەقدیس ڕزگار بکەن لە دەستی خاچپەکان، ئەمەش دوای پێشێل کردنی ڕێککەوتننامەی نێوانیان لەلایەن خاچپەکانەوە،[٢] ئەم ڕووداوە بووە بیانوویەک بۆ ئامادەکردنی هەڵمەتێکی نوێ بۆ ڕزگار کردنی بەیت ولمەقدیس کە بە هەڵمەتی حەوتەمی خاچپەکان ناسرا، ئەم هەڵمەتە لەسەر داوای (بەطریکی قودس) و بە سەرکردایەتی پاشای فەڕەنسا(لویسی نۆیەم) بوو، کە بۆ ماوەی سێ ساڵ خۆی بۆ ئامادەکرد و لە ساڵی (٦٤٦ک/١٢٤٨ز) پاریسی بەجێ هێشت، هاوکات ئیمپراتۆر "فردریکی

---

(١) . بڕوانە: أبن تغري البردي: م،ن، ج٦/ ص ٣١٥- ٣٢٥؛ المقريزي: م.ن،ج١/ص٢٣٠- ٢٣٨، ص٢٥٨- ٢٩١؛ عاشور: م.ن،ج ٢/ص ٩٤٤- ١٠٠٨- ١٠٤٥؛ د. باز العريني: م.ن،ص١٢٧- ١٣٢؛ د. خاشع المعاضيدى وأخرون، ص٢٠٧- ٢١٥.

(٢) . بڕوانە: المقريزي: م.ن،ج١/ص ٣٣٧؛ فؤاد الصياد: المغول في التأريخ، ص٢٤٩؛ رنسيمان: م.ن،ج ٣/ ص٥٢٨؛ عاشور، م.ن،ج ٢/ ص١٠٥٢

دووەم: بەنهێنی و لە ڕێگەی ناردنی چەند بازرگانێکەوە سولتانی موسلمانانی لەم هەڵمەتە ئاگادارکردەوە کە نزیکەی "٥٠" هەزار دەبوون، و توانیان شاری دمیاط داگیر بکەن، بەڵام دواتر لە شەڕێکی گەورە موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو لویس بە دیلی گیرا، بەڵام ڕووداوی هەرە گرنگی ئەم هەڵمەتە کوشتنی مەلیک "تورانشاه"[1] بوو بە دەستی "بیبرس البندقداری" لە ساڵی (٦٤٨ک/ ١٢٥٠ز)، بەمەش فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئەیوبی لە وڵاتی میسر کۆتایی هات کە نزیکەی (٨١) هەشتا و یەک ساڵ حوکمڕانی ناوچەی شام و جەزیرە و میسر بوون و دەوڵەتی مەمالیک لە میسر لەسەر دەستی "بیبرس البندقداری" دامەزرا و خۆی بوو بە سوڵتانی میسر و شام لە ساڵانی (٦٥٨- ٦٧٦ک/ ١٢٦٠- ١٢٧٧ز).

بارودۆخی ناوچەکە بەو جۆرە نەمایەوە بەتایبەت لە دوای دەست پێکردنی هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان بۆ ناوچەکە و داگیرکردنی شاری بەغدا لە ساڵی (٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز)، و دەست پێکردنی پرۆسەی تالان و وێران و کاولکاری، تا لە شەڕی "عەین جالوت" سوڵتان (قطز)ی سەرکردەی مەمالیک توانی لە ساڵی (٦٥٨ک/١٢٦٠ز) کۆتایی بە هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان بهێنێت و پاشەکشەی بە مەغۆلەکان کرد بۆ شوێنەکانی خۆیان و یەکێتی نێوان میسر و شامی گێڕایەوە، ئەمەش بوو بەهۆی بەهێز بوونی بەرەی ئیسلامی و بەخشینی گیانێکی نوێ بە موسڵمانان، ئەمە جگە لە بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە نێو مەغۆلەکان و دانانی کاریگەری لە سەریان بە شێوەیەک شێواز و ڕەفتاریان گۆڕی و لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە دەستیان کرد بە کارکردن لە دژی بنەماڵەی هۆلاکۆ.

---

(١) . (توران شاه ): ناوی (توران شاه بن ایوب بن شادی، فخرالدین، شمس الدولة) بەواتای پاشای ڕۆژهەلات، برا گەورەی سەلاحەددین بوو لە باوکەوە، لە شاری دمشق پەروەردە بوو، لە ساڵی (٥٦٩ک/١١٧٤ز) لە هەڵکمەتێکدا سەلاحەددین لەگەڵا میرەکانی (بنو الرسول) ڕەوانەی وڵاتی (الیمن)ی کرد، پاش دەست بەسەراگرتنی ناوچەکە ساڵی (٥٧١ک/١١٧٥ز) گەڕایەوە شام، لە ساڵی (٥٧٤ک/١١٧٨ز)دا گەیشتە مصرو لەوێ کۆچی دوایی کرد. (سبط أبن الجوزي) دەڵێت: "خۆی بە موستەهەقتر دەزانی لە سوڵتان سەلاحەددین لە فەرمانڕەوایی، لەکاتی خەیاڵیدا هەندێک قسەی دەکرد، بۆیە سەلاحەددین دوری خستەوە بۆ وڵاتی (الیمن)". بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (مراه الزمان، ج٨/ ل٣٦٢؛ الخزرجي: العقود اللؤلؤية في تاريخ الدولة الرسولية، ج١/ ل٢٦؛ اليونيني: ذيل مرأة الزمان، ج١/ ل١٥.

شکستی "لویسی نۆیەم" لە هەڵمەتەکەی،[1] بووبە هۆی بیرکردنەوە لە هەڵمەتێکی نوێ لە ساڵی (٦٦٦ک/ ١٢٦٧ز) کە بە هەڵمەتی هەشتەمی خاچیەکان ناسرا، بەڵام ئاراستەکەی ئەمجارە بۆ شام و میسر نەبوو بەڵکو بۆ وڵاتی تونس بوو، لویس کە لەگەڵ "شارل انجو"ی برای کە پاشای صقلیە بوو لە ساڵی (٦٦٨ک/ ١٢٧٠ز) گەیشتنە کەنارەکانی تونس و لە "مرسا الحضرەی" دابەزین، لە شاری قرطاجە کە شارێکی ڕووخاو بوو لە لایەن موسڵمانەکانەوە تووشی هێرش و پەلامار هاتن و نزیکەی "٥٠٠" خاچیان لێ کوژرا و بۆ ماوەی (٦) مانگ گەمارۆدران، ئەمەش بووبە هۆی بڕینی پەیوەندی خاچیەکان بە دەرەوە و لە ئەنجامدا نەخۆشی لە ڕیزەکانی سوپاکەیان بڵاوبوویەوە، بە مردنی (لویسی نۆیەم) ناچار بوون داوای دانوساندن لە موسڵمانان بکەن، و لە ساڵی (٦٦٩ک/ ١٢٧٠ز) ڕێککەوتنامەی ئاشتیان واژۆکرد بۆ ماوەی (١٥) ساڵ، بەمەش هەڵمەتی هەشتەمی خاچیەکان کۆتایی هات،[2] پاشان هەڵمەتی نۆیەم لە پاش مردنی (لویسی نۆیەم) ئامادەکرا بەهەمان شێوە بەڵام هیچ ئاکامێکی ئەوتۆی نەبوو. کۆتایی هاتنی زەنجیرەی هەڵمەتەکانی خاچیەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی، باشترین دەرفەت بوو بۆ مەمالیک بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتیان لە وڵاتی شام، کە نزیکەی (١٧١) ساڵ لە ژێر فەرمانڕەوایی خاچیەکاندا بوو، ئەمەش بوو بەهۆی ڕزگار کردنی "پێگەی الاکراد"[3] و شاری تەرابلس و هەموو قەڵا و پێگەکانی دەوروبەری لە ساڵی (٦٨٩ک/ ١٢٩٠ز)، دوا شوێن کە سەنتەری سەرەکی خاچیەکان بوو شاری عەککا بوو، هەرچەندە "٨٠٠" سوار و "١٤" هەزار جەنگاوەر و "٢٥" هەزار حەجاج بەرگریان لێ کرد لە ساڵی (٦٩٠ک/ ١٢٩١ز) لە دەستی

---

(١) . بڕوانە: أبن واصل: م.ن،ج ٢/ص ٣٥٦- ٣٥٩؛ أبن تغری البردی: م.ن،ج ٧/ص ٤٧- ٨٠- ٢١١؛ أبو شامە: م.ن، ص٢٠٧؛ المقریزی: م.ن، ص٣٥٣- ٤٢٣- ٤٣١؛ رنسیمان: م.ن،ج ٣/ص ٥٣٦- ٥٣٧؛ العبادی: قیام دولة الممالیک، القاهرة، ص١٢٢- ١٢٣؛ عاشور: م.ن،ج٢/ ص١٠٦٣- ١٠٦٦- ١٠٩٧- ١١٠٣؛ محمد مصطفی زیادة: حملة لویس التاسع علی مصر، القاهرة، ١٩٦١، ص٨٩- ٩١ .

(٢) . بڕوانە: أبن تغری البردی: م.ن،ج ٧/ص١٤٣- ١٢٥١- ٢٩٢- ٢٩٣؛ المقریزی: م.ن،ج ١/ ص٦٣٦؛ رنسیمان: م.ن،ج ٣/ ص٥٠٢.

(٣) . پێگەی الاکراد (حصن الاکراد) قەڵایەکی بە هێز و پۆڵایینە دەکەوێتە سەر چیا، کە لە بەشی ڕۆژئاواوە، بەرامبەر شاری (حمص)ەوە، ئەو چیایەی (الجلیل) کە پەیوەندی بە لبنانەوە هەیە لە نێوان بعلبک و حمص (یاقوت الحموی: معجم البلدان، م.ن،ج٢/ ص١٥٢).

خاچیەکـان ڕزگـاری بـوو، بەم شـێوە بـوونی خاچیەکـان لە ڕۆژهەلات بە دەسـتی موسڵمانان کۆتایی پێهات، کە نزیکەی "٢٠٠" ساڵی خایاند، هەڵمەتەکانی خاچیەکان بە گەورەتــرین ڕووداوەکــانی ســەدەکانی ناوەڕاســت دادەنــرێن و کــاریگەری ڕاســتەوخۆیان هەبـوو لەســەر هەمـوو بوارەکانی"سیاسـی، ئـابووری، ســەربازی، شارستانی، کشتوکاڵی" لە هەردوو کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتیدا.[1]

---

(١) . بڕوانە: أبن تغری البردی: م.ن، ج٨/ ٥ص- ٦؛ المقریزی: م.ن، ج١/ ٧٦٥ص؛ رنسیمان: م.ن، ٥٥٨- ٥٦٧؛ عاشور: م.ن،٢ج/ ص١١٧٧- ١١٧٨.

# باسی یەکەم

# کۆمەڵگاکانی سەدەکانی ناوەڕاست

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سێ کۆمەڵگای سەرەکی هەبوون و ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو،ئەوانیش کۆمەڵگای بیزەنتی و کۆمەڵگای ئەوروپای ڕۆژئاواو کۆمەڵگای ئیسلامی بوون. کۆمەڵگای بیزەنتی لەلایەنی ئاینییەوە بە ئاینزا(مذهب)ی ئەرسەدۆکسی مەسیحی و لە لایەنی ڕەگەزو نەتەوایەتیشەوە بە ڕەگەزی جیاوازو جۆراوجۆر جیا دەکرێتەوە، هەندێ لەو ڕەگەزانە لە بنەڕەتدا یۆنانین و هەندێکی تریشیان لە بنەڕەتی جیان وەک سلاڤەکان. بەڵام کۆمەڵگای ئەوروپای ڕۆژئاوا بە میللەتە ڕۆمانی و جەرمانیە ڕەسەنەکانیەوە دەناسرێتەوە، لەلایەنی ئاینیشەوە لەسەر ئاینزای کاسۆلیکی مەسیحی بوون و لە زۆر کاتدا شوێنکەوتەیەکی تەواوی پاپا بوون کە لە ڕۆما دادەنیشت. کۆمەڵگای ئیسلامیش بە دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام دەرکەوت و شارستانێتی خۆی لەسەر چەمکەکانی ئاینی ئیسلام پێکهێناو بەخێرایی بە ناوچەکانی باکورو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی عەرەبدا بڵاو بووەوە.[1] لێرەدا بەگرنگی دەزانین باس لە سەدەکانی ناوەڕاست بکەین چونکە سەدەکانی ناوەڕاست سەردەمێکی دابڕاو نیە لە سەردەمەکانی پێش خۆی و پاش خۆی لە مێژوودا، بەڵکو قۆناغێکە لە قۆناغەکانی مێژوو کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێدا تێپەڕ بوو. مێژوونوسان ڕێکەوتوون لەسەر دانانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا لەنێوان مێژووی کۆن و مێژووی نوێ دا کە بەهەزار ساڵ زیاتر دەخەملێنرێت، لە سەدەی چوارەمی زاینی یەوە تا سەدەی پانزەهەم.

دوای ڕووخان و هەرەسی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەسەدەی چوارەم و هێرشی میللەتانی بەربەری و بڵاوبوونەوەو سەقامگیر بوونی ئاینی مەسیحی لە ئەوروپاو دوای ئەمەش دروست بوونی چەندین وردە دەوڵەتی بچوک، گۆڕانێکی زۆری بەسەر وڵاتانی ئەوروپادا هێنا.[2] تا ئێستا مێژوونووسانی جیهان ڕایەکی یەکگرتوویان نیە لەبارەی ئەوەی چ ساڵێک بەساڵی دەست پێکردنی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دابنرێت. بەڵام تێکڕای مێژوونوسان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون

---

1. موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، تر:علي السيد علي، المجلس الاعلى للثقافة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٥، القاهرة،ص١١-١٢.

(٢). عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبيه ٤٧٦ -١٥٠٠، دون سنة ومكان الطبع، ص ١٣-١٥.

کە سەدەکانی ناوەڕاست دەکەوێتە نێوان سەردەمی کۆن و نوێ. واتە لەسەدەی چوارەمەوە تا سەردەمی ڕێنیسانس. سەدەکانی ناوەڕاست بەسەدە تاریکەکان بەناوبانگە، دیارە لەو سەردەمەدا شەڕو کوشتن و بڕین گەیشتبووە لوتکە، هیچ بایەخێک بە گەشە پێدانی زانست و هونەر نەدەدرا.

دەست نیشان کردنی سەرەتاو کۆتایی هەر قۆناغێکی مێژوویی کارێکی ئالۆزو ئەستەمە و بەردەوام جێگای لێدوان و مشتو مڕە، زیاتر پەیوەندی بە لێهاتوویی و زانایی ئەو مێژوونوسەوە هەیە کە لەو قۆناغە دیاری کراوە دەکۆڵێتەوە. ئەگەر چی سەدەکانی ناوەڕاست قۆناغێکی مێژوویی دوورو درێژە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ بڵێین لەگەڵ تەواو بوونی ئەم قۆناغە ئیتر گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر هەموو بوارەکانی بیرو باوەڕ، ئابوری، زانست، ئایین، و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا هاتووە و لە شەوو ڕۆژێکدا دەوڵەتێکی شێوە نوێ دروست بووە، بەڵام مێژوو نووسان ڕووداوێکی گرنگی ئەم قۆناغە کە دەبێتە هۆی وەرچەرخانێکی مێژوویی وەردەگرن و دەیکەن بە خاڵی دەستپێکردن یان کۆتایی ئەو قۆناغە، هەر بۆیەش چەندین ڕاو بۆچوونی جیا لە لایەن مێژوونووسانەوە هەیە لە بارەی سەرەتاو کۆتایی هەر چەرخێکی مێژوو. لێرەدا دیدو بۆچوون و ڕای جیاوازی مێژوونووسان لە بارەی سەرەتای دەستپێکردنی سەدەکانی ناوەڕاست بە نموونە دەهێنینەوە، هەوڵیش دەدەین بە شێوەیەکی گونجاو و ڕێک وپێک بەراوردیان بکەین بۆ ئەوەی بە ئاسانی تێی بگەین.

**یەکەم:**

بیروڕا لە بارەی کارو کردەوەکانی هەندێ لە ئیمپراتۆرەکان: هەندێ لە مێژوو نوسان ساڵی (٢٨٤ ز) دەست نیشان دەکەن بە سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و کۆتایی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، ئەم ساڵەش بۆیە هەڵبژێردراوە چونکە هەرلەم ساڵەدا بوو ئیمپراتۆر دیکلدیانۆس(٢٨٤ -٣٠٥ز) Dicoletiaدەسەلاتی ئیمپراتۆری گرتە دەست،[1] سەر لەنوێ لە ڕووی کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتیەوە وڵاتەکەی ڕێکخست و جیاوازی هەبوو لەگەڵ سیستەمەکانی پێش خۆی.[(٢)] دیکلدیانوس وەک ئیمپراتۆرێکی تەقلیدی ڕۆمانی نەبوو، ئەو خۆی دەچواند بە

1 . ه.ا.ل. فشر : تاریخ اوروپا العصور الوسطی، تر: محمد مصطفى زيادة و السيد الباز العريني، دار المعارف مصر، القسم الاول،١٩٥٠،ص١.

(٢) .موسوعة الاديان في العالم (المسيحية)،دار كريس، ص٣٠.

پاشاکانی فارس و خۆی لە یاسا بە بەرزتر دەزانی، زیاتر خۆی بە خودا تەشبیە دەکرد نەک بەمرۆڤ. حوکم و دەسەلاتی دیکلدیانوس بە دژایەتی کردنی ئایینی مەسیحی ناوبانگی دەرکردبوو، سەردەمی ئەو بە ئەشکەنجەو ئازاردانی مەسیحیەکان بەناوبانگە.[1]

بەشێکی تر لە مێژوونوسان سەردەمی ئیمپراتۆر کۆنەستەنتینی یەکەم (Constantinei) بە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست دادەنێن،[2] بەتایبەت ساڵی (٣٢٣ز)، کە ئەمە ئەو ساڵەیە تیایدا شەڕی ناوخۆیی لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا کۆتایی هات و تیایدا کۆنستەنتین بوو بە فەرمانڕەوای بێ ڕکەبەر (منافس)، لە سەردەمی ئەمدا گۆڕانکاری هەمە لایەنە بەسەر بوارەکانی ژیاندا هات، لەوانە بەڕەسمی ناسینی ئایینی مەسیحی و کردنی بە ئایینی دەوڵەت، وە دەرکردنی مەرسومی میلان (Edict of Milan) ی بەناوبانگ لە ساڵی (٣١٣ ز)، ئەمە ئەو مەرسومە بوو کە ڕێگەی بەهاوڵاتیان دەدا بچنە سەر ئایینی مەسیح،[3] هەروەها یەکێکی تر لە کارەکانی کۆنستەنتین دروستکردنی شاری کۆستەنتینا(استنبولی) بوو، بەمەش ڕۆمای لە کورسی ئیمپراتۆری چۆڵ کرد.[4] دواتر پاپای ڕۆما خۆی کرد بە سەرۆکی مەسیحیەکانی ڕۆژئاواو دەسەلاتی دنیایی و ئایینی گرتە دەست. ئەمە جگە لە دانانی هەندێ یاسا و ڕیفۆرمی سەربازی و ئایینی لەلایەن کۆنستەنتینەوە.

کۆمەڵێکی تر لە مێژوونوسان سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆر جۆستینیان (٥٢٧ – ٥٦٥ ز) Justinian، چونکە سەردەمی ئەو دەکەوێتە نێوان کۆتایی مێژووی کۆن و سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست، ئەوان لەم ڕایەیاندا پشت دەبەستن بە شیکردنەوەکانیان لە بارەی هەوڵدانەکانی جۆستینیان کە دەیویست بە زەبری هێزی سەربازی جارێکی تر ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای ڕۆمانی بکات بەیەک، ئەمەش لە کاتی شەڕەکانی لەگەڵ

---

(١) . عبدالامير محمد امين ومحمد توفيق حسين: تاريخ اوروپا في العصور الوسطى، الكتاب الاول، د-ت، ص٢١-٢٢.

(٢) . د.حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزنطية،دار النهضة العربية،القاهرة،١٩٩٠،ص٢٤-٢٥.

(٣) . د.سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة،١٩٧٥،ج١/ص٤٠.

(٤). فشر : تاريخ اوروپا العصور الوسطى، ص١٠-١١.

وەندالەکانی خۆرئاوای ئەفریقیاو قوتەکانی ڕۆژهەڵات لە ئیتالیاو قوتەکانی ڕۆژئاوا لە ئیسپانیا.[1]

**دووەم:**

هۆیە ئاینیەکان: هەندێ لە مێژوو نوسان سەردەمی ئیمپراتۆری جۆلیانی هەڵگەڕاوە المرتد 363- 361 (Gulian the Apostat)ز)(بە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست دادەنێن، چونکە ئەم ئیمپراتۆرە لە ئاینی مەسیحی هەڵگەڕایەوە بۆ ئاینی بت پەرستی، و ئەم ئاینە کۆنەی کردەوە بە ئاینی ڕەسمی دەوڵەت.[2] بەڵام هەوڵەکەی دا سەرنەکەوت و شکستی هێنا، و جارێکی تر ئاینی مەسیحیەت بەڕەسمی کرایەوە بە ئاینی دەوڵەت، ئەم ئاینە(ئاینی مەسیحی)، بوو بە خەسڵەتی ژیانی خەڵکی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست.

بەشێکی تر لە مێژوونوسان ساڵی (٣٧٦ ز) دەکەن بە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست، ئەنجامی بۆچوونەکانیان لەسەر بنەمای ئەوە لێکدەدەنەوە کە قوتیە خۆرئاواییەکان لەم ساڵەدا لەسەر دەستی مسیۆنێری ئاریوسی ئۆلفیلاس (Olfilas) 383- 310 ز))وازیان لە ئاینی کۆن هێناو باوەڕیان بە ئاینی مەسیحی هێنا، کاتێک قوتیەکان باوەڕیان بە ئاینی مەسیحی هێنا چوونە سەر مەزهەبی ئاریۆس، ئەمە وای لە ئیمپراتۆریەتە خۆرهەڵاتیەکان کرد مۆڵەتیان پێ بدەن لە زێی دانوبەوە بپەڕنەوەو لە ناوەڕاستی ئیمپراتۆریەتەکەیان نیشتە جێ ببن. ئەگەر چی ئەمە خەسڵەتێکی کاتی بوو بەڵام دواتر بوو بە دیاردەو ماکی سەرەتای داگیرکردنی ئەوروپا بوو لەلایەن بەربەریەکانەوە.[3]

هەر لەڕووی ئاینیەوە هەندێ مێژوونووسی تر دەسەڵاتی ئیمپراتۆر ثیودوسیوسی یەکەم (theodosusi) (٣٧٩ -٣٩٥ ز) دەکەن بە خاڵی پەڕینەوە لە مێژووی کۆن بۆ مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەم کۆمەڵە مێژوونوسە ساڵی (٣٧٩ز) کە تیایدا ئەو ئیمپراتۆرە دەسەڵات دەگرێتە دەست دەکەنە بۆشاییەک لەنێوان سەردەمی کۆن و ناوەڕاست. چونکە ئیمپراتۆر (theodosusi) ساڵی (٣٧٩ز) لە کۆبوونەوەی (کۆنستەنتینیە)دا بڕیاری دوایی لەسەر ناشەرعیەت بوون و کۆتایی هێنان بە مەزهەبی ئاریوسی دا، بەمەش لایەنگران و هاوبیرانی ئەم ڕێبازە

---

(١). محمود سعيد عمران : معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى،دار النهضة العربية،بيروت،ص١٦.

(٢). سعيد عاشور :س-پ، ل٣٧.

(٣). عبدالامير محمد امين : س- پ، ل ٥٤-٥٥.

توشی سزای قورس بوون، هەموو پەرستگاکانی بتپەرستان داخران و سوتێنران و کتێبەکانیان قەدەغە کران و لەناوبران. هەروەها هەموو ئەو کەسانەی سەر بەو مەزهەبە بوون ڕێگەیان لێگیرا درێژە بدەن بە عیبادەتە ئاینەکانیان، ئەگەر چی لە ماڵی خۆیشیان ئەم عیبادەتەیان دەکرد.[1]

**سێیەم:**

هۆیە سەربازیەکان: هەندێ لە مێژوونوسان جەنگی ئەدریانۆپڵ (Adrianople) کە لە ساڵی (١٣٧٨ ز) ڕوویدا، دەکەن بە کۆتایی چەرخی کۆن و سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست. بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کاتێک کە خۆرئاواییەکان لە زێی دانوب پەڕینەوە لە ناوچەی (مواشا Moesia و تراکیا Thrac) نیشتەجێ بوون. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هەستیان بە تەنگی ناوچەکەیان کرد یەکسەر بەسەر ئیمپراتۆردا وەرگەڕان و کەوتنە شەڕ فرۆشتن بە ئیمپراتۆر ڤالینز (٣٦٤ - ٣٧٨ ز) Valenz و شەڕێکی گەورە لەنێوان هەردوو لا هەڵگیرسا، لە ئەنجام دا سێ بەشی لە شکری ئیمپراتۆر کوژراو تووشی شکستێکی ترسناک بوو.[2]

**چوارەم:**

سیستمی بەڕێوەبەرایەتی: گروپێک لە مێژوونوسان ساڵی (٣٩٥ز) بە کۆتایی مێژووی کۆن و سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دەزانن کە لەم ساڵەدا ئیمپراتۆر ثیودوسیوس کۆچی دوایی کرد. هەر لەم ساڵەدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بوو بەدوو بەشی سەربەخۆو جیاواز لەیەکتر، جیاواز تر لە سەردەمی دیکلدیانۆس چونکە دابەشبوونی ئەوکات شتێکی شکلی بوو، ثیودوسیوس بەشی رۆژهەڵاتی دا بە کـورەکەی ئەرکـادیۆس (٣٩٥-٤٠٧ز) لای رۆژئاواشـی دا بە کـورەکەی هوندریۆس(٣٩٥-٤٢٣ز)، بەم شێوەیە بوون بە دوو دەوڵەتی سەربەخۆ. بەواتایەکی تر ئەمە سەرەتای دەوڵەتێک بوو لە ڕۆژهەڵات کە تا ساڵی(١٣٥٤ز) درێژەی هەبوو، دەوڵەتەکەی تریش بەدەستی جەرمەنەکان وبەربەری یەکان هەرەسی هێنا.[3]

**پێنجەم:**

هەندێ بیرورا کە پەیوەندیان بە ڕۆماوە هەیە: هەندێ لە مێژوونوسانی تر لەو باوەڕەدان مێژووی کۆن کاتێک کۆتایی هات کە شاری ڕۆما لە ساڵی (٤١٠ ز)

---

(١) . عبدالقادر احمد اليوسف: س-پ، ل٤٠.

(٢) . محمود سعيد عمران:س-ث-ل١٨.

(٣) . فشر:س-پ،ل ٢٣.

بەدەستی قوتە ڕۆژئاواییەکان بە سەرۆکایەتی(ئەلاریک)Alaric داگیرکرا، بەمەش کۆتایی بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا هات، دواتر مۆرۆنێوسی ئیمپراتۆر (ڕاڤنا)Ravenna ی کرد بە پایتەختی خۆی.[1]

**شەشەم:**

بیروڕای تر لەسەر کۆتایی هاتنی حوکمی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆژئاوا: زۆر لە مێژوونوسان لەسەر ئەو باوەڕەن سالّی (٤٧٦ز) سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستە، ئەمە ئەو ساڵە بوو کە سەرۆکی (هەرول Heruls) و (ئۆدواکر Odoacer)، کە یەکێک بوولە توخمە جەرمەنیەکانی ڕۆژهەلاّت توانی شاری ڕاڤنا داگیر بکات و ئیمپراتۆری ڕۆژئاوا ڕۆمۆلوسی ئاوگوسترلوس (Romulas Augustulus) (٤٧٥ – ٤٧٦ ز) لەسەر حوکم لابەرێ و دووری بخاتەوە بۆ ناوچەکانی باشوری ئیتالیا، دواتریش موچەیەکی مانگانەی گونجاوی بۆ بڕیەوە، ئەم ئیمپراتۆرە تەمەنی ١٢ سالّ بوو.[2]

**حەوتەم:**

بیروڕای تر لە مەڕ تاج لەسەرنانی چارلمان: ئەگەر هەندێ لە مێژوونوسان سالّی ٤٧٦ ز یان کرد بە سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست، چونکە ئەم مێژووە مێژووی کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆمانی رۆژئاوا یە، هەندێ لە مێژوونوسانی تر ڕایان وایە کە سالّی (٨٠٠ز) سەرەتای دەست پێکردنی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستە، چونکە لەم سالّەدا بوو چارلمان Chalemagne تاجی ئیمپراتۆری لە سەر خۆی ناو دەستی کرد بە زیندوکردنەوە و ژیاندنەوەی ناوی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز دوای ئەوەی ڕۆژئاوا بەدرێژایی قۆناغی نێوان سالاّنی (٤٧٦ –٨٠٠ ز) بەبێ ئیمپراتۆر بوون.[3]

سەرباری هەموو ئەو ڕاو بۆچوونە جیاوازانەی کە باسمان کرد لەبارەی دەست نیشان کردنی مێژووی دەستپێکردنی سەدەکانی ناوەڕاست، مێژووی کۆن کۆتایی هات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆو فاکتەری ناوەکی و دەرەکی کە زەمینەیان خۆش کرد بۆ لەدایک بوونی سەدەکانی ناوەڕاست. چونکە ئەم قۆناغە لە شەوو ڕۆژێکدا لە دایک نەبوو، یان زادەی چەند سالّێک نەبوو. سەدەی چوارەم کە

---

(١) . سعید عاشور: س-پ، ل٦٣-٦٤.

(٢). فشر:س-ث،ل ٣٢-٣٣.

(٣) . محمود سعید عمران:س-ث-ل١٩.

پڕبوو له ڕووداوی گرنگ و گۆڕانکاری که کاریگەری شارستانیەتی و سیاسی هەبوو له گۆڕاندن و کۆتایی پێهێنانی مێژووی کۆن. لەگەڵ ئەمەش دا هەندێ له تایبەتمەندیەکانی چەرخی کۆن بۆ ماوەیەکی درێژ لەناونەچوون و تێکەڵ به خەسڵەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بوون. سەدەی چوارەم بەکۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا ئەژمار دەکرێت، لەم سەدەیە ئایینی مەسیحی بەرەسمی ناسراو بوو بە کولتوری ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و جێگای بەئاینە کۆنەکان لێژ کرد.

له لایەکی ترەوە جەرمەنەکان بوون به توخمێکی سەرەکی که بەزەبری هێز خزانە ناو ئیمپراتۆریەتەکەو تێیدا نیشتە جێ بوون و له دواییشدا ڕۆڵێکی بالایان هەبوو له شەڕو شۆڕو ڕوخاندنی دا. جەرمەنەکان به توخمێکی سەرەکی و دروستکەری مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێن. هۆیەکی تر ئەمەیە که ئیمپراتۆریەتەکە ببوو بەدووبەش(ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتی)که ئیمپراتۆریەتی کۆنی ڕۆمانی که بەهێزو خاوەن شارستانیەت بوو وەک خۆی نەما، و ئەم دووبەشیە زیاتر لاوازی کردو ئەنجامەکەشی ڕمانی بەشە ڕۆژئاواییەکەی بوو. لەبەر ئەم هۆیانە دەکرێ سەدەی چوار بکەین به سەرەتای دەست پێکردنی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست.

له قۆناغە سەرەکیەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و خەسڵەتەکانیان که پێشتر باسمان کردن بۆمان ئاشکرا دەبێت که ئەو قۆناغانەی پێی دەڵێن سەدەکانی ناوەڕاست، مەودایەکی دورو درێژەو نزیکەی پانزە سەدە دەبێت، لەو ماوەیەدا ئەوروپا له نێوان دروست بوون و پێگەیشتن دابوو. بۆیە ناکرێ وا تێ بگەین که ژیانی خەڵک و کۆمەڵگای ئەوسا له یەک ئاستدا بوون. ژیان و شارستانیتی خەڵک گۆڕانی به سەردا دەهات، بەلام گەلی لاواز کزو لەسەر خۆتر بوو وەک له کۆمەڵگە بەهێزو سەردەمەکان که بەخێرایی گەشەیان دەکرد، بۆ نموونە ئەو بارودۆخەی مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاستی فەرەنسا له سەردەمی چارلەمان له کۆتایی سەدەی هەشت تێیدا دەژیا جیاواز بوو لەو سەردەمەی ئینگلتەرا که هنریIII ( ١٢٧٢-١٢١٦ ) حوکمی دەکرد له سەدەی (١٣ ز).

مێژوونوسان مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دابەش دەکەن بۆ سێ قۆناغ، هەر قۆناغەو مێژووی تایبەت و خەسڵەتی خۆی هەیە که جیایان دەکاتەوە له قۆناغەکانی تر. پێویستە ئەمەش بڵێین ئەم دابەش کردنە زیاتر دابەشکردنێکی

زەمەنی یە و هەندێ زیادەرۆیی کاتی و شوێنی تێدایە. چونکە ناوچەکانی ئەوروپای خۆرئاوا یەکسان نەبوون لە گەشە کردن و پێشکەوتن و گۆڕانکاریەکانیان.

**قۆناغی یەکەم:**

ئەم قۆناغە لە سەدەی چوارەمی زایینیەوە دەست پێ دەکات تا کۆتایی سەدەی دەیەم، تیایدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە سەدەی چوارەم هەرەسی هێناو میللەتانی تری جۆراوجۆر گۆڕانیان بەسەر جیهانی ڕۆمانیەتدا هێنا. ڕەگەزی ئەم میللەتانە بریتی بوون لە گۆت(Gths) هۆن(Huns) ڤاندال (Vandals). بورگوندیا(Burgundians)سەکسۆن (Saxons) لومباردیەکان (Lombards).[١] جگە لەمانە موسوڵمانەکانیش لە سەدەی حەوت و هەشتدا لەڕێگای فتوحاتی ئیسلامیەوە هەندێ خاکی ڕۆمانیەکانیان داگیرکرد. لە سەدەکانی نۆو دەش هەندێ لە میللەتانی باکوری ئەوروپا لە سویدو نەرویج و دانیمارک و هەنگاریا خزانە ناو ناوچەی ڕۆمانیەکان، گرنگ ئەوەیە کە جیهانی ڕۆمانیەت بەدرێژایی ئەو ماوەیە ئارامی بەخۆیەوە نەدی و بەردەوامیش گیرو گرفتی جۆراو جۆری وەک نەبوونی حکومەتێکی بەسودو فەوزاو هەرای تێدا بەدی دەکرا، هەرچەندە هەندێ خەڵک دەیانویست درێژە بەنەریت و بیرو ژیانی ڕۆمانی بدەن، بەڵام بۆیان نەکرا چونکە بە پێچەوانەی ڕەوتی مێژووی ئەوسا بوو کە زاڵبوو بوو بەسەر کۆمەڵگادا. شاری ڕۆماش ئەگەرچی مەڵبەندی شارستانیەت و ڕێکخستن و پێشکەوتن بوو، ئەمیش وردە وردە تاریکی دایدەگرت.[٢]

ئەم ڕووداوانە ئەگەرچی گرنگی خۆیان هەیە لەو سەدانەی باسمان کردن، بەڵام لەژێر پەردەو بەشاراوەیی پرۆسەیەکی تر شانبەشانی دەڕۆیشت ئەویش تێکەڵ بوونی ئەو فیکرو شارستانیەتیە بوو کە لە ڕۆمانیەکانەوە مابووەوە لەگەڵ بیروباوەڕو نەریتی نوێی ئەو میللەتانە کە تازە تێکەڵی ڕۆمانیەکان ببوون، جگە لەمەش کۆمەڵگای ئەوروپی مەسیحی بوون و بەرەو مەسیحی بوون دەڕۆیشتن. کڵێسەش باڵادەست بوو لە ڕووی یاساو سیستەمەوە.[٣]

---

(١) . موریس بیشوب: س-پ،ل ١٠.

ج

(٢) . د.سعید عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروپا العصور الوسطی، دار النهضة، العربیة، بیروت،ص ٣٠.

(٣) . محمود سعید عمران: س-پ،ل ٢٧-٢٨.

**قۆناغی دووەم:**

ئەم قۆناغە لە سەدەی یانزەهەمەوە دەست پێ دەکات تا سەدەی سیانزەهەم، خەسڵەتی ئەم قۆناغە بریتیە لە ئیستقرارێکی ڕێژەیی (نسبی) بە بەراورد لەگەڵ سەدەکانی پێشتر لە ژیانی خەڵک. لەم سەردەمەدا سیستەمی فیودالیزم (Feudalism) چەسپاو بوو بە سیستەمی سیاسی. هەر لەو سەدەیە دەست کرا بە ڕۆشنگەری (تنویر)و بڵاوبوونەوەی بیری سەدەکانی ناوەڕاست کە پێشکەوتوو تر بوو لە سەدەکانی ڕابردوو.

لە سەدەی (١٢) دا دەست کرا بە دیراسەکردنی یاسای ڕۆمانی و ئەو بنەمایانەی کە لەسەریان دروست ببوو، هەروەها پیاوانی ئاینی یاسای مەسیحیان دانا. هەرلەو سەردەمە دەست کرا بەدروست کردنی پەرستگای مەسیحیەتی گەورە بە ئەندازیاری بیناسازیەتی ئەو سەردەمە کە پێشکەوتنی پێوە دەبینرا. لەلایەکی ترەوە دەست کرا بە توێژینەوەی فەلسەفەی ئەرستۆو یۆنانی کۆن. سیستەمی بەڕێوەبەرایەتی شارەکان و کۆمۆنەکان Commune فۆرمەڵە کران و سەندیکاکان Guldisدامەزران، کە تا ئەمڕۆ ئەم سیستەمە بە دەست کاری و هەندێ گۆڕانەوە درێژەی هەیە. عەقلیەتی سیستەمی پەرلەمانی هاتە گۆڕێ و بازرگانی لە نێوان ئەوروپاو وڵاتانی ڕۆژهەڵات دەستی پێ کرد، هەروەها پیشەسازی پێشکەوتنی بەخۆوە دی.[١] بەڵام نابێ ئەوە لەیاد بکەین کە کۆمەڵگای ئەوروپا زیاتر کشتوکاڵی و سیستەمی سیاسیش فیودالی بوو، کۆمەڵگای ئەوروپی کە لەسەر بنەمای فیودالی دامەزراو بوو، دەبوایە تەواوی چینەکانی کۆمەڵ ئیلتزامی پێوە بکەن، لە دەرەوەی ئەوروپاش بەهەمان شێوە سیستەمەکە کاری پێ دەکرا، بەتایبەت لەو وردە ئیماراتانەدا کە خاچ پەرستەکان لە ڕۆژهەڵاتدا بەتایبەت لە شام و لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا دروستیان کردبوون.

یەکێک لە خەسڵەتەکانی تری ئەم قۆناغە پەیدابوون و لە دایک بوونی بیری ئەوروپای یەکگرتوو بوو، ئەمەش بە ڕێبەرایەتی پاپا بۆ کاروباری ئاینی و ئیمپراتۆریەت بۆ کاروباری دەوڵەت بوو، بەڵام تاکە دیاردە بۆ ئەم مەبەستە هەبوونی هێرشی خاچ پەرستان بوو بۆ ڕۆژهەڵات کە ئەمەش تەنیا بیری ئەوروپای غەربی بوو نەک تێکڕای ئەوروپا.[٢]

---

(١). عبدالامیر محمد امین: س-پ،ل ٣٥.

(٢) . محمود سعید عمران: س-پ،ل ٣٠.

**قۆناغی سێ هەم:**

سەدەی چواردەهەم سەرەتای لەناوچوونی شارستانێتی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستە، کە وەک زۆربەی شارستانیەتەکانی تری پێشوو گەیشتبووە لوتکە، دیارە شارستانیەتی ولآتان لەسەر یەک شێوە بیرکردنەوە زۆر درێژە ناخایەنن، هەر بۆیەش سەدەکانی ناوەڕاست کە دووچاری بیرو بۆچوونی نوێی علمانیەت بووەوە ئەویش تواوەیەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی سەدەکانی چوارده و پانزه ئیتر بیروباوەڕی سەدەکانی تریش بەسەرچوو. تێڕوانینی خەڵک بۆ مەلیک گۆڕا، پێشتر یەکێک لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی (فیودال)ی ئەوەبوو کە وەک پاشا سەیری سەرۆکی کۆمەڵگای فیودالیان دەکرد، ئەم تێڕوانینە گۆڕدرا بۆ سەیرکردنی وەک سەرۆکی دەوڵەت. دەسەلآتەکانی مەلیک زیادی کردو شێوەی ولآتەکەشی گۆڕا بۆ دەوڵەتی شێوە نوێ. گۆڕان بە سەر دەزگاکانی خوێندندا هات و لە جاران بێ بایەخ تر بوو لەڕووە تەقلیدیەکەی. لەجیاتی زمانی لاتینی زمانی نەتەوەیی بەکار هات، بۆ نمونە (دانتی) بەئیتالی دەینوسی، شاعیری فەڕەنسی فرنسۆ ڤیلۆن (Franco villon) 1431 -1463ز بەفەرەنسی و چۆستیریش(Chousen) ١٣٤٠-١٤٠٠ز بەئینگلیزی. لەم قۆناغەدا کەنیسە توشی کزی و لاوازی هات، توشی دووبەرەکی و پارچە پارچەیی و ڕەخنەی توندو تیژ دەبووەوە، هەروەها ململانێی توندی نێوان دەسەلآتی دنیایی و ئاینی گەیشتبووە ئەوپەڕی توندو تیژی. لەکۆتایدا دەڵێین سەدەکانی ناوەڕاست کە بەشێک بوون لە مێژووی مرۆڤایەتی لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم بەتەواوی کۆتایی هات، و سەدەی نوێ جێگای گرتەوە بەکۆمەڵێک بیرو باوەڕی تازەو داهێنانی زانستی نوێوە. [1]

---

1 . سعيد عاشور: حضارة ونظم اوربا، ص٣٦-٤٠.

## باسی دووەم

# دەرکەوتن و بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحی

ئایینی مەسیحی یەکێکە لەو ئایینە ئاسمانیانەی کە لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویی‌دا لە ناوچەکانی فەلەستیندا دەرکەوت، و زۆر بەخێرایی بە هەرێمە جیاوازەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بڵاوبووەوە. بەشێوەیەک کە جێگای سەرسورمان بوو. ئەم ئایینە ڕۆژهەڵاتیە پیاوێک موژدە بەخشی بوو لە ناوچەیەکی کەناری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دا بەناوی (عیسای کوڕی مەریەم) ەوە (د.خ) و کتێبیکی پێ بوو بەناوی (ئینجیل) کە خوا ناردبووی بۆ ڕێنموکردنی ئەو کەسانەی کە باوەڕ بەم ئایینە دێنن.[1] عیسای کوڕی مەریەم لە سەرەتاکانی سەدەی یەکەمی زایینی دا ژیاو بانگەشەی بۆ ئایینەکەی کردو درێخی لە بڵاوکردنەوەیدا نەکرد. لەپاش کۆچ کردنیشی لەساڵی (٣٣ز)دا، بڵاوکردنەوەی ئایینەکە کەوتە ئەستۆی هاوەڵەکانی کە عیسا خۆی لەژیاندا پەروەردەی کردبوون و بنەماکانی مەسیحیەتی تێگەیاندبوون. بەو شێوەیە سەرەتای نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی زایینی بەسەرەتای دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی لە مێژوودا دەناسرێت. لەپاش سێ سەدە ئەم ئایینە بووە ئاینێکی شێواز بەند(ڕەسمی) لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا، پاشتریش هێندە بڵاوبوویەوە کە بووە تاکە ئایینی دان پێدانراو لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا.[2]

### هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی

#### یەکەم: سروشتی پێکهاتەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی:

هەرێم و بەشە جیاوازەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بە تۆڕێکی بەهێزی ڕێگاو بانەکان بەیەکترەوە بەسترابوونەوە. ئامرازەکانی گەیاندن بە گشتی هیچ هاوکارێکیان لە جیهانی کۆندا نەبوو ئاسایشیش باڵی بەسەر ڕێگاوبانەکاندا کێشابوو. ئەمەش یاریدەدەرێکی باش بوو بۆ گواستنەوەی بیرو باوەڕو ئایدیاکان

---

.(١) روبرت ر. بالمر : تاريخ العالم الحديث، تر : محمود حسين الامين، الموصل، ١٩٦٤، ج١/ص ٢٩.

(٢) . عبدالامير محمد امين: س-پ،ل ٣٣.

بەخێرایی و بە ئاسانی لەناو هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتدا. وەک چۆن یارمەتی دەری ئاڵوگۆڕی بازرگانی و جموجوڵە سوپاییەکان بوو.[1]

**دووەم: سروشتی مژدەبەخشی ئایینی مەسیحی:**

سروشتی مژدەبەخشی ئایینی مەسیحی یارمەتی خێرا بڵاوبوونەوەی ئایینەکەی دا. لەسەرەتادا چەمکە مەسیحیەکان لەناو هەژارو بەشخوراوەکانی نیشتەجێی شارەکاندا بڵاو بوویەوە. پاشان بەناو تێکڕای چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا بڵاو بوویەوە.[2] مەسیحیە پێشەنگەکان هەموویان مژدە بەخش بوون، لە هەموو جموجۆڵ و کۆچ و ڕەوێکیاندا بانگەشەیان بۆ پەیامەکەیان دەکرد، بەلای مرۆڤێکی مەسیحیەوە لەوە خۆشتر نەبوو کە مرۆڤێکی تازە بێنێتە سەر ئایینی مەسیحی، هەروەها بە بوێری و بەبێ ترس موژدەی ئاینەکەیان بە خەڵکی دەگەیاند. گەرچی لەئەنجامی ئەم کارەیاندا ڕووبەڕووی ئەشکەنجەو چەوساندنەوە دەبوونەوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانە دەستەیەک لە مەسیحیە پێشەنگەکان وازیان لە کاروباری دنیایی هێناو خۆیان یەکلایی کردەوە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕە نوێیەکە، ئەو سەرکەوتنانەی دواتر کە مەسیحیەت بەدەستی هێنا بۆ ئەم دەستەیە دەگەڕێتەوە. ئەم دەستەیە لە خوێندکارەکانی حەزرەتی مەسیح پێکهاتبوون کە پێیان دەوترا نێردراو و حەوارییەکان (الرسل والحواريون).[3] لە پێشەنگی ئەو نێردراوانەدا قەشە (پۆلس) بوو کە ڕۆشنبیرێکی جولەکەو هاولاتیەکی ڕۆمانی خەڵکی تەرتووس بوو. لە سەرەتادا دوژمنی ئاینی مەسیحی بوو، بەلام لە دواییدا باوەڕی پێ هێنا.[4] پۆلس ڕۆشنبیریەکی بەرزو شارەزاییەکی فراوانی هەبوو، سەبارەت بە تەعالیم و کلتوری جولەکەو فەلسەفەی یۆنانی و هەموو ئەو ئایدیاو ڕەوتانەی لە سەردەمیدا باویان هەبوو، هاوکات شارەزاییەکی باشی دەربارەی ئایینە ڕۆژهەلاتیەکانیش هەبوو. پۆلس خۆی یەکلایی کردەوە بۆ بانگەشە کردن بۆ گەیاندنی ئاینی مەسیحی بە خەڵکی. لە سەرەتادا مژدەو ئامۆژگاریەکانی بە تەنها بۆ

---

1. سعيد عاشور: اوروپا العصور الوسطى، ج١/ص٢٦.

(٢). روبرت ر. بالمر : س-پ،ل ٣٠.

(٣) . نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروپا،ط١، دار الفكر،١٩٦٧،ج١/ص٦٣.

(٤) . سعيد عاشور : اوروپا العصور الوسطى، ص٢٧.

نەتەوەکەی خۆی بوو.لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی ڕەهای بەوە هەبوو کە مەسیحیەت ئایینی تێکڕای گەل و نەتەوە و نەژادە جیاوازەکانە. هەروەها تانوپۆی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کردو لە هەموو ناوچەیەکدا کۆمەڵێ خوێندکاری لێ کۆبوویەوە، و بەڵێنی هەستان بە موژدەدان و بانگەشەکردن بۆلای ئایینە نوێیەکەی لێوەردەگرتن.[1]

## سێیەم: پەرەسەندنە فیکری و ئایینیەکان:

لە پاڵ ڕۆڵ و تێکۆشانی مەسیحیە پێشەنگەکان و قوربانیدانەکانیان و ڕۆڵی نێردراو و حەواریەکان، پەرەسەندنە فیکری و ئاینیەکانیش لە کاتی دەرکەوتنی ئایینی مەسیحیدا کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بەخۆیەوە بینی، یارمەتی دەرێکی باش و گونجاو بوون بۆ سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی. بەهۆی دەستکەوتە ڕۆشنبیری و فیکرییە مەزنەکانی یۆنان.

بت پەرستی (الوثنیة) یۆنانی و ڕۆمانی زۆر لە زیندویەتی و کارایی خۆیان لەدەست دا، هەرچەندە ئۆگستس هەوڵی دا سەر لەنوێ شوێنی خواوەندە ڕۆمانیەکان بەرزبکاتەوە، بەڵام ئۆگستس لەم کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو تەنها بەجەخت کردنەوەی لەسەر پەرستنی ئیمپراتۆر نەبێت کە ئەمەش لە ڕاستیدا ئایینی شێوازبەند(رسمی) ی دەوڵەت بوو. بەڵام پەرستنی ئیمپراتۆر زیاتر گومانی لای ڕۆشنبیران و پێگەیشتوان دروست کرد، چونکە لەگەڵ ژیری و لۆجیکدا ڕێک نەدەکەوت.[2] لەلایەکی ترەوە دەتوانین بڵێین فەلسەفەی ژیری هەرگیز ناتوانێت شوێنی بیروباوەڕی ئایینی بگرێتەوە، و هەرگیز ناتوانێت حەزە سۆز ئامێزو ڕۆحیەکانی مرۆڤێکی سادە تێر بکات، بەکورتی بۆشاییەکی ڕۆحی لە واقیعدا هەبوو. ڕەنگە هەر ئەوەش بتوانێت ڕاڤەی بڵاوبوونەوەی ئاینە تەسەوفیەکان بکات، دروشم و تەعالیمەکانی ئەم ئاینانەش تەواو لە پەنهانی و نادیاری و خەیاڵدا ڕۆچووبوون و ئاوێزانی ئەفسانەو خورافات ببوون، و لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو جیهانی یۆنانی و ڕۆمانی تەوژمیان هێنابوو. هەموو ئەو ئایینە هاتووانە بەوە جیادەکرانەوە کەوا لەگەڵ سۆزدا گونجاو بوون، ئەویش لە ڕوانگەی خەیاڵ و پەنهانیان لەلایەک و

---

(١) . موریس بیشوب: س-پ،ل ١٤٠.

(٢) . روبرت ر. بالمر : س-پ،ل ٣٠.

دەکـرد، بەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی لەگەڵیانـدا لێبـوردە بـوو. ئەو دەسـەڵاتە هـیچ هەوڵێکـی (جـدی) نەدا بـۆ ئەوەی لەڕیشـەوە هەڵیـان بکێشـێت و هەڵمەتـی چەوسـاندنەوەی بەهێزی لە بەرامبەردا بەکارنەهێنـان تەنها لە بـارودۆخە ئـاڵۆزو شێواوەکانی سەدەی سێیەمی زاییندا نەبێت.[1] مەسیحێتی هێرشی نەدەکردە سەر دەوڵەت و دژ بە دەسـەڵات ڕانەدەوەسـتا، بەڵام ملـی بـۆ دەوڵەتـیش کەچ نەدەکـرد. مەسیحیەکان سور بوون لەسەر ئەوەی سەربەخۆ بوونی خۆیان بپارێزن، بەتـایبەت لەبـواری پەرسـتن و بیروباوەڕیانـدا و ڕازی نەدەبـوون بە هـیچ شـێوەیەک دەسـت بخرێتە کاروباریـانەوە. دڵسـۆزبوون بەرامـبەر بەو بنەمـایەی کە دەڵێت ئەوەی هـی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر و ئەوەش کەهی خوایە بۆ خـوا (اعطی مـا لقیصـر لقیصـر ومالـلە للـە)، لەبەر ئەوە سـور بـوون لەسـەر ڕەتکـردنەوەی پەرسـتنی ئیمپراتـۆر کە دەسـەڵاتداریتی ڕۆمـانی بە دیـاردەیەک لە دیاردەکـانی پەیوەندیـداریەتی (انتمـاء) سیاسـی دادەنـا. بەڵام مەسـیحیەکان بە کـوفرو بـێ باوەڕییـان دادەنـا. هەروەهـا مەسـیحیەکان بەشـێوەیەکی ڕەهـا دەسـت تێـوەردانی دەسـەڵاتیان لە کاروبـاری پەرسـتنەکانیان ڕەت دەکردەوە، کە ئەمەش زۆر کێشـەو گیـرو گرفتـی بـۆ دروسـت دەکردن.[2]

## هەڵوێستی حکومەتی ڕۆمانی بەرامبەر بە ئایینی مەسیحی (سەردەمی چەوساندنەوە تا ساڵی ٣١٣ز)

هەرچەنـدە حکـومەتی ڕۆمـانی سیاسـەتێکی میـانەڕەوی بەرامـبەر بە ئـایینە جیاوازەکان هەبوو، بەڵام زۆر بەتونـدی ڕووبەڕووی ئـاینی مەسـیحی بوویەوەو، بەهەمـوو شـێوەیەک بەرگری لە بڵاوبوونەوەی دەکرد. چەند هۆکـارێکی گرنـگ لە پشت ئەم هەڵوێستە دژکاریەی حکومەتی ڕۆمانیەوە بوو، لەوانەش:

١. مەسـیحیە پێشـەنگەکان (المسـیحیین الاوائـل) زۆرینەیـان لە شـارەکاندا نیشـتەجێ ببـوون، بەڵام بەشـێوەیەکی گۆشـەگیرو دوور لە خەڵکی ژیانیان بەسـەر دەبرد، ئەمەش زیاتر گومانی لەسەر دروست دەکردن، بۆیە وای لە دەسـەڵاتداریتی ڕۆمانی کرد لێیان بترسێت و پاشانیش بەپیلان گێڕان دژ بە ئاسایشی وڵات تۆمەت

(١) . نورالدین حاطوم: س-پ،ل ٦٤.
(٢). روبرت ر. بالمر : س-پ،ل ٣٢.

باریـان بکـات. هەروەهـا زۆریـنەی مەسـیحیە پێشـەنگەکان لەلایەکەوە لەو گریکـانە بوون کە لەشارە ڕۆمانیەکاندا ژیانیان بەسەر دەبردو، لەلایەکی تریشەوە لە کۆیلەو چەوسـاوەکان پێک هـاتبوون، بۆیە ئەمـانیش بەشـێوەیەکی گشـتی جێگـای گومـان و نارەزایی هاولاتیە ڕۆمانیەکان و حکومەتی ڕۆمانی بوون.[١]

٢. مەسیحیەکان پەرستنی ئیمپراتۆر (عبادە الامبراطور) یـان ڕەت دەکردەوە، چونکە وایـان دەبینـی کە ئەو پەرستنە جۆرێکە لە بت پەرسـتی و هـەرگیـز نابێـت سازشی لەسەر بکەن، لە کاتێکیش دا پەرستنی ئیمپراتۆر ئەرکێکی بنەڕەتی بـوو سـەبارەت بە ئـاینی ڕۆمـانی کـۆن و یەکێـک بـوو لە پایەکـانی حـوکمی ڕۆمـانی و ڕەگەزێـک بـوو لە ڕەگەزەکـانی یەکێتـی و لە هەمـان کاتیشـدا دیـاردەیەکی پەیوەندیـداریەتی ئـاینەکە بـوو.[٢] کاتێـک دەسـەلاتداریتی ڕۆمـانی ئەم هەڵوێسـتە دژکـاریەی لە مەسـیحیەت بینـی کە چۆن دژ بە پەرسـتنی ئیمپراتـۆر ڕادەوەسـتێت، ئەمەی بە هەڕەشەیەکی ترسناک دانا نەک بۆ دەسەلات و پایەی بالای ئیمپراتۆر بە تەنهـا، بەڵکـو بـۆ ئیمپراتـۆریەتی و قەوارەی ئیمپراتـۆریەتیش، بـۆیە لە دیـدی دەسەلاتداراندا ئەنجامدەری تاوانی لەم شێوەیە شایستەی هەموو جۆرە سزا دانێک بـوو. ڕەنـگە ڕای مێژوونوسـی ڕۆمـانی (تـاکیتوس) باشـترین دەربـڕین بێـت کە تێڕوانینی ڕۆمانیەکـان لەم ڕووەوە دەخـاتە ڕوو، هەروەک دەڵێت: [مەسیحیەکان بە دژایەتی کردنی ڕەگەزی مرۆیی(الجنس البشری) تۆمەتبـار کران، بەوەی کە هەمـوو جۆرە گومـان(تشـکیک) ێکیـان بەرامبەر بە سـەرجەم ئەو بەهایـانەی کە کۆمەڵگـای شارستانیەتی لەسەر دادەمەزرێت، دروست دەکرد و بەرژەوەنـدی ئایینیـان لەسـەر هەموو بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەتەوە دادەنا].[٣]

هەموو ئەو هۆکارانەی باسمان لێکردن پاڵیان بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیەوە نا بۆ بەربەرەکـانی کردنـی مەسـیحیەتی. ئەم بەربەرەکـانیەش لەشـێوی چەوسـاندنەوەو ئەشـکەنجەدان و تەنـانەت کوشتنیشـدا دەردەکەوت. سـەرەڕای ئەو زێـدەڕۆییەی کە مەسیحیەکان لە وەسف کردنـی ئەم قۆنـاغەدا دەیکەن، بەلام دەبێت ئەوە بڵێین کە هەرگیز سیاسەتی دوژمنکاریانەی حکومەتی ڕۆمـانی بەرامبەر بە مەسـیحیەت نەک

(١).د.عبدالامیر محمد امین: س-پ،ل٣٣.
(٢). سعید عاشور :تاریخ اوروپا ،ص٣٤.
(٣). موسوعة الادیان: س-پ،ل ٢٧.

هەر نەیتوانی لە ڕیشەوە مەسیحیەتی هەڵبکێشێت، بەڵکو تەنانەت دەستەوەستانیش بوو لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئەو ئاینە نوێیەدا. ئەم هەڵوێستە دژ بە مەسیحیەتیە وای لە مەسیحیەکان کرد بەشێوەیەکی نهێنی و دوور لە چاوی دەسەڵات و چاودێری کردنی، مومارەسەی پەرستش و (گقوس)ە ئاینەکانیان بکەن، گەر ئاشکراش بونایە ئەوا ڕووبەڕووی گەورەترین شێوەی ئەشکەنجەدان دەبوونەوە.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنج بوو مەسیحیەکان زۆر بە ئازایەتی ڕووبەڕووی ئەم سیاسەتە توندەی دەسەڵات دەبوونەوە و چەوساندنەوەو ئەشکەنجەدان وای لێ نەدەکردن لە بیروباوەڕەکەیان پاشگەزبنەوە. چەوساندنەوەی مەسیحیەکان لە سەردەستی چەند ئیمپراتۆرێکی ستەمکار کە بە ستەم و یاخی بوون ناسرابوون وەک نیرون گەیشتە ترۆپک.[1] تەنانەت ئەم چەوساندنەوەیە لەسەر دەستی ئەو ئیمپراتۆرانەشدا کە بە دادپەروەرو ژیر ناوبانگیان دەرکردبوو وەک (دکلدیانۆس) هەر بەردەوامی هەبوو.[2] پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە ئیمپراتۆرەکان لەچاو فەرمانڕەوا ناوچەییەکاندا نەرم تر بوون چونکە ئەوان (واتە فەرمانڕەوا ناوچەییەکان) زیاتر حەزیان لە توند و تیژی وەڵام دانەوەی فشاری ڕای گشتی دژ بە مەسیحیەتی دەکرد. بەڵام دەتوانین سیاسەتی حکومەتی ڕۆمانی بەرامبەر بە مەسیحیەت بۆ ساڵانێکی دورو درێژ لەو کاغەزەدا دیاری بکەین کە(تراجان) بۆ فەرمان ڕەوای یەکێک لە هەرێمەکانی بن دەستی نارد کە دەڵێت:(لەبەر ئەوەی مەسیحیەکان بەئاشکرا بیرو باوەڕو پەرستنیان دەرنابڕن وازیان لێ بێنن).[3]

## داننان بە ئاینی مەسیحی دا (مرسومی میلان)

لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی زاییندا سەرەڕای هەڵسوکەوتی دژ بە مەسیحیەتی حکومەتی ڕۆمانی، جا هەڵسوکەوتێکی توند بووبێت یاخود هێواش، ئەوا ژمارەی مەسیحیەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیاد بووندابوو. بۆیە بارودۆخەکە خوازیاری پەیوەندییەکی نوێی نێوان ئیمپراتۆر و مەسیحیەت بوو. ژمارەی مەسیحیەکان هێندە زیادی کردبوو کە دەبوو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی مامەڵەی

---

(١). محمود سعید عمران:معالم تاريخ اوروپا،ص ٣٢-٣٤.

(٢). عبدالامير محمد امين: س-پ،ل ٢٥.

(٣). سعيد عبدالفتاح عاشور: س-پ-ل ٣٠.

لەگەڵدا بکات نەک نەفرەت لێ کردنی. ئیمپراتۆر قۆستەنتین (وەک کەسێتیەکی وریاو لێهاتوو درکی بەو ڕاستیە کردبوو) بۆیە لە ساڵی (٣١٣)دا بەپێی مەرسومی میلان ئەم هەنگاوە بوێرانەی نا. بەپێی ئەم مەرسوومە مەسیحیەت بووە ئاینێکی دانپێدانراو (المعترف) لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا.[1] بەڵام پاڵنەری پشت ئەم هەنگاوەی کوستەنتین تا ئێستا ڕوون نیە، بەپێی ڕیوایەتی مەسیحیە کۆنەکان، کاتێک ئیمپراتۆر لە پێشڕەوی کردندا بوو لە ئەوروپاو لەو جەنگەیدا کە دژ بە ماکسنتۆس بەرپای کردبوو، لە ساتە ناهەموارەکانی جەنگداو لەپاش ئاوابوونی خۆر نورێکی لە ئاسماندا بەدی کردو لە ناوەندیدا: خاچێک و لە ژێریشیدا ئەم دەستەواژەیە نوسرابوو(بە کۆمەکی خودا سەردەکەوین) بۆیە هەر لەو ساتەدا کۆستەنتین خاچی کردە دروشمی خۆی لەو جەنگەداو سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەمەش پاڵی پێوەنا بۆ ئەوەی دان بە ئاینی مەسیحیدا بنێت. لە ڕاستیدا کوستەنتین لە کۆتایی ژیانیدا بوو بە مەسیحی، بەڵام هەرگیز دەست بەرداری چەمکی(پەرستنی ئیمپراتۆر) نەبوو. ئەمەش ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ کە ڕەچاوکردنی بارودۆخی سیاسی و ویستی ئەو بۆ زاڵبوون بەسەر یەکێک لە هۆکارەکانی پشێوی و پەرت بوونی ئیمپراتۆریەت، پاڵنەری سەرەکی ئەم هەنگاوەی بوو نەک ڕەچاوکردنی بابەتە ئاینیەکان بە تەنها. هەرچەندە لایەنە شاراوەکانی ئەم ڕووداوە تا ئێستا ئاشکرا نەبووە بەڵام ئەوە لە گرنگی ئەو ڕاستیە کەم ناکاتەوە کە ئەم هەنگاوەی کۆستەنتین گرنگیەکی گەورەی هەبوو لەسەر داهاتووی مەسیحیەت و تەنانەت داهاتووی ئەوروپاش.[2] هەرچەند لەسەر دەستی ئیمپراتۆر جولیانی هەڵگەڕاوە(جولیان المرتد) (٣٦١ – ٣٦٣ز) مەسیحیەت تووشی نوشوستیەکی کاتی هات، بەڵام ئەم نوشوستیە زیاتر ئاینە نوێیەکەی بەهێزتر کرد. لە سەردەمی ثیودسیوس (٣٩٥ز)دا مەسیحیەت بەرزکرایەوە بۆ ئاستی ئاینە شێواز بەند(رسمی)یەکانی دەوڵەت لەپاش ئەم قۆناغە حکومەتی ڕۆمانی دەستی کرد بە چەوساندنەوەی پەیڕەوکەرانی ئاینەکانی ترو لەپاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، ئیمپراتۆریەت بووە ئیمپراتۆریەتێکی مەسیحی.[3]

---

(١). سعید عاشور: س-پ،ل ٣٠-٣١.

(٢).فشر:س-پ-ل،٦

(٣). محمود سعید عمران:س-پ،ل٤٥-٤٦.

## بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی لە ماوەی هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەم

لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمدا سەرەڕای ئەو هەڵسوکەوتانەی حکومەتی ڕۆمانی بەرامبەر بە مەسیحیەت دەینواند، کڵێسەی ڕۆمانی لە سەرجەم بەش و ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا دەستی بە چالاکی نواندن کردو لە دامەزراندنی دام و دەزگای چەسپاو و جێگیر کە لە سیستمی کەهەنوتی و پاپاو ئۆسقۆفەکاندا خۆی دەنواند سەرکەوتوو بوو. لە سەدەی پێنجەمیشدا کە دەسەلاتی ڕۆمانی بە شێوەیەکی یەکجارەکی ڕووخا. کڵێسەو ڕێکخستنەکانی توانییان بمێننەوە، تەنانەت هێندە بەهێز بوو کە توانی دەسەلات و قەڵەمڕەوی خۆی بەسەر کۆمەڵگای ئەورووپیدا بچەسپێنێت و شوێنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بگرێتەوە، کڵێسەی کاسۆلیکی بە تەنها لە گەشەپێدانی کڵێسەدا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکو لە ڕێی جوگرافیشەوە توانی سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کۆن تێبپەڕێنێت.[1] کاتێک سەکسۆنەکان بەریتانیایان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە، خەریک بوو دورگەکانی بەریتانیا بە گشتی گۆشەگیر بخرێن، بەلام قەشە (پاتریک) کە شەشساڵی لاوی خۆی لە ئیرلەندا بەسەر بردبوو، پاشان لە ولاتی گاڵ ببووە ڕاهیب لە ساڵی(٤٦١ز) دا گەڕایەوە بۆ ئێرلەندا تا دەست بکات بە بلاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی، ئەوەبوو توانی ئەم ئایینە لەناو ئێرلەندیەکاندا بلاو بکاتەوە، ئەوانیش بە ناوچەکانی دەوروبەریاندا بلاویان کردەوەو بوونە موژدەدەری کارای ئایینی مەسیحی، مژدەدەرە ئێرلەندیەکان بە سەرکردایەتی سنت کۆلۆمبا(٥١٢ – ٥٩٧ز) بۆ گەیاندنی ئایینە نوێیەکە بە ئاودا ڕۆیشتن و ڕوویانکردە کەنارەکانی باکووری ئینگلتەرەو لەوێدا گەلیکیان بینی کە زمانیان لە زمانی کلتیەوە نزیک بوو، لەبەر ئەوەی ناوە لاتینیەکەی ئێرلەندا سکۆتا Scota بوو، بۆیە ئەم ناوەیان بەسەر ئەو بەشە باکووریەی بەریتانیادا بڕی و بە سکۆتلەند Scotland ناسرا.[2]

هەندێ موژدەدەری ئێرلەندەیی تر دەریایان بڕی و ڕوویانکردە (برتانی) کلتی کە دەکەوتە ناوەوەی ولاتی فەرەنجە کە تا ئەو کاتەش بت پەرست بوون، ئەوانیش ئاینی مەسیحییان تێدا بلاوکردەوە. هەروەها لە کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمدا

---

(١). عبدالامیر محمد امین:س–پ–ل ٣٩–٤٠.

(٢). سعید عبدالفتاح عاشور:اوروپا العصور الوسطی,ل ٩٢.

(٥٩٧ ز) پاپـا گریگـۆری ئۆگسـتینی ڕاهیبـی بـۆ ڕێنمـوونی کـردن (هیـدایه)ی سەکسـۆنەکانی باشـووری ئینگلـتەره نـارد. ئەمـیش سـەرکەوتنێکی بێـوێنەی لەم کارەیـدا بەدەسـتهێنا، هەوەهـا مـوژدەدەری سەکسـۆنی (ونفـرد) که له پاشـاندا بە(بونیفـاس) ناسـرا هەسـتا بە دامەزرانـدنی کڵێسـەیەک له بەشـە ڕۆژهەڵاتـیەکەی وڵاتی فەرەنجەدا. هەر بۆیه زۆرینەی فەرەنسیەکان تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بۆنیفاس به قەشەی نەتەوەیی خۆیان دەزانن.[١]

له ڕۆژهەڵاتیشـدا هەردوو قەشـەی بـرا (مپیـدیوس) و (سـیرل) هەسـتان به ئەنجامدانی چالاکیەکی گەورە و له ڕێنموونی کردنـی گەلانـی سلاڤدا سـەرکەوتنیان بەدەست هێنا، لەکاتێکیشـدا که کڵێسـه لێکهەڵوەشـا، له هەمـوو شـوێنێکدا بارودۆخی باو دەسەڵاتی کڵێسەی دیاری دەکرد. له ڕۆژهەڵات لەبەرئەوەی حکومەتێکی بەهێز هەبوو و دەسەڵات و سەرکردایەتی بەدەست حکومەتی ئیمپراتوریەتەوە بوو، کڵێسه ملکەچی ئەو حکومەته بـوو. بەڵام له ڕۆژئـاوادا لەبەر ئەوەی ئەو دەسـەڵاته نەبوو، دەسـەڵاتی کلێسا باڵابوو، بۆیه ئەم بارودۆخه شوێن و پایەیەکی بـاڵای پێ بەخشـی که بۆ هاوشێوە ڕۆژهەڵاتیەکەی (کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی) نەڕەخسا.[٢]

هەڵگەڕانەوە(الهرطقـة)ی کڵێسـەی مەسـیحێتی له بەرەبەیـانی مێـژوویەوە زۆر بـزوتنەوەی جوداخـوازی لـێ جیـا بوویەوە. مەبەست له هەڵگەڕانەوە (الهرطقة)واتا بیـدعەت یـاخود دەرچـوونێکی تەواو یـاخود بەشـێکی بیروبـاوەڕەی دانپێـدانراوەی کڵێسه، هەڵگەڕانەوە جودایی و جیاوازیەکی ڕۆحـی و ڕۆشـنبیری بـوو و پەیوەنـدی به دۆزەکانی ئاکارەوە یـاخود سـەرپێچی کـردن (المعاصـی)ەوە نەبـوو. لەکاتێکدا که ژمارەی هەڵگەڕاوەکـان له زیادبووندابوو، بزوتنەوەکەشـیان له فراوان بـووندا بـوو، لەلایەکەوە ئەم بـارودۆخه وەڵامـدانەوەیەکی بەهێـزو پشـتگیری له لایەن کڵێسـەوە دەخواسـت، له لایەکی تریشـەوە بەربەرەکـانی کردنـی هەڵگەڕاوەکـان بـووە هـۆی به هێزکـردن و شـکۆمەندکردنی کڵێسـه.[٣] زۆری بـزوتنەوە هەڵگەڕاوەکـان(الحرکـات الهرطقیه) کڵێسەی ناچارکرد دوو کاری گرنگ ئەنجام بدەن:

---

(١). سعید عاشور:س-پ،ل١٧٢.

(٢). محمود سعید عمران: س-پ،ل٥٥.

(٣). موریس بیشوب:س- پ، ل٢٠٠.

یەکەمیان: پێناسە کردنێکی شێواز بەند (ڕەسمی) و وردو دیاری کراو بۆ ئەو عەقیدەیەی کە جیاوازییان لە بارەیەوە هەیە.

دووەمیان: گرتنەبەری چەند هەڵسوکەوتێکی داپڵۆسێنەرانە یاخود قایلپێکەرانە (اقناعی) بەرامبەر بە هەڵگەڕاوەکان، زۆرینەی ئەم بزووتنەوە هەڵگەڕاوانە لە ماوەی سەدەی یەکەم لە مێژووی مەسیحێتدا دەربارەی کۆمەڵە کاروبارێک کە پەیوەندی بە عەقیدەی سیانەکی (الثالوث) یەوە هەبوو دەرکەوتن. بێگومان ئەمەش خاڵێکە کە تا ئێستا تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی ئەستەمەو زۆر ئاڵۆزو پەنهانە. لێرەدا بەردەوام پرسیارێک دەربارەی سروشت و کەسێتی حەزرەتی مەسیح و پەیوەندی ئەو(حەزرەتی مەسیح) بە باوک (الاب)ەوە سەر هەڵدەدات. ڕەنگە ئاریوس Arius کۆنترین هەڵگەڕاوە بووبێت کە ئەم بابەتەی وروژاندوە، هەر لە ناوی ئەوەوە ئاینزای ئاریوسی داتاشراوەو لە ساڵی (٣٢٣ز) لە ئەسکەندەریەوە دەرکەوتووە. ئەگەر مەسیح کوڕی خوا بێت ئەوا بێگومان لەو بچووکترو نوێ ترە بۆیە دەسەلاتی لە خوا کەمترە، یەکێ لە سیفەتە ئەزەلیەکانی خوا بریتیە لە بێ سەرەتایی و بێ کۆتایی بوون. بەلام مەسیح ئەزەلی نیە چونکە سەرەتای هەیە.[1] بەلام ئەسقۆفی ئەسکەندەریە بە توندی بەرامبەر بەم بۆچوونانەی ئاریوس ڕاوەستاو سزای مەحروم(عقوبە التحریم) کردنی بەرامبەر دەرکرد. بیرو بۆچوونەکانی ئاریوس گیروگرفت و کێشەیەکی زۆری لەناو مەسیحیەکاندا دروستکردو پاشانیش لێکی ترازاندن، هەر ئەم هۆکارە بوو پاڵی بە ئیمپراتۆر کەستەنتینی گەورەوە نا لە ساڵی (٣٢٥ز)دا کۆبوونەوەی نیقیە گرێ بدات.

لەم کۆبوونەوەیەدا بە وردی ئەزەلیەتی حەزرەتی مەسیح و یەک بوونی تەواوی بە باوکەوە دیاریکرا، بەلام ئاریۆسێتی هەر بەربەرەکانی دەکرد، بەلام بیروباوەڕی کاسۆلیکی بە پشتیوان لێکردنی حکومەتی ڕۆمانی توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ. لەهەمان کاتدا ئاریۆسێتی لە بوارێکی تردا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ. ئەویش بریتی بوو لە هەستانی موژدەدەرە ئاریۆسیەکان بە بلاوکردنەوەی ئەم ئاینزایە لەنێو هۆزە جەرمانەکاندا.[2] لە کۆبوونەوەی (ئەفسوس)یشدا کە لە ساڵی (٤٣١ ز) دا بەسترا جارێکی تر جەخت لەسەر عەقیدەی

---

(١). سعید عاشور :اوروپا العصور الوسطی،ص٤٧.

(٢).موسوعە الادیان:س-پ،٧٣.

سیانەکی (الثالوث) کرایەوە. ئەمەش ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکانی نوستریوس بوو کە پێی وابوو حەزرەتی مەسیح دوو سروشتی هەیە یەکێکیان ئاسمانی و ئەویتریش مرۆیی کە لێوەی دووکەسێتی بەرهەم هاتووە، حەزرەتی مەریەمیش دایکی ئەو کەسێتیە مرۆییە یە بە تەنها. هەروەها لە کۆبوونەوەی ئەفسوسدا جەخت لەسەر (دایکی خوا) وەک نازناوێکی مەریەم کرایەوەو بەهەمان شێوەش شوێنی مەریەم بەرزکرایەوەو بە گەورەی هەموو قەشەکان دانرا، هەر لەم ساتەوە بالآیی و بەرزڕاگرتنی پایەی حەزرەتی مەریەم بووە تایبەتمەندییەکی بیروباوەڕی مەسیحیەتی کاسۆلیکی.[1] هەروەها کڵێسەی کاسۆلیکی ڕووبەڕووی هەڵگەڕانەوەیەکی تر بوویەوە کە مینۆفستیەکان پێی هەستان و پێیان وابوو حەزرەتی مەسیح یەک سروشتی هەیە. کۆبوونەوەی (خەلقەدونیا) لە ساڵی(٤٥١ز)دا ئەم بۆچوونەی ڕەت کردەوەو، پێناسەو دەستنیشان کردنەکەی پێشووی سەبارەت بە کەسێتی و سروشتی حەزرەتی مەسیح دووپات کردەوە. مینۆ فستیەتی لە ڕۆژهەڵاتدا سەرکەوتنی بە دەست هێناو توانی مەشخەڵ (معالم) ەکانی بڵاو بکاتەوەو لایەنگرێکی زۆر لە وڵاتانی میسرو سوریاو فەلەستین بۆ خۆی دروست بکات کە کێشەو گیروگرفتی زۆری بۆ ئیمپراتۆرە ڕۆژهەڵاتیەکان دروستکرد.[2]

## کۆمەڵگەی کڵێسەیی

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دوو هێزی گەورە لە ئەورووپادا بوونیان هەبوو، ئەم هێزەش یەکێکیان لە ڕۆماوە هاتبوو کە پاپا بوو، دووەمیشیان لە فەرەنسای ئاوستراسیاوە کە پاشا بوو، بەرپرسیارانی ئاوستراسیا و پیپنی هێرستال و چارل ماتێل دەوڵەتی فەرەنجەیان بنیاتنایەوە و ڕێگەشیان بۆ ئیمپراتۆریەتێک خۆشکرد لە پاشدا کە چارلمان جڵەوی دەگرێتە دەست، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ڕۆما دەبینین پاپا تێکڕای کڵێسەکانی خۆرئاوای لە دەوری خۆی کۆکردەوە و خۆی بە سەرۆکی ئەو کۆمەڵگا کاسۆلیکیە دانا، ڕێگای بۆ جێگرەوەکانی خۆشکرد تا بانگەشەی ئەوە بکەن ئەوان خاوەن زاتی تەنهان بە سەر ئەو کۆمەڵگایەدا، لە هەمان کاتدا کڵێسە هۆیەک

(١). حسين محمد ربيع: س-پ،ل ٧٣.
(٢). هەمان سەرچاوە،ل٢٨.

بوو بۆ نەمانی ئیمپراتۆریتی ڕۆمانی، هەرچەند کڵێسە زۆر بە هێواشی و لەسەرخۆ گەشەی دەکرد، بەڵام لە هەمان کاتدا بە شێوەکی زۆر بە هێز وپشت ئەستورانە بوو بە درێژایی هەموو ئەو سەدانە.[1] یەکێک لەو هۆکارانەی کە پاڵپشت بوو بۆ کڵێسە، تیۆرییەکانی پیترۆس بوو (Petrine Theory) کە دەڵێت:(قەشە پیترۆس وەک میرێکی پەیامبەر وایە کە بەڵێن و مافی دەسەلاتی بالای لە کڵێسەدا پێ ڕەوا بینراوە). سەبارەت بەو خاڵەش کە ئەم تیۆریەی لە سەر هەڵچێنراوە لە بابەت (الاصحاح ١٦خالی ١٨) ی ئینجیل دا هاتووە (تۆ ئەی پیترۆس لە سەر ئەم تاشە بەردە کڵێسە دروست بکە)، دیانیەکان لە نێو ئیمپراتۆریەتەکەدا بەرەو کۆمەڵگایەکی بەرفراوان دەچوون هەر لە بەریتانیاوە تا ڕۆخەکانی ڕووباری فورات، لە هەمان کاتدا سیمبوڵی خاچ جێی وشەو قسەکردنی گرتبووەوە. هەرچی دیانەکانن جا سەر بە هەر زمان و دەوڵەتێک بوونایە ئەوا سەرجەم خێزانێکیان پێک دەهێنا کە ئەویش خێزانێکی دیانی بوو. لە سەدەی پێنجەمەوە هەڵبژاردنێکی گەلێر بۆ کڵێسەکان دەستی پێکردبوو، ناوچەکان دابەشکرا بوون بە سەر چەند ئەسقەفێکەوە کە لە لایەن ئەساقیفەکانەوە بەڕێوە دەبران. ئەم یەکێتی ئەسقەفیانەش کڵێسەی ناوچەکەیان پێک دەهێنا کە لە لایەن میترانەوە سەرپەرشتی دەکرا، لە سەرو ئەمانەشەوە بەتریارک هەبوو کە ئەمانەش لە پایتەختەکانی ئەو دەمەی وەک: کەستەنتینۆپۆل و ئەسکەندەریە و ئەنتاکیا و ڕۆما و قودس و قەیسەریە کە بادۆکیا و قەرتاجی تونس و هەرقلیەی تراکیا هەبوون. بەو چەشنە کڵێسە دانی دەنا بە دەسەلاتی بالای هەریەکێک لەوانەدا لەسەردەمە جیاوازەکاندا، لە ماوەی سەدەکانی پێنج و شەشدا لە ژێر فەرمانرەوایەتی پاشا بەربەرەکاندا، ئەوا ئەساقیفەکان ئەو دەسەلاتەی کە بە دەستیان هێنا بوو لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا پاراستبوویان لە شەڕو غەزوکردنی ناوخۆو دەرەوەدا.[2]

خوێندکاری کڵێسەکان (الرهبانیە) هەڵبەت مەبەست لە سیستمی پەرستگەکان بریتی بووە لە ژیانێکی خاوێن تر بۆ ئەوانە وەک لە ژیانی ئاسایی سەرجەمی دیانەکان.خوێندکارانی کڵێسەکان لە سەرەتادا لە ڕیزی پیاوە ئاینی یەکاندا بوون، لە

---

(١) .سعيد عبدالفتاح عاشور:حضارة ونظم اوروپا،ص٣٥.

(٢). عبدالامير محمد امين:س-پ،ج١/ل ٤٠-٤٢.

هەمـان کاتیشـدا خوێنـدکاران خۆیـان ئەو شـتەیان نەدەویسـت، بەڵکو وەک تەواوی خەڵکانی ئاسایی وابوون. خوێندنی کڵێسە سەرەتا لە میسرەوە دەستی پێکرد،پاشـان شـام. خوێنـدکارەکان ژیـانێکی دژوارو نارەحەتیـان بە سـەر دەبـرد لە بـاری ڕۆژو گـرتن و ڕابـواردنی ژیـانەوە، بەڵام خوێنـدکارانی کڵێسـەی ئەوروپـای ڕۆژئـاوا بەو جۆرە تاڵاوی نارەحەتی ژیان ورۆژو گرتنیان نەبوو.[1]

لە سەردەمی هەڵچوون و لێدانی بەربەرەکاندا چەند حەشارگەیەکیان (ملاجیءْ) بۆ خەڵکی کردبووەوە، لەوێدا خەڵکەکە زیاتر لە جێگەکانی دیکە هەستی بە پشـوودان و دڵنیـایی دەکـرد. ئەو حەشـارگانە بە تـایبەت لە سـەدەی پێنجەمـدا لە پەرسـتگەی قەدیـس ڤیکتـۆر بـوو لە مێرسـیلیا و هەروەهـا پەرسـتگەی مـیلان و تـور، لەو پەرستگایانەدا قسـەو بـاس لە سـەر قەزاو قەدەرو نیعمەتی خـوایی و هەڵەو گونـاح دەکرا، جگە لەوە یاساکانی پەرستگەکان وادانرا بوون کە بە پێی پێویستییەکانی ئەو دەمەی ئەوروپـا بگـونجێ. لە هەمـان کاتـدا خوێنـدکارەکان دەیانویسـت لە بەردەم کاروبارەکـانی پەرسـتگەکاندا بەرپرسـیار بـن. ئەگەر پێشـتر وشـەی پاپـا Pope بە شـێوەیەکی گشـتی بـۆ ئەسـاقیفەکان بە کـار دەبـرا، ئەوا لەوەودوا تەنهـا بـۆ ئەوانە بەکـاردەهێنرا کە لە سـەر تەختـی پاپـایی دادەنیشـتن و ئەویـش تەنهـا لە ڕۆمـا بـوو. ئەسقەفی ڕۆما زەوی و موڵکێکی یەکجار زۆری هەبوو ئەویش لە یەکەم سـەردەمی ئیمپراتۆریێتی ڕۆماو سەرجەمی ئیتاڵیادا. بەوجۆرە ئەسقەفی ڕۆما بەرپرسیار دەبوو لە سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی ئەو زەوی و موڵکانەدا.[2]

### ناکۆکی نێوان پاپاکان و بیزەنتە

وەک وتمان لەو سەردەمەدا پاپا ببووە حاکمی دیانی، کاتێک دەسـەڵاتی پاپاکـان لە زیاد بووندا بوو لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکان لە کزی و لاوازیدا بوو، ئەمەش دەبوو دۆخێکی وا بخوڵقێنێ دژایەتـی و بەیەکدادان لە نێوانیانـدا پەیـدا بێـت، لە کۆتـایی سـەدەی حەوتەمـدا کاتێـک پاپـا سێرگیوسـی یەکەم ئەوەی ڕەت کـردەوە دان بنـێ بە بڕیارەکـانی کـۆمەڵەی ترولـۆ Truilo دا، هەر لە سـاڵی (٦٩١ز)ەوە لە ڕۆما بەیەکدادان لە نێوان پاپاکان و ئیمپراتۆردا هەبوو. جەستنیانی دووەم پلانێکی

---

(١) . سعید عاشور: حضارة ونظم اوروپا،ص٣٢.

(٢).فشر :س-پ،ل٣٥.

بۆ کەنار خستنی (عزل) پاپاکان دانا بوو، بەلام هێزی سەربازەکان سەرنەوی کردنیان بۆ ئیمپراتۆرەکان ڕەتکردەوە، ئەمەش هۆی ڕاپەڕین و بەرپابوونی چەند شۆڕشێک بوو لە ڕۆمادا. لەم کاتەشدا پاشای لۆمباردیە(٧١٢-٧٤٤ز) لیوتپراند (Liutprand) هێرشی کردە سەر ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لە باکووری ئیتالیا، ئەو مەترسیە لە سەردەمی پاپا گریگۆردا سەر لەنوێ دەستی پێکردەوە، مەبەست لێرەدا پاپا گریگۆری سێهەمە (٧٣١-٧٤١ز) کە هێرشی بردە سەر لۆمباردیەکان، بەمەش هەڕەشەی لێ کردن کە چی دی نیازی هێرش بردنە سەریان نەبێ بە تایبەتی فەرەنجەکان.[1]

پیپنی سێیەم (٧٤١- ٧٦٨ز): دوای چارل مارتێل کوڕەکەی پیپنی سێیەم کە بە پیپنی کورتە بالا ناسرا بوو بۆ ماوەی دە ساڵ کارەکانی لە بەهێزکردنی دەسەلاتیدا چەقی بەستبوو، لە ساڵی (٧٥١ز)دا نامەیەکی بۆ پاپا زەکەریا ناردبوو، تیایدا داوای کردبوو پاشای مێرۆڤیچەکان بە لاوە بنێ و خۆی بکرێتە پاشای فەرەنجە، بۆ وەرگرتنی بڕیارێک لەو بارەوە کۆبونەوەیەک کرا لەگەڵ پیاوانی ناودار لە نۆڤەمبەری (٧٥١ز) داو لەگەڵ کۆمەڵەیەکی دیکەشدا لە مانگی یەکی (٧٥٢ز)دا کۆبونەوەیەکی تر سازدرا کە لە کۆمەڵەی دووەمیاندا چەند پیاوێکی ئاینی لە سەروو هەموویانەوە بۆنیفاسی قەشە ئامادە بوو، هەردوو کۆبوونەوەکە لە شاری سواسۆن ئەنجام دران، لەوێدا بڕیار درا پیپنی سێیەم ببێتە پاشای فەرەنجە، بەوجۆرە حوکمداریێتی بنەماڵەی مێرۆڤیچەکان (٤٨٦-٧٥١ز) کۆتایی هات و بنەماڵەی کارۆلینجیەکان (٧٥١- ٩٨٧ز) دەستی پێکرد، ئیدی لەو دەمەوە پێوەندی نێوان پاپاکان و پیپنی سێیەم بە هێز بوویەوە. [2]

### ئایینی ئیسلام

ئیسلام کە کۆتا ئایینی ئاسمانیە بۆ مرۆڤایەتی، سەرچاوەی تێڕامانی موسلمانانە بۆ ژیان، مێژووی ئیسلامیش تیشکی رووناکی لەو ئاینەوە وەرگرتووە وئیسلام بنەڕەتێک بووە بۆ پەیڕەوی ژیان. لەرووی زمانەوانیەوە ئیسلام واتای ملکەچی و

---

(١) . حسنين محمد ربيع: س-پ،ل١٠٠-١٠٥.

(٢) .عبدالامير محمد امين:س-پ،ل١٠٢.

خۆبەدەستەوەدانە بەڵام لەرووی ئاینییەوە کۆتا ئایینی ئاسمانیە کە خوا پێی ڕازیە بۆ هەموو مرۆڤایەتی و موحەمەدی کوڕی عەبدولا(د.خ)ی وەک کۆتا پێغەمبەر ناردووە بۆ ڕێنمونی مرۆڤایەتی و جنۆکەش.

بنەڕەتەکانی ئایینی ئیسلام خۆیان دەدیەوە لە:

١-خودا تەنهایە و هیچ هاوەڵێکی نیە و چاک وخراپ بەدەست خوایە.

٢-قورئان پەیامی بێگومان ودەستکاری نەکراو و پارێزراوی خوایە.

٣-موحەمەد (د.خ) پێغەمبەری خوایە و کۆتایی زنجیرەی پێغەمبەرانە، وتەکانی لە خواوەیە (ان هو الا وحي يوحى) و خۆ بەخۆ قسەناکات.

٤-ئیسلام کۆتا ئایینە و لە پەیڕەوی ژیاندا لای دەسەڵاتی ئیسلامی و کۆمەڵگەی موسڵمان قبوڵە، لە بڕیاری بیروباوەڕی و تێرامان بۆ ڕۆژی دوایی، خوا بە ناردنی ئیسلام هیچ ئایینێکی پێشووی ناوێت وقبووڵی نیە (ومن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منه).

٥-ئیسلام تەواوکەری ئایینە ئاسمانیەکانی پێش خۆیەتی و پێغەمبەریش(د.خ) وا پێناسەی خۆی کردووە کە هەموو پێغەمبەران وەک خشتی خانوویەک وان، خانوەکە یەک خشتی لە سووچێکەوە مابوو ئەویش موحەمەدی کوڕی عەبدولایە(د.خ).

٦-بڕوابوون بەخوا و فریشتەکان وپێغەمبەران وکتێبەکانی خوا و ڕۆژی دوایی وخێروشەڕی قەدەر پایەکانی ئیمانن وبێ ئەوانە تاک لە بازنەی ئیماندا نابێت، بەڵام ئیسلام خۆی بە تەواوکەرو خاوەنی ئایینە ئاسمانیەکانی پێشوو دەزانێت.

٧-قورئان وسوننەت تاکە سەرچاوەی ئایینن ولادان لێیان گومڕاییە، پێغەمەری خوا (د.خ) موحەمەدی کوڕی عەبدولای قورەیشی هاشمیە کە لە کۆمەڵگەی عەرەبی حیجازدا دەرکەوت، ئەم پێغەمبەرە (د.خ) لە ساڵی ٥٧١ز لە دایک بوو، پێش لە دایکبوونی باوکی مردو سەرەتاکانی ژیانی بە سەختیەکانی مەرگی باوک ودایک و باپیر وبێ براوخوشکی بردەسەر، دواتر بەشداری کرد لە جەنگ وکاری بازرگانی و ڕێکخستنی کێشەکان، لە مەککە لەسەر بنەڕەتی چەسپاندنی بیروباوەڕ کاری دەکرد ولە مەدینەش دەوڵەتی دامەزراند و دواتر فراوانخوازی دەسەڵاتی ئیسلامی هاتەکایەوە، بە تەواوکردنی پەیامی خوایی لە ساڵی ١١ کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

دواتر خەلیفە راشیدینەکان هاتن سەردەمی راشدین لەچەند بوارێکەوە هەنگاوی نا:

١- له سیستمی دەسەڵاتدا کارکردن به قورئان وسوننەت و گرتنەبەری شوراو ڕێکخستنی ئیداری.

٢- له ئاستی دەرەوەدا فتوحاتی ئیسلامی و پێشڕەوەی وبانگەواز.

له سەردەمی ئومەویدا بارەکه گۆڕا و شورا بۆ پۆستی یەکەم (خیلافەت) نەما و بوو به میراتی، بەڵام فتوحات و بانگەواز لەسەر ئاستی دەرەکی تەواو پێشکەوت.کۆمەڵگه لەسێ چین پێکهاتبوو چینی دەسەڵاتدارو زانایان و جەماوەر، پەیوەندی نێوانیان بەهێز بوو، زانایان هاوسەنگی نێوانیان ڕادەگرتن، باری ئابوریش بەرەبەرە گەشەی دەسەند.

دواتر سەردەمی عەبباسی هات که بەهەمان شێوەی ئومەوی بوو بەڵام به سێ تایبەتمەندی زیاترە وە:

١- بەشداری بەرفراوانی نەتەوەکانی دیکەی جگه له عەرەب وەک فارس وتورک وکورد له دەسەڵاتدا.

٢- بزاڤی بەهێزی ژیاری هەم له مەیدانی بیناسازی و هونەر و نەخشاندندا هەم له میدانی نووسین و زانستدا بەجۆرێ بوو به نموونەی باڵای سەردەمی خۆی.

٣- بوونی فرە دەسەڵاتی له سایەی دەسەڵاتێکی بەڕێز سەیرکراوی خیلافەتدا، دەبینن چەندین میرنشین و دەوڵەتی پەیوەست به خیلافەت دەرکەوتن.

سەبارەت به بەریەککەوتنی موسڵمان و مەسیحیەت دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی دەوڵەتی ئیسلامی له مەدینه لەسەردەمی پێغەمبەردا(د.خ)، ئەویش کاتێ ڕۆمەکان عەرەبه بەکرێگیراوەکانی لای خۆیان لەگەڵ سوپایەکی خۆیاندا ڕێکدەخست بۆ لێدانی موسڵمانان و هێرش بردنه سەریان، بۆیه پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی دانەوە و جەنگی موئته روویدا و دواتریش جەنگی تەبووک که تیایدا لەگەڵ چەند لایەنێکی مەسیحیدا ڕێککەوتنی ئاگر بەستی بەست کاتێ ئامادەییان بۆ ڕێککەوتن دەربڕی، دواتر لەسەردەمی خەلیفه ڕاشیدینەکاندا ئەمه بەردەوام بوو، لەسەردەمی ئومەویشدا موسڵمانان تەواو پێشڕەوییان کرد. مەسیحییەت جیا له شکستی له مەیدانی سەربازیدا شکستی خۆی لەمەیدانی هزری وبیروباوەڕیشدا بینی، سەردەمی عەبباسی بەرفراوانترین ماوەی ئەو جەنگانەی بەخۆوەدی و جەنگه خاچیەکان روویاندا.

دابەشبوونی مەزهەبی ناو موسڵمانان و دەرکەوتنی ڕەوتە جیاجیاکانی وەک شیعە وخەواریج و موعتەزیلە گرفت بوون بۆ موسڵمانان، هەرچەندە موسڵمانان لەچەند خاڵێکی گشتیدا یەکیان دەگرتەوە بە جیاوازی ئەو هەموو ڕەوتانەشەوە: (یەک خوا یەک پێغەمبەر یەک کتێب یەک قەبیلە) بەڵام ناکۆکی سیاسی زیانمەندی دەکردن، بۆ نمونە پیلانی توندی شیعە دژ بە موسڵمانان یاریدەدەری خاچیەکان بوو یان ڕەوتی کاریگەربوونی موعتەزیلە بە بیری کۆنی یۆنانی شلۆقی مەیدانی هزری ناو موسڵمانانی لێکەوتەوە، بەڵام وێڕای ئەمانە بەگشتی رەوتی ئیسلامی توانی بەسەر بارەکەدا زاڵ بێ و لە ململانێی مەسیحیەتدا چۆک دانەدات.(١)

---

(١) . بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د.حسین ابراهیم حسن: تاریخ الاسلام ( السیاسي -الدیني - الثقافي - الاجتماعي)، دار الجیل، بیروت،٢٠٠١،٤ اجزاء.

## بارودۆخی ناوچەی ڕۆژهەڵات پێش هاتنی خاچپەکان

شەڕی خاچپەکان بە یەکێک لە ڕووداوە هەرە گرنگەکانی مێژووی ئیسلام و مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دادەنرێت و نزیکەی (٢٠٠) ساڵی خایاند، لەبەر ئەوە هەوڵدەدەین باسی بارودۆخی ڕۆژهەڵات بە گشتی و ناوچەی شام بە تایبەت بکەین، کە جێگای ململانێ و شەڕ و ئاژاوەی نێوان خیلافەت و میرنیشینەکان بوو، هەروەها باسی ڕا و بۆچوونی مێژوونوسان دەکەین لەبارەی گرنگترین هۆکارەکانی شەڕی خاچپەکان، لەوانەش هۆکارەکانی"ئایینی، ئابووری، ڕامیاری، کۆمەڵایەتی، مێژوویی"هتد.

دوو زلهێزی گەورە دەستیان گرتبوو بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، یەکەمیان بیزەنتینەکان کە مەسیحی بوون و دووەم فاطیمیهکان کە موسڵمانی شیعە بوون، لە نێوان ئەم دوو هێزەدا دەوڵەتی عەبباسی لە بەغدا کە سەلجوقیەکان دەستیان بە سەردا گرتبوو لاواز ببوو، ناوچەی شامیش پێش دەست پێ کردنی هێرشی خاچپەکان لە ڕووی ڕامیاری و ئابووری و ئایینیەوە لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و ناهەمواردا بوو، چونکە لە لایەن چەند هێزێکەوە فەرمانڕەوایی دەکرا و بەردەوام ململانێ هەبوو لە نێوان میرەکانیاندا، بەمەش باشترین دەرفەت ڕەخسا بۆ خاچپەکان تا هێرش ببەنە سەر وڵاتی شام و میرنیشینی تێدا دامەزرێنن، خیلافەتی عەبباسی هەوڵی دەدا وڵاتی شام لە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیدا بمێنێتەوە، بەڵام میسر بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر فەرمانڕەوایی طوڵۆنیەکاندا بوو،[1] لە ئەنجامی سەرهەڵدانی شۆڕشی قبتی و عەرەبەکان لە میسر خەلیفەی عەبباسی"مأمون"سوپایەکی لە خۆراسانیەکان دروستکرد و ڕەوانەی میسری کرد بۆ جێگیرکردنی هێمنی و ئاسایش، و کاروباری میسری دایە دەست "عەبدوڵلای کوڕی تاهیر"، دواتر لە سەردەمی"خەلیفەمعتز"میسر درا بە"باباک بک" دوای ئەویش کوڕەزاکەی "ئەحمەدی کوڕی طوڵۆن" لە ساڵی (٢٥٤ک/ ٨٦٨ز) فەرمانڕەوایی میسری گرتە دەست، بەڵام لە ئەنجامی ململانێی نێوان قەرامیتەکان و طوڵۆنیەکان، دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا لاوازبوو،[2] فەرمانڕەوایی میسر بۆ ماوەی (٣٠) سی ساڵ

---

(١) . د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، جامعة الموصل، ص ٨١.

(٢) . نيكيتا ايليسيف: الشرق الاسلامى في العصر الوسيط، ترجمة: منصور ابوالحسن ، دار الكتاب الحديث، بيروت، ١٩٨٦،ص٣١٨.

به دەست خەلیفەی عەبباسیەوە بوو، لە هەمان کاتدا مەترسی فاطیمیهکان لە مەغریب پەرەی دەسەند، بۆیە خەلیفەی عەبباسی پێویستی بە بەر بەستێک هەبوو لە بەرامبەر فاطیمیهکان، بۆ ئەم کارەش "محمد کوری طغج"ی لە ساڵی(٣٢٣ک/ ٩٣٥ز)دیاریکرد کە نازناوی "الاخشید" بوو،[١] ئەم بنەماڵەیە لە خزمەتی خەلیفەی عەبباسیدا بوون، و توانیان تا هاتن و پەرەسەندنی دەسەلاتی فاطیمیەکان کە شیعە مەزهەب بوون و بەناوی "فاگیمە"ی کچی پێغەمبەر (د.خ) ناونرابوون فەرمانڕەوایی میسر بکەن، فاگیمیهکان لە ساڵانی (٢٦٧ک/ ٩٠٩ز تا ٥٦٧ک/ ١١٧١ز) واتە بۆ ماوەی سێ سەدە دەسەلاتدار و فەرمانڕەوای ناوچەکە بوون وخەریکی بانگەشەکردن بوون بۆ مەزهەبی شیعە،[٢] فاگیمیهکان لەپێناو پاراستنی سنوری میسر لە هێرشی عەبباسیەکان و خاچیەکان، هەوڵیان دەدا ولاتی شام داگیر بکەن، و بیکەنە سنوری سەربازی و بانگەشەی مەزهەبی شیعە،[٣] لەم کاتەدا بارێکی شێواو و پەرتبوون لە ولاتی شام ڕوویدا بوو، گەلێک میرنیشین لەلایەن فەرمانڕەوا عەرەبەکانەوە پەیدابوو بوون، سەلجوقیەکان بەشی باکووری شامیان بەرێوە دەبرد، و فاگیمیهکانیش حوکمڕانی بەشی باشووریان دەکرد، ئەم پەشێوی و دابەشبوونە، چاکترین هەل بوو بۆ بیزەنتیەکان بۆ ئەوەی هێرش بهێننە سەر ناوچە کەنارییەکانی ولاتی شام،[٤] خاچیەکانیش بە مەبەستی ئایینی و رامیاری و قازانجی ئابووری و پاراستنی ڕێگای بازرگانی نێوان ولاتانی ئەوروپا و ڕۆژهەلات بە تایبەت شاری ئەنتاکیا لەگەڵ ولاتی شام چاویان بڕیبووە ولاتی شام، هەروەها ئامانجێکی تریشیان ڕزگارکردنی خاکی پیرۆزی قودس بوو لە دەستی موسڵمانەکان کە شوێنی سەرهەڵدانی حەزرەتی مەسیح بوو،[٥] لەلایەکی ترەوە ولاتی شام تووشی هێرشی حەمدانیەکان ببوو کە پایتەختیان لە موصڵ بوو، و توانیان دوای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لە حەلەب لە ساڵی (٣٣٣ک/ ٩١٤ز) دەسەلاتی ئەخشیدیەکان بخەنە مەترسیەوە، هەروەها ئەم ولاتە جارێکی تر لە

---

(١) . نیکیتا ایلیسیف: م.ن،ص٣٢٠.

(٢) . نیکیتا ایلیسیف:م.ن، ص٣٢١- ٣٢٥.

(٣) . د. درید عبدالقادر نوري: سیاسة صلاح الدین الایوبي، بغداد، ١٩٧٦،ص٤٩.

(٤) . محمد حمدی المناوی: الوزارة والوزراء في العصر الفاطمي، القاهرة، ١٩٧٠،ص ١٨٧.

(٥) . د. خاشع المعاضیدي وأخرون: م.ن، ص١٢.

سەردەمی میر (ئەحمەد کوڕی ئەبی سەعید) لە ساڵی (٣٥٣-٣٥٧ک/٩٦٤-٩٦٧ز) تووشی هێرشی قەرامیتەکان هات و ئەخشیدیەکان نەیانتوانی بەرەنگاریان ببنەوە و شاری (رمله)یان داگیرکرد، بەم شێوەیە دەسەڵاتی قەرامیتەکان لە کۆتایی فەرمانڕەوایی ئەخشیدیەکان گەیشتە ناوچەی شام[1] ئەگەر سەرنج بدەین لەم ڕووداوانە تێبینی ئەوە دەکەین کە باروودۆخی شام لە کۆتایی دەسەڵاتی ئەخشیدیەکان ئاڵۆزو نائارام بووە، ئەمەش ببووە هۆی زەمینە خۆش کردن بۆ بانگەوازی فاگیمیهکان کە هێشتا لە وڵاتی مەغریب بوون،[2] کاتێک فاگیمیهکان لە وڵاتی میسر جێگیر بوون و قاهیرەیان کردە پایتەختی خۆیان، دواتر پێویستی ڕامیاری و سەربازی وای خواست کە هێرش بکەنە سەر وڵاتی شام لەبەر ئەو هۆیانەی کە پێشتر باسمان کرد،[3] سەرەڕای ئەم ڕووداوانە فاگیمیهکان نەیانتوانی هەموو وڵاتی شام کۆنترۆڵ بکەن، هەرچەندە توانیان شاری دیمەشق لە ساڵی (٣٥٩ک/ ٩٦٩ز) بە سەرکردایەتی"جەعفەری کوڕی فەلاح "داگیر بکەن، لەبەرئەوەی بەشی باکووری شام لە ژێر دەسەڵاتی حمدانیەکاندا بوو،[4] لە هەمان کاتدا فاگیمیهکانیش ڕووبەڕووی گەورەترین مەترسی بوونەوە ئەوانیش قەرامیتەکانی بەحرەین بوون، و ئامانجیان دەست بەسەراگرتنی هەموو ناوچەکانی وڵاتی شام بوو.[5] لە دوای داگیر کردنی دیمەشق لە لایەن فاگیمیهکان لە ساڵی (٣٥٩ک/ ٩٦٩ز) ململانێی نێوان قەرامیتەکانی بەحرەین و فاگیمیهکان دەستی پێکرد، بە نەدانی باجی "جزیە" لە لایەن فاگیمیهکانەوە بە قەرامیتەکان کە پێشتر لە ئەخشیدیەکانیان وەردەگرت و ساڵانە بڕی (٣٠٠) هەزار دینار بوو، وڵاتی شام لە قەرامیتەکان ڕزگاری بوو، و کەوتە ژێر فەرمانڕەوای فاگیمیهکان، لە ئەنجامی ئەم ڕووداوانەدا میری قەرامیتەکان "حەسەن کوڕی ئەحمەد" داوای یارمەتی و هاوکاری لە خەلیفەی عەبباسی و میری بوەیهی کرد لە دژی فاگیمیهکان، میری بوەیهیەکان بە پارە و چەک هاوکاری کرد، بەڵام خەلیفەی عەبباسی وەڵامی نەدایەوە، هەروەها میری

---

(١) . سيدة كاشف: مصر في عهد الاخشيدين،ص٨٦.

(٢) . المقريزي: الخطط،ج ٣/ص٤٢.

(٣) . د. خاشع المعاضيدى: الحياة السياسية في بلاد الشام خلال العصر الفاطمي، بغداد،١٩٧٥، ص٢٢.

(٤) . أبن ظافر: الدول المنقطعة ، ص٢٥.

(٥) . د. خاشع المعاضيدى: م.ن، ص٣٣.

بوەیهیەکـان "عزالـدولە بەختیـار" داوای لە حمـدانیەکانیش کـرد بە پـارە یـارمەتی قەرامیتەکـان بدەن، سـەرئەنجام توانیـان سـەرکەون بەسـەر سـوپای فاگیمیهکاندا و دیمەشـق داگیـر بـکەن، بەمەش توانیـان گوتـاری هەینـی بـۆ خەلـیفەی عەبباسـی بگێـڕنەوە لە جیـاتی فاگیمیهکـان.[1] قەرامیتەکـان بەم سـەرکەوتنە قایـل نەبـوون و بڕیـاری هێرشـی سـەر میسریان دا، کە لە ئەنجامدا قەرامیتەکان تێکشکان، ئەمەش بـووە هـۆی لە دەسـتدانی وڵاتـی شـام لە سـاڵی (٣٦١ک/ ٩٧١ز)دا. بەڵام بەهـۆی دروسـت بـوونی کێشـە لە نێوان دانیشـتوانی دیمەشـق و سـەربازەکانی خەلـیفەی فاگمی کە مەغریبی بوون بارودۆخی ڕامیاری فاگیمیهکان لە شام جێگیر نەبوو،[2] لە ئەنجـامی ئەم کێشـەیەش دەسـەڵاتی فاگیمیهکـان لاواز بـوو، ئەمەش دەرفەتـی ڕەخسـاند بـۆ "افتکین" کە فەرمانـدەیەکی تـورک بـوو لە شـاری بەغـداد و ڕۆڵێکـی گەورەی هەبـوو لە دژایەتـی کردنـی فاگیمیهکـان، "افتکـین" تـوانی بە ژمـارەیەک سەربازی کەمەوە ڕوو بکاتە شـاری دیمەشـق و لە سـاڵی (٣٦٤ک/ ٩٧٤ز) داگیـری بکـات، لە هەمـان کاتـدا "جەوهەری صـقلی"یش بە سـوپایەکی گەورەوە ڕووی کـردە شاری دیمەشق و بەرەنگاری یەک بوونەوە، لێرەدا گەمارۆی سـەر "افتکین" پەرەی سـەند، ئەمەش ناچـاری کـرد پەیوەنـدی بکـات بە قەرامیتەکـانی بەحـرەینەوە بـۆ بەدەسـت هێنـانی هاوکـاری دژی "جـوهەر"، لە ئەنجـامی ئەم ڕووداوانەدا "جـوهەری صـقلی" داوای ڕێککەوتنـی لەگەڵ کـردن و خەلـیفەی فـاگیمی لەم ڕووداوانە ئاگـادار کـردەوە، بەڵام خەلـیفەی فـاگیمی بە ڕێککەوتـنە قایـل نەبـوو، خـۆی بە سـوپایەکی گەورەوە هێرشی هێنایە سەر وڵاتی شام و توانی بزووتنەوەی (افتکینـی تـورکی) و قەرامیتەکان لەناو ببات و دووبارە دەسەڵات وەربگرێتەوە لە شام.[3]

لەلایەکی ترەوە میرە عەرەبەکانی شام دژی فاگیمیهکان وەستانەوە لەوانە (بنو الجراح) لە فەلەستین کە بنەماڵەیەکی عەرەبی سەر بە هۆزی (گی الیمانیە) بوون و لەگەڵ قەرامیتەکـان ڕێککەوتـن لە سـاڵانی (٣٦١ک/ ٩٧١ز) و (٣٦٣ک/ ٩٧٣ز)دا[4]بە

---

(١) . أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، تحقيق: أمدروز، القاهرة،١٩٠٨،ص١.

(٢) . أبو شجاع: ذيل تجارب الأمم، ص٣٢٤؛ أبن القلانسي: م.ن، ص١١.

(٣). أبن القلانسي: م.ن، ص١٦- ١٨- ٢٠؛ أبن خلدون: العبر وديوان المبتدأ و الخبر ومن عاصرهم من ذوى السلطان الأكبر،بيروت،١٩٦١،ج ٤/ص ١٠٨.

(٤) . أبن بدران: تهذيب تأريخ أبن عساكر، ص٣٤؛ النويرى: نهاية الارب، ج١٨/ص ٧٦.

هاوبەشی هێرش ببەنە سەر خاکی میسر، لە ڕاستیدا فاگیمیهکانیش هەستیان بە کاریگەری و گرنگی ئەم هۆزە دەکرد، بۆیە هەوڵی جیدیان دەدا بۆ ئەوەی بیانکەنە هاوپەیمانی خۆیان لە دژی قەرامیتەکان، دواتر لەگەڵ فاگیمیهکاندا ڕێککەوتن بە مەرجێک مەزهەبی شیعە وەرنەگرن، ئەم هۆزە لە ساڵی (٣٧٠ک/٩٨٠ز) هەوڵیاندا دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان لە فەلەستین دوور لە فاگیمیهکان دامەزرێنن، بەڵام ئەم هەوڵەیان بێ ئەنجام بوو تا لە ساڵی (٤٢٢ک/ ١٠٣٠ز) کۆتایان پێ هات،[1] "بنو مرداس" هۆزێکی تری عەرەبی بوون لە بەنی کلاب، ئەمانیش بوونە کۆسپ لە بەردەم فاگیمیهکاندا لە باکووری وڵاتی شام،[2] پاشان هۆزێکی عەرەبی تر کە بە (بنو عەقیل) ناسرا بوون سەریان هەڵدا و توانیان شاری موصل و جەزیرە داگیر بکەن.

بە تێکچوونی بارودۆخی ڕامیاری حەلەب و باکووری شام بەهۆی ململانێی میرنیشینە عەرەبیەکان و خەلیفەی فاگیمی،[3] سەلجوقیەکان[4] لەسەر گۆڕەپانی سیاسی سەریان هەڵدا، ئەویش بەدەست پێکردنی هێرشەکانیان و دواتر جێگیر بوونیان لە خیلافەتی عەبباسی دا، هاتنی سەلجوقیەکان فاکتەرێکی گرنگی لاوازبوونی فاگیمیهکان بوو لە بەرامبەر هێرشی خاچیەکان، سەلجوقیەکان هەر لە سەرەتاوە هەوڵیان دەدا بۆ گێڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکانی خیلافەتی عەبباسی،[5] و سیاسەتیشیان بە گشتی لەم ناوچەیەدا داگیرکردن و تاڵان و کاولکاری بوو، بە هاتنی سەلجوقیەکان بارودۆخی ڕامیاری ناوچەکە زیاتر ئاڵۆز بوو، ئەمەش بووبە هۆی ڕەخساندنی دەرفەت بۆ هێرشی خاچیەکان بۆ سەر ناوچە کەناریەکانی وڵاتی شام، کوشتنی تاج دەوڵە(تتش)ی سەلجوقی لە ساڵی (٤٨٨ک/١٠٩٥ز) بە دەستی برازاکەی (برکیاروق) سەرەتای لەناوچوونی سەلجوقیەکان بوو لە وڵاتی شام، بەردەوامی ململانێی نێوان سەلجوقیەکان و فاگیمیهکان لەسەر دیمەشق

---

(١) .مسكويه: تجارب الأمم، ص٤٠٢؛ امينة البيطار: امراء الدين بالشام،ص٦٦.

(٢) .أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٩/ ص٢١٠- ٢١١؛ أبن خلدون: هـ- س، ج٤/ص٥٨.

(٣) . أبن القلانسي: م،ن، ص٧٣- ٧٤؛ أبن العديم: تأريخ حلب، ج١/ ص٢٣٨- ٢٣٩.

(٤) . سەلجوقی: هۆزەیەکە لە تورکەکان لە پشتی ڕووباری نزیک (بخاری) دەژیان و ناویان لە پیرە گەورەیان وەرگیراوە کە "سلجوق" بوو و بیوونە موسڵمان وە خۆیان بە پارێزەری مەزهەبی سنی دادەنا و لە سەردەمی طغرلبک دەسەڵاتی سەربەخۆیان وەرگرت، (أبن تغری البردی: النجوم الزاهرة).

(٥) . أبن القلانسي: م،ن،ص٩٨؛ ابن العديم: هـ- س، ج٢/ص٢٣.

هۆکـاری سـەرەکی لاواز بـوونی بەرەی ئیسـلامی بـوو لە بەرامـبەر هێرشـی خاچپەکاندا بۆ سەر وڵاتی شام.[1]

## دروستبوونی بەرەی ئیسلامی دژ بە خاچپەکان

لە سـەرەتای سـەدەی (٥ک/ ١١ز)دا جیهـانی ئیسـلامی ڕووبەڕووی شـاڵاوی خاچپەکـان بـوویەوە، کە ئامانجیـان داگیرکردنـی ڕۆژهەڵات و دەستبەسـەرداگرتنی ئابووری ناوچەکە بوو، ئەم ڕاستیە لە شاڵاوی یەکەمی خاچپەکاندا بەدی دەکرێت کە خـۆی لە دامەزرانـدنی چـوار میرنشـینی خـاچی لە نـاوجەرگەی ڕۆژهەڵاتـی ئیسلامیدا دەبینیەوە، سەرەتا موسڵمانەکان هەستیان بە مەترسی ئەم میرنیشینانانە و هـاتنی خاچپەکـان نەدەکـرد، دواتـر هەوڵیانـدەدا بەرەنگاریـان ببـنەوە، بەڵام هەوڵەکانیـان لە بەرامـبەر ئەم شـاڵاوە گەورەیەدا بـێ سـوود بـوو، سـەرئەنجام موسـڵمانان بە بەهێزکردنـی بەرەی نـاوخۆ و بەرەنگـاربوونەوەی داگیـرکەران بە درێژایی سەدەی (٥)ی کۆچی و نیوەی سەدەی (٦ک/١٢ز)توانیان خاکی وڵاتەکەیان لە دەسـتی خاچپەکـان ڕزگـار بـکەن،[2] لە ڕاسـتیدا یەکەم هەوڵـی موسـڵمانان دژ بە خاچپەکـان لە سـاڵی (٤٩٠ک/ ١٠٩٦ز)دابـوو کاتێـک موسـڵمانە تورکەکـان توانییـان "بگرس الناسک"،[3] دەربکەن کە بـانگەواز و پێشـبینی دەکرد بۆ هەڵگیرسـانی شـەڕی خاچپەکان، ئاواتی پاپا ئەوە بوو خاچپەکان بە سەلامەتی بگەنە شـاری قوسـتەنتینیە تا گەیشتنی سوپای نیزامی و فەرماندەکان و هەموو بە یەکەوە شـەڕی موسـڵمانان بکەن بۆ ڕزگارکردنی شاری قودس لە دەستی موسڵمانان.[4]

لە کۆتـایی سـاڵی (٤٩٠ک/ ١٠٩٦ز)دا خاچپەکان خۆیان بۆ هەڵمەتێکی گەورە بە فەرمانـدەیی "بگـر الناسـک و والتـر المفلـس" ڕێکدەخسـت ئەم هەڵـمەتە لە چینـی "خـانەدان، دەرەبەگ، جوتیـار، ڕێگـر،و دانیشـتوانی شـارە بچووکەکـان کە ژن و منالیشـیان لەگەڵ خۆیـان هێنـابوو، پێکهـاتبوو، ئەمـانە هەسـتی ئـایینی، و ئومێـدی

---

(١) . بڕوانە أبـن میسـر: أخبـار مصـر، ص٣٧- ٣٨؛ د. خاشـع المعاضـیدي: الاحـوال السیاسـیة فـي بـلاد الشام،ص١٠٧.

(٢) . رنسیمان: الحروب الصلیبیة، ج١/ ص١٦٩- ١٧٢.

(٣) . هەروەها ناوی "الصغیر یان شتو یان کیوکیو یان الزاهد"

(٤) . رنسیمان: م.ن،ص١٧٢.

گەیشتن بە ڕۆژهەلاتِ و دەستکەوتنی ئەو بەهەشتەی کە لە پێناویدا هاتبون کۆی کردنەوە، خاچیەکان لە کاتی هاتنیان بۆ ئاسیای بچووک هەموو شار و گوند و کیلگەو ڕەزەباخ و ئاژەلی دانیشتوانی ناوچەکەیان تالان و وێران دەکرد، بە تایبەت هوروبەری شاری نیقیەی پایتەختی سەلجوقیەکان لە سەردەمی "قلیج ئەرسلان"دا، ئەو کاتەدا تیپێک لە موسلمانەکان چوو بۆ شەڕی خاچیەکان، لەئەنجامدا خاچیەکان هەلهاتن بۆ قەلای (اکسیریگوردن)، موسلمانان سەرچاوەی ئاوی شارەکەیان گرت و وەک چەکێکی دەروونی بەکاریان هێنا، و ناچاریان کردن دوای هەشت ڕۆژ دەرگای قەلاکە بکەنەوە بۆ موسلمانان بە مەرجێک ژیانیان پارێزراوبێت، بەمەش سەرجەمیان بەدیل گیران و ڕاگوێزکران بۆ شارەکانی (حەلەب و ئەنتاکیا و خوراسان)،[1]خاچیەکان لە ئەنجامی تێکشکاندنیان لە قەلای (اکسیریگوردون) بڕیاری کۆبوونەوەیان دا و چاوەڕێ بوون "بگرس الناسک" بگاتە لایان، لەو کاتەدا سوپای موسلمانان لە سەربازگەی (کیفیتون) لە نزیک قەلای (اکسیریگوردن) خۆیان حەشاردا بوو،[2] خاچیەکان پێش گەیشتنی "بگرس الناسک" و بە بڕیارێکی هەلەی "جفری بوریل" هێرشیان بردە سەر موسلمانان، لەم هێرشەدا ژمارەی خاچیەکان (٢٠) هەزار دەبوو، موسلمانانەکان لە نزیک گوندی"دراکون" بۆسەیان بۆ دانان، خاچیەکان لەبەر زۆری ژمارەیان و قەرەباڵغی و نەبوونی سەکردایەتیەکی یەکگرتوو کەوتنە ناو بۆسەی موسلمانان و بە شێوەیەکی زۆر خراپ شکان و ژمارەیەکی بێ شوماریان لێ کوژرا، لەوانە " والتر المفلس ورینالد برایس وقولک اورلیان " تەنها " جفری بوریل " ڕزگاری بوو کە تاوانباری سەرەکی بوو لە شکستی گەورەی خاچیەکان بە دەستی موسلمانەکان.[3]

بیزەنتەکان بۆ ڕزگارکردنی برا خاچیەکانیان هیچیان پێ نەکرا، هەر چەندە ئیمپراتۆر "ارکسیوس" بڕیاریدا بە گواستنەوەی هێزێکی گەورە لە سەربازەکانی لە ڕێگای کەشتیگەلی جەنگیەوە، بەلام ڕووبەڕووی کۆمەلێک ڕێکخستنی سەربازی

---

(١) . رنسیمان: م.ن،ص١٨٩.

(٢) . د. خاشع المعاضيدي واخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص٧٠.

(٣) . رنسيمان: م.ن،ص١٩١.

ئیسلامی بوونەوە، ئەوەش بووبە کۆسپێک لە بەردەم هەڵگیرسانی شەڕی نێوانیان.[1]

شالاوی خاچپەکان بەرەو ولاتی شام لە پەرەسەندندا بوو، لە هەمان کاتدا موسڵمانان بۆ دروستکردنی بەرەیەکی ئیسلامی بۆ ڕزگارکردنی شاری ئەنتاکیا لە دەستی خاچپەکان کۆبوونەوە،[2] سوپای موسڵمانان لە "مرج دابق" بە مەبەستی ڕزگار کردنی شاری ئەنتاکیا بە ڕێگای ڕووباری "عاص" کەوتنە ڕێ و لە سەرەتای جوڵانەوەکەیاندا تووشی هێزێکی بچووکی خاچپەکان هاتن و توانییان لە ناویان بەرن، لە دوای ئەم ڕووداوە سوپای سەلجوقیەکانی ئاسیای بچووک پەیوەندییان کرد بەم هاوپەیمانیەتیەی موسڵمانانەوەو توانییان گەمارۆی شاری ئەنتاکیا بدەن و نەهێڵن بە هیچ شێوەیەک خواردەمەنییان بۆ بڕوات، ئەمەشیان وەک چەکێکی دەروونی دژ بە خاچپەکان بەکارهێنا، ماوەی گەمارۆکە (٣) سێ هەفتەی خایاند، بارودۆخی خاچپەکان ڕووی لە خراپی دەکرد ناچار فەرماندەکانیان بە نهێنی و لە ڕێگای "بەندەری سویدی"یەوە هەڵدەهاتن، لەم بارودۆخەدا خاچپەکان تووشی بارێکی دەروونی واهاتن لە هاتنیان لە ئەوروپاوە بۆ ڕۆژهەلات بە مەبەستی ڕزگارکردنی شوێنە پیرۆزەکان پەشیمان بوونەوە،[3] ئەوەی زیاتر بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو، سەرەڕای ئەوەی ئیمپراتۆر "الکسیوس کومنین" بە سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە بۆ یارمەتی دانی خاچپەکان کەوتەڕێ، بەڵام دواتر لە ترسی هێرشی سەلجوقیەکان لە هەڵمەتەکەی پەشیمان بوویەوە، ئەم هەڵوێستەی ئیمپراتۆر بووبە هۆی مەترسیەکی گەورە بۆ سەر خاچپەکان، لەساڵی (٤٩٢ك/ ١٠٩٩ز)دا خاچپەکان بە مەبەستی گرتنی "بەیت ولمەقدیس" گەیشتنە شاری "صیدا"، بەڵام بەرگری کارانی شارەکە توانییان شارەکەیان لە بەرامبەر هێرشی خاچپەکاندا ڕزگاربکەن، خاچپەکان دوای ئەوەی کێڵگە و ڕەزەباخەکانیان تاڵان کرد، لە ترسی موسڵمانەکان هەڵهاتن بۆ ناوچەکانی نزیک شاری صور،[4] لە هەمان ساڵدا خاچپەکان لە شاری (رملە) نزیک بوونەوە، موسڵمانان "کڵێسای قدیس جورجی گەورە"یان ڕووخاند، خاچپەکان وایاندەزانی ڕێگاوبان و شارەکان چۆڵن

---

(١) . رنسيمان: م.ن.ص٢٤٩.

(٢) . أبن العديم: زبدة الحلب، ج٢/ ص١٣.

(٣) . د. سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصليبية،ج ١/ ص٢٠١.

(٤) . رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ج١/ ص٣٨٩.

ـ کەسیان لێ نیە، بۆیە لە کاتی هاتنیاندا کەوتنە بۆسەی موسڵمانان، ئەمە بووبە هۆی کوژران و بەدیلگیرانی ژمارەیەکی زۆریان،[1] لە ئەنجامی بەرگری کردنی موسڵمانان زۆر لە خاچیەکان ناوچەکانیان بەرەو شاری یافا بەجێهێشت، بە هیوای گەڕانەوە بۆ ئەوروپا بە بەلەم یاخود کەشتی.

لە سەرەتای ساڵی (٤٩٣ک/ ١٠٩٩ز)دا هەواڵێک لە ناو سەربازگەی خاچیەکاندا بڵاوبوویەوە کە دەیوت سوپایەکی گەورەی موسڵمانەکان لە میسرەوە بەڕێوەیە بۆ ڕزگارکردنی بەیت ولمەقدیس، بەمەش ترس چووە ناو دڵ و دەروونی سەرکردە و فەرماندەکانی خاچیەکان و توشی بێهیوایی بوون ولە ترسی موسڵمانەکان هەڵدەهاتن، ئەمەش کاریگەری دەروونی ترسناکی لەسەر سەربازەکان دروستکرد،[2] لەو بارودۆخە پشێو و نائارامەی خاچیەکاندا (٦) شەش بەلەمیان کە لە(عصلان)ەوە بە تەنیشت شاری رملەدا هاتبوون کەوتە بۆسەی تیپێکی موسڵمانانەکانەوە، دوو بەلەمیان فەڕەنسی بوون بە سەرکردایەتی (ادیاکو)، چوار بەلەمەکەی تریان ئینگلیزی بوون، ئەم بەلەمانە کە خواردەمەنی و چەک و پەت و بزمار و کەرەستەی گەمارۆیان هەڵگرتبوو لەلایەن موسڵمانەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرا، لە هەمان کاتدا کەشتیگەلی میسری لە کەنارەکانەوە سەریهەڵدا و توانی گەمارۆ بخاتە سەر شاری رملە، خاچیەکان بارودۆخیان تێکچوو و ئازار و ناڕەحەتی زۆریان چەشت، گەرمی کەش و هەوای ناوچەکە و کەمی ئاو کە بەشی ئەو هەموو ئاژەڵەی نەدەکرد کە بە تاڵانی هێنابوویان، لەگەڵ زۆر بوونی بۆسە و هێرشی تیپە ئیسلامیەکان و دروستبوونی ململانێی نێوان خودی سەرکردە خاچیەکان، بوون بەهۆی ئەوەی هەندێک لە سەربازە خاچیەکان بۆ ڕزگارکردنی خۆیان لە مردنێکی چاوەڕوان کراو بە دەستی سوپای موسڵمانەکان وازبێنن لە ئایینی مەسیحی.

لە ساڵی (٤٩٤ک/ ١١٠٠ز) بەپرسی دیمەشق توانی دەست بگرێت بەسەر کۆتا سوپای خاچیەکاندا کە خەریکی تاڵان و وێرانکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئوردن و جۆلان بوون،[3] مێژوونووس (ئیبن قلانسی) دەڵێت: لە ساڵی (٤٩٨ک/ ١١٠٤ز) بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی دژ بە خاچیەکان دروستبوو، کاتێک خاچیەکان

---

(١) . د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە،ص٧٨.

(٢) . رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبيه،ج ١/ ص٤٠٠.

(٣) . رنسيمان: هەمان سەرچاوە،ص ٤٣٨.

هێرشیان بردە سەر تەرابلس، "فخر الملک بن عمار" بەرپرسی تەرابلس داوای یارمەتی لێکردن، بەرەی ئیسلامی کە لە بەرپرسی (ماردین و موسڵ و حەلەب) پێکهاتبوو هاوکارییان پێشکەش کرد و خاچیەکان ئەم شەڕەیان دۆڕاند،[1] لە ساڵی (٤٩٩ک/ ١١٠٥ز)دا خاچیەکان لە ترسی هێرشی موسڵمانەکان پێگەیەکی بە هێزیان بۆ خۆیان دروستکرد، بەڵام هەوڵەکانیان لە بەرامبەر پەلاماری موسڵماناندا بێ ئەنجام بوو، هەروەها لە ساڵی (٥٠٠ک/ ١١٠٦ز) خاچیەکان کەوتنەوە بەر هێرشی موسڵمانەکان لە "گبریە وعەککا".[2]

لە ساڵانی (٥٠٢- ٥٠٧ک/ ١١٠٨- ١١١٣ز) میر (مودواین انشتکین)ی موسڵ بە مەبەستی ڕزگارکردنی "بەیت ولمەقدیس" کە لە لایەن خیلافەتی عەبباسی و دەسەڵاتی سەلجوقیەوە داوای لێکرابوو، بە هاوکاری "گفتکین"ی میری حەلەب و "ابلغازی بن ارتق" میری ناوچەی جەزیرە،[3] پەلاماری ناوچەکانی ڕەهاو ئەنتاکیەی دا، هەرچەندە لە ساڵی (٥٠٩ک/ ١١١٥ز)دا هەندێ لە تیپە خاچیەکان هێرشیان بردە سەر شاری (رفینە) و توانییان داگیری بکەن، بەڵام "ڤهیر الدین"ی بەرپرسی دیمەشق دوای کوشتارێکی زۆر لە خاچیەکان و دەسکەوتێکی مادی چاک و گواستنەوەی دیلەکان بۆ دیمەشق توانی ڕزگاری بکاتەوە،[4] مێژوونووس (ئیبن قلانسی) سەبارەت بە هەوڵ و چالاکی موسڵمانان دژ بە خاچیەکان دەڵێ: کاتێک خاچیەکان سوپایان کۆکردەوە بۆ داگیرکردن و تێکدان و تاڵانکردنی ناوچەی بیقاع، هەردوو سوپای (موسڵ و دیمەشق) پێکەوە هێرشیان بردەسەر خاچیەکان و زیانێکی زۆریان لێدان، بە شێوەیەک خاچیەکان هەڵهاتن و هەموو شتێکیان بەجێهێشت،[5] لە ساڵی (٥١٢ک/ ١١١٨ز)دا خاچیەکان جارێکی دی خۆیان بۆ شەڕی موسڵمانەکان ئامادەکرد و بەرەو پێگە و قەڵا و شارەکان چوون، بەرپرسی دیمەشق داوای لە هاوپەیمانانی کرد لە بەرامبەر هێرشی خاچیەکاندا هاوکاری بکەن.[6]

---

(١) . ذیل تأریخ دمشق: ص١٤٦- ١٤٨.

(٢) . هەمان سەرچاوە،ص١٥١.

(٣) . د. عبدالقادر الیوسف: علاقات بین الشرق والغرب، ص٩٤.

(٤) . أبن القلانسي: ذیل تأریخ دمشق، ص١٩٢.

(٥) . أبن القلانسي: هەمان سەرچاوە، ص١٩٧.

(٦) . أبن القلانسي: هەمان سەرچاوە،ص ٢٠٠.

هەروەها لە ساڵی (٥١٣ك/ ١١١٩ز)دا خاچیەكان سوپایەكی گەورەیان ئامادەكرد كە ژمارەی سەربازانی نزیكەی (٢٠) هەزار سوارەو پیادە دەبوو، ئەمانە زۆر بە چاكی خۆیان بۆ شەڕ كردن لەگەڵ موسڵماناندا ئامادە كرد بوو، موسڵمانان لە هەموو لایەكەوە گەمارۆیان دان و كەوتنە لێدانیان بە تیر و شمشێر، هێندەی نەخایاند موسڵمانان سەركەوتنێكی گەورەیان بەدەستهێنا، بەجۆرێک هەندێ لە مێژوونوسان دەڵێن " چاكترین و گەورەترین سەركەوتنی موسڵمانەكان بوو".[1] هەروەها هێرشی خاچیەكان لە ساڵی (٥١٨ك/ ١١٢٤ز)دا بۆ سەر شاری حەلەب بەهۆی لێهاتوویی میر "سیف الدین البرسقی" بەرپرسی موسڵ تێكشكا،[2] مەترسی و هێرشی خاچیەكان بۆ سەر وڵاتانی شام و فەلەستین و جەزیرە تا ساڵی (٥١٩ك/ ١١٢٥ز) درێژەی كێشا، و هەوڵی موسڵمانەكانیش بۆ بەرگری كردن دژ بە خاچیەكان بەردەوام بوو،ئەمە بووبە هۆی بوژاندنەوەی هەستی موسڵمانان بە تایبەت لە سەردەمی "عیمادەدین زەنگی و نورەدین مەحمود و سەلاحەددین ئەیوبی" دا كە توانییان ئەم مەترسیە گەورەیە لە ناوچەكە دووربخەنەوە و لە هەمان كاتدا قەڵا و میرنیشینی خاچیەكانیش بگرن و گەورەترین بەرەی ئیسلامی دژ بە خاچیەكان دروستبكەن.[3]

## ڕۆڵی عیمادەدین زەنگی لە پێكهاتنی بەرەی ئیسلامیدا

پەرەسەندنی مەترسی خاچیەكان لە وڵاتی شام و جەزیرە بارودۆخێكی وای ڕەخساند، كە جیهانی ئیسلامی لە ناوچەكەدا پێویستی بە بەرەیەكی ئیسلامی یەكگرتوو هەبێت بۆ بەرەنگار بوونەوەی خاچیەكان، كە هەموو جیهانی ئیسلامیان خستبووە مەترسیەوە بە تایبەت لە سەرەتای سەدەی (٦ك/ ١٢ز)دا، پرۆژەی ئەم هاوپەیمانیەتیە دەگەڕێتەوە بۆ "عمادەدین زەنگی" میری موسڵ،[4] كە دەست پێشخەر بوو لە دروستكردنی بەرەی ئیسلامی یەكگرتوودا، لە ڕێگای كۆكردنەوەی

---

(١) . أبن القلانسي: م.ن.ص ٢٠١.

(٢) . أبن القلانسي: م.ن.ص ٢١١.

(٣) . أبن القلانسي: م.ن.ص ٢١٢.

(٤) . د. الباز العريني: مصر في عصر الايوبين، ط١، بيروت، ١٩٦٠، ص١٩.

هێزی موسڵمانان بۆ ئامادەکردنی هێزی سەربازی دژ بە خاچپیەکان،[1] عیمادەدین زەنگی حوکمڕانی ناوچەکانی (حەلەب و حەران و موسڵ)ی دەکرد، و لە ناوچەی موسڵ (دەوڵەتی زەنگی)[2] دامەزراند، ناوچەکانی (جەزیرەی ئیبن عومەر[3] و نصیبین[4] و سنجاری[5]) ڕزگار کرد و دواتر دەستی بەسەر (حەڕاندا) گرت و بەرەو شاری (ڕەها) بەڕێکەوت، بەڵام دوای ئەوەی زانی بارودۆخەکە بۆ شەڕ کردن گونجا و نیە ڕای گۆڕی و لە ڕووباری فورات پەڕییەوە بۆ شاری حەلەب و شارەکانی دیکەی وڵاتی شام، چونکە شاری ڕەها ببووبە بەشێک لە هاوپەیمانێتی نێوان فەرەنجیەکان و بیزەنتەکان.[6]

عیمادەدین زەنگی لە ماوەی هاتنی بۆ وڵاتی شام توانی گەمارۆی شاری دیمەشق بدات، بەڵام بێ ئەنجام بوو، چونکە خاچپیەکانی بەیت ولمەقدیس بۆ ڕزگاربوون لە مەترسی گەورەی بەرەی ئیسلامی کە عیمادەدین زەنگی سەرکردایەتی دەکرد هاریکاری یەکتر بوون.[7]

لە ناوچەکەدا چەند میرنشینێکی ئیسلامی لاواز هەبوون کە سەرکردایەتیەکی یەکگرتوویان نەبوو بۆ سەرپەرشتی کردن و یەکخستنی دەنگ و هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر بە خاچپیەکان، بۆیە عیمادەدین زەنگی بە لێهاتووی خۆی توانی لەو بارودۆخە ناسک و ناتەبایەی نێوان موسڵماناندا دوو هەنگاوی گەورە بنێت:

یەکەم- دروستکردنی بەرەیەکی ئیسلامی بە کۆکردنەوەی هێزە ئیسلامیەکان و سەرکردایەتی کردنی.

دووەم- لێدانی خاچپیەکان.

---

(١) . د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص٧٢.

(٢) . زەنگیەکان: دەگەڕێنەوە سەر (زنكى بن اق سنقر بن عبدالله بن الترغان) لەهۆزی "ساب یو"، ناوبانگیان دەگەڕێتەوە بۆ باوکیان کەبە (قسيم الدوله) ناسرابوو، پیشەی (دەرگاوان – الحاجب) بوو لای سوڵتان (ملكشاه ی سلجوقی) هاوکات ڕۆڵی کاریگەری لەسەر ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکانی دەوڵەتی سلجوقی هەبووە لەو سەردەمەدا. (ابن الاثير: الباهر، ل٤؛ خليل: عمادالدين زنكى، ل٣١؛ زامباور: معجم الانساب والاسرات الحاكمة فى التأريخ الاسلامي، ترجمة: زكى محمدحسن واخرون، ج١/ ل١١٥).

(٣) . شارێکە لە سەرووی موسڵ (٣ ڕۆژ ڕێگانێوانیانە)، (ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢/ص١٣٨).

(٤) . شارێکە لە سەرووی جەزیرە لە نێوان موسڵ و شام، (ياقوت الحموي: م- ن، ج٢/ ص٢٨٨).

(٥) . لە شارەکانی جەزیرە (٣ ڕۆژ) ڕێگایە لەگەڵ موسڵ لە قورگی شاخەکانە، (ياقوت، م- ن ،ج ٣/ص ٢٦٤).

(٦) . د. علية الجنزوري: امارة الرها الصليبية، مطابع سجل العرب، القاهرة، ١٩٧٥، ص١٥٧.

(٧) . د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص٧١.

بەمەش "عیمــادەدین زەنگــی" یەکەم ســەرکردەی موســڵمانان بــوو کە تــوانی بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی دروست بکات وبەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو بەرەو ڕووی مەترســی خاچیەکــان ببێــتەوە، پێشــتر هەوڵەکــانی "مــودود التــونتکین(٥٠٢-٥١٠ک) و "الغـازی الارتقـی(٥١٢- ٥١٨ک) و "اق سـنقر البرسـقی(٥١٨- ٥٢٠ک)"[1] لە پێناوی دروستبوونی بەرەیەکی ئیسلامی و جێگیر بوونی شکستیان هێنا بوو، بۆیە عمادەدین زەنگی هێزی سەربازی بەکارهێنا لە دژی میرەکانی جیهانی ئیسلامی کە لەگەڵ خاچیەکان دەستیان تێکەڵ کردبوو یان ئەوانەی بێ لایەن بوون، ئەمەش بۆ دروستکردنی هاوپەیمـانیەکی بەرگریکـاری، عیمـادەدین زەنگی بۆ سـەرکەوتنی ئەم پرۆژەیە، بیری لەوە دەکردەوە چۆن مەترسی و هێرش و پەلامـاری خاچیەکان کەم بکاتەوە، سەرئەنجام بەرنامە و پلانی دانا بۆ هێرش بردنەسـەر خاچیەکان لە وڵاتـی شام و جەزیرە.

شــاری حەلەب گرنگیەکــی تــایبەتی هەبــوو لەلای موســڵمانەکان و خاچیەکــان، لەبەرئەوەی سەنتەری سیاسی ناوچەکە بوو، لە هەمان کاتدا هەڵکەوتێکی سەربازی و ســتراتیژی هەبــوو، ئەمە ســەرەڕای ناوبــانگی شــارەکە لە بــوونی ســەروەت و ساماندا، بۆیە عیمادەدین زەنگی پلانێکی ڕێک وپێکی دانـا بۆ دەست بەسـەراگرتنی حەلەب و دەوروبەری تـا ببێتە نـاوجەرگی دەوڵەتـی ئیسـلامی و تـوانی بیخـاتە ژێر رکێفـی خـۆی، هەروەهـا لەسـالانی (٥٢٣-٥٤٠ک/١١٢٨-١١٤٥ز) تـوانی هاوپەیمـانی نێوان ئەرتەقیەکـان و خاچیەکـان تێک بـدات، لە هەمـان کاتـدا شـاری "نصـیبین"ی کردە بنکەیەکی سەربازی لە ناوچەکەدا بۆ هێرشبردنە سەر خاچیەکـان،[2] هەروەهـا هەوڵیدا دەسەلاتی "بەنی ارتق" بڕوخێنێت، چونکە کۆسپ بوو لەبەردەم یەکبوونی نـاوچەی موسـڵ و جەزیـرە و بـاکووری شـامدا، تـوانی هەنـدێ شـار و پـێگەی سەربازیان داگیر بکات، (عیمادەدین زەنگی) هەوڵی دا شاری دیمەشق داگیر بکـات، بەڵام میری شاری دیمەشق "مـوعینەدین افر" هاوپەیمانی لەگەڵ خاچیەکـان بەسـت، بەوەش ئـاوات و خەونـی عیمـادەدین زەنگـی نەهـاتەدی کە ئامـانجی فراوانکردنـی سنووری دەسەلاتی ڕامیاری و سەربازی و ئابووری بوو لە دژی خاچیەکان.[3]

---

(١) . د. عماد الدين خليل: عماد الدين زنكي، ط١، الدار العلمية، بيروت، ١٩٧١، ص١٦٦.

(٢) . د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە،ص ٧٤.

(٣) . د. عماد الدين خليل: هەمان سەرچاوە،ص ٩٨- ١٣٨.

سـەلجوقی لە شـەڕێکی زۆر بە هێـزدا بـوو، تیایـدا سـەلجووقیەکان تێکشـان و خاچیەکان دەسکەوتی چاکیان بەرکەوت، هەروەها بەرەو باشوور بەڕێکەوتن بێ ئەوەی لەلایەن سـەلجووقیەکان هـیچ بەرگریەکیـان تـووش بێـت تـا گەیشـتنە دەشـتەکانی (قـونیە)[1] کە زۆر بەپیـت و بەرەکەت بـوو، لەبەرئەوەی لەو کـاتەدا هێزەکانی سـەلجوقی لە بەرامبەریان کشابوونەوە و دەرفەتیان بۆ ڕەخساندن بۆ داگیرکردنـی شـاری (هـرقلە)، لەویێ بوونە دوو تیپ، یەکەمیان بە فەرماندەیی میر (بلدوین) و میر (تنکرد) بوو ئاڕاستەکەیان ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئەسیای بچووک تـا (کیلیکـیە و گرسـوس) بـوو، بەلام تیپـی دووەم کە لە زۆربەی هەرە زۆری خاچیەکان پێکهاتبوو لە سەرووی هەموویانەوە نوێنەری پاپا و میر (جودفری و بوهمینـد و ریمون)بـوون ئاڕاسـتەکەیان بەرەو (ئەنتاکیـا) بوو،(بلـدوین) و تیپەکەی ڕێگـای ڕۆژهەلاتیـان گـرت بە مەبەسـتی داگیرکردنـی شـاری(رەها)، زۆربەی خاچیەکان ڕوویانکردە شاری ئەنتاکیا کە لە کۆتـایی مـانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (٤٩١ك/ ١٠٩٧ز) ببـووە جێگـای سـەرەکیان کە لەلایەن میـر (یـانجی سـبان)ەوە فەرمانڕەوایی دەکرا کە لە سەلجووقیەکانی عێراق و شام بوو،[2] خاچیەکان دوای سەرکەوتنیان و دەست بەسەراگرتنی ئەسیای بچووک و ولاتی شام توانییان چەند میرنشـینێک دابمەزرێـنن، لەوانە "میرنشـینی رەهـا، میرنشـینی ئەنتاکیـا، میرنیشـنی تەرابلس، میرنیشینی بەیت ولمەقدیس".[3]

لێرەدا دەتوانین بلێین بەشی کۆتایی شالاوی یەکەمی خاچیەکان گەمارۆدانی شاری قودس بوو بۆ ماوەی (٥) هەفتە لە ساڵی (٤٩٣ك/١٠٩٩ ز)دا، لە هەمان ساڵدا توانییان شاری قودس بگرن و تیایدا کوشتارێکی یەکجار زۆریان ئەنجامدا و تەنها فەرماندەی فـاتمی (افتخـار الـدولە) و هەنـدێ لە پیاوەکـانی ڕزگاریـان بـوو، لەو بارودۆخە هەستیارەدا خاچیەکان لە کڵێسای قیامەت کۆبوونەوە بۆ بەجێ هێنان

---

(١) .قونیە: شارێکی تورکیە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەسیای بچووک و سەلجوقیەکان کردیانە پایتەختی خۆیان لە ولاتی روم کاتی فەتح کردنی ساڵی (٤٧٧ك/ ١٠٨٤ز) ( بڕوانە: كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ت-بشير فرنسيس وكوركيس عواد، بغداد، ١٩٥٤، ص ١٧٢).

(٢) . ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ص١٣٤؛ أبن الجوزي: المنتظم، ج٩/ ص١٠٥؛ كارل بروكلمان: تأريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة، بنية امين فارس ومنير البعلبكي، بيروت، ص٣٤٥- ٣٤٦.

(٣) . د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص،٣٥.

یان ئەنجامدانی "نوێژی سوپاس"، بەم شێوەیە قەوارەی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی جێگیر بوو، یەکەم کاری خاچیەکان لە قودس پاککردنەوەی شار بوو لە تەرمی کوژراوەکان کە هەموو شاری داگیر کردبوو، لەگەڵ ڕیشەکێشکردنی موسڵمانان بە هەموو جۆرێک، دواتر مشت و مڕ لەسەر ئەوەی کێ لە قودس فەرمانڕەواییان بکات سەریهەڵدا، چونکە خاچیەکان کاتێک لە ساڵی (٤٩٠ک/١٠٩٦ ز) ئەوروپایان بەجێ هێشت بیریان لەوە نەکردبوویەوە دوای داگیرکردنی قودس لە دەستی موسڵمانەکان چی بکەن، لە هەمان کاتدا پاپا ئوریانی دووەم پێش بیستنی داگیرکردنی قودس کۆچی دوایی کرد، بە بێ ئەوەی هیچ سیستەمێک دیاری بکات بۆ بەڕێوەبردنی شاری قودس، بەڵام لە کۆتاییدا ڕێککەوتن لەسەر هەڵبژاردنی (جودفری البوبونی) لە ژێر ناونیشانی (حامی حریم المقدس) بۆ بەڕێوەبردنی شاری قودس بەم شێوەیە لە ئەنجامی سەرکەوتنی هەڵمەتی یەکەم، دروست کردنی سێ میرنیشین و مەملەکەتێک بەدەست هات.[١]

شالاوی یەکەمی خاچیەکان بە دوو قۆناغ تێپەڕی، یەکەمیان سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام دووەم جگە لەوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا هاوکات شێوە ڕێکخستنێکی بەخۆیەوە بینی، و توانییان هەموو ئەو ناوچانە داگیر بکەن کە پیایدا تێپەڕ بوون، لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتەدا کاری دزی و چەتەیی و تالان و وێرانی نەک لە ناو خاکی موسڵماناندا بەڵکو لە هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیشدا زۆر بوو، گرنگی ئەم هەڵمەتە لەوەدایە شاری قودس داگیرکرا و لە دەست موسڵمانەکان دەرهێنرا کە مێژووی دەسەڵاتی ئیسلامی لەو ناوچەیەدا دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی دووەم خەلیفەی راشدی (عومەری کوڕی خەتاب) (ر.خ) (ساڵی "١٥"ک)، هەروەها توانییان لە ئەنجامی ناکۆکی و ململانێی نێوان میرە عەرەبەکان و نەبوونی سەرکردەیەکی بەتوانا و لێهاتوو بۆ سەرکردایەتی کردنی بەرەی ئیسلامی و بەرگریکردنی لە خاکی موسڵمانان دژ بە هێرشی خاچیەکان سێ میرنشین و مەملەکەتێک لە ناو خاکی موسڵماناندا دابمەزرێنن.

---

(١) . د. قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص،١٣٠.

## باسی دووەم

# هەڵمەتی دووەمی خاچیەکان

ڕزگارکردنی شاری ڕەها لە دەستی خاچیەکان لە ساڵی (٥٣٩ک/ ١١٤٤ز) بە دەستی عیمادەدین زەنگی دوای (٢٨) ڕۆژ گەمارۆدان هەنگاوێکی بەرچاو بوو، بەمەش یەکەم قەوارەی سیاسی و ئاینی و ئابووری و کۆمەڵایەتی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کۆتایی هات، ئەمە ڕووخانی قەڵایەکی دەروونی گەورە بوو لەسەر خاچیەکان، هاوکات لێدانێکی گەورە بوو بۆ بەرژەوەندیەکانیان لە ناوچەکەدا، هۆکارێکی گرنگیش بوو لە بیرکردنەوە بۆ هەڵمەتێکی تر بۆ سەر ڕۆژهەڵات، خاچیەکان لە دژی عیمادەدین زەنگی هیچیان پێ نەدەکرا تا هاتنی هێرشی دووەمی خاچیەکان.[1]

لە ڕاستیدا ئەم شارە پەیوەندییەکی کەلتوری بە سەرەتای مەسیحیەتەوە هەبوو، بە ڕووخاندنی دوای کەمتر لە (٥٠) پەنجا ساڵ لە دەست بەسەراگرتنی بەدەستی "بلدوین البویونی" ڕەشبینی لای خاچیەکان دروست کرد، بەڵام لای جیهانی ئیسلامی پێچەوانەی خاچیەکان بوو، چونکە سەرکەوتنی موسڵمانان بە سەرکردایەتی عیمادەدین زەنگی فاکتەری سەرەکی بوو لە هاندان و یەکخستنی هەموو توانا و چالاکی موسڵمانان لە دژی خاچیەکان، لە ڕووی سەربازیەوە کەوتنی شاری ڕەها بە دەستی موسڵمانان دەستکەوتێکی گەورە بوو، چونکە دۆڵی فورات ببووە ناوچەیەکی ئیسلامی، هاوکات ناوچەیەکی گرنگ بوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەموو ڕێگا و بانەکانی نێوان باکووری شام و عێراق و جەزیرە و ئاسیای بچووک.[2]

لە ڕۆژئاوای ئەوروپا جۆرێک لە غەم و مەترسی لە ناو خەڵک و دەزگاکانیان بڵاوبوویەوە و هەستیان بە مەترسی و ئاڵۆزی بارودۆخیان کرد لە ناوچەکانی جەزیرە و وڵاتی شام، سەرەڕای ئەو بارودۆخە پشێو و نائارامە، هیچ لەو سەرکردە ئەوروپیانە هەوڵی هەڵمەتێکی خێرای خاچییان نەدا، بەڵکو هەستان بە ناردنی وەفدێکی فەرەنجی بۆ لای پاپا "بجینیوسی سێهەم(٥٤٠-٥٤٨ک/ ١١٤٥-

---

(١) . أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٩/ ص ٨- ٩؛ أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص ٢٧٩.

(٢) . د. قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، ص ١٣٧.

١١٥٣ز) كە ماوەیەکی کەم بوو دەسەڵاتی پاپەوی وەرگرتبوو، هاوکات وەفدێکی ئەرمەنی هانایان بۆ پاپا و پاشاکانی ئەوروپا هێنا بوو بۆ گێڕانەوەی شاری رەها، لە نێوان سالانی (٥٤٠-٥٤٤ک/١١٤٥ - ١١٤٩ز) ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە دەرکەوتن کە لە مێژووی شەڕی خاچپەکاندا بە هەڵمەتی دووەمی خاچپەکان ناسرا.[١] بێگومان تێکشانی خاچیەکان لە شاری رەها بەرامبەر عیمادەدین زەنگی ببووە هۆی ئەم پەلامارە بە سەرکردایەتی "کونرادی سێهەم" ئیمپراتۆری ئەڵمان و لویسی حەوتەم پاشای فەرەنسا بۆ ناوچەکە لە کۆتایی ساڵی (٥٤٢ک/١١٤٧ز) و سەرەتای ساڵی (٥٤٣ک/١١٤٨ ز) کە دواجار چارەنووسیان دۆڕاندنێکی گەورە بوو بە دەستی موسڵمانان و پاشای فەرەنسا بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە دیلی و کوشتن ڕزگار بوو ئەمەش لە دوای تێکشکانی سوپاکەی.[٢]

کەوتنی شاری رەها قۆناغی یەکەمی لە ئاسۆی ئیسلامی و سەرکەوتنەکانیان تەواوکرد و بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە داتەپینی خاچیەکان لە هەڵمەتی دووەمیان دەبینین کە ئامانجیان گێڕانەوەی دەسەڵات و قەوارەی خاچیەکان بوو لە ڕۆژهەڵات.[٣] خاچیەکان بۆ یەکەم جار هەستیان کرد بە مەترسی بارودۆخیان لە ڕۆژهەڵات، بۆیە بانگەوازیان بۆ هەڵمەتێکی نوێ دەکرد، بەڵام لە هەمان کات و لەو بارودۆخە ناسکەدا هاوکاری یەکتریان نەدەکرد، جوسلین هەوڵیدا کە "تل باشر" بکاتە بنکەی خۆی و تێکچوونی لەگەڵ "ریموند"ی میری ئەنتاکیا و دەرچوونی لە ژێر دەسەڵاتی ئەوی خستەڕوو، هاوکات ڕقی بوو لە هاوپەیمانیەتی (جوسلین)، بەڵام بڕیاریدا یارمەتی لە بیزەنتەکان وەربگرێت بۆیە لەلای ئەوانەوە بەڕێکەوت، هاوکات ئەوان خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ شەڕ لەگەڵ تورکەکان و وەلامی ئەویان نەدایەوە و ئەویش بە لاوازی لە بەردەستیان مایەوە،[٤] دەتوانین بڵێین کەوتنی مەملەکەتی رەهای خاچی بەرهەمێکی گەورە بوو بۆ ڕزگارکردنی میرنشینی (عیمادەدین زەنگی) کە بەردەوام لە مەترسیدا بوو، بەڵام لە دوای ئەو ڕووداوەوە دڵنیابوون.[٥]

---

(١) . د. قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوە،ص١٣٧.

(٢) . أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص٢٩٧- ٣٠٠.

(٣) . رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ج٢/ ص ٤٦٧.

(٤) . هەمان سەرچاوە،ص ٢٨٣.

(٥) . أبن الأثير: الباهر في التأريخ، تحقيق، عبدالقادر أحمد طليحات، القاهرة، ص٦٩.

ئەم سەرکەوتنە دەرفەتی ڕەخساند بۆ (عیمادەدین زەنگی) بۆ دەست بەسەراگرتنی پێگەی خاچپەکان لەو دەوروبەرە و کۆنترۆڵ کردن و دەست بەسەرداگرتنی هەموو شمەکی دوژمن لە ناوچەکەدا، هەروەها لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنەدا کۆمەڵێک نازناوی لە عەبباسیەکان و سەلجوقیەکان وەرگرت.[1] خاچپەکان بۆ مانەوەیان لە ڕۆژهەلات هەموو هێز و توانایان خستەگەڕ بۆ کۆکردنەوەی هێزەکانیان دژ بە "نورەدین مەحمود" کە گەورەترین هێز بوو لە ناوچەکەدا لە دژی خاچپەکان، نورەدین مەحمود بەم سەرکەوتنەوە نەوەستا بەڵکو بە سوپاکەیەوە بەرەو باکوور بەڕێکەوت و توانی دەست بگرێت بەسەر هەموو ئەنتاکیا لە ڕۆژهەلاتی ڕووباری (أورنت)، هەروەها لە ساڵی (٥٤٢ک/١١٤٧ز) ناوچەکانی "ارناح و کرلاتا و بیلاگ و سرقوت" کەوتنە بەر هێرشی نوردەین مەحمود،[2] ناچار خاچپەکان لە ساڵی (٥٤٣ک/ ١١٤٨ز) گەورەترین سوپایان ئامادەکرد بۆ گۆڕەپانی جەنگ و شاری دیمەشقیان گەمارۆدا لە چوارچێوەی هەڵمەتی دووەمی خاچپەکان، "معين الدين انر" ی فەرمانڕەوای دیمەشق چاوەڕوانی ئەوە نەبوو مەبەستی ئەم سوپایە داگیر کردنی شاری دیمەشق بێت، بەڵام کاتێک ئەم ڕاستیەی بۆ دەرکەوت داوای یارمەتی لە هەموو میرەکانی هەرێمەکانی دەوروبەری کرد بۆ ناردنی سەربازەکانیان، هاوکات داوای یارمەتی لە (نورەدین مەحمود) کرد. هێزی خاچپەکان سەرەتا لای "منازل العساكر" نیشتەجێ بوون کە دەکەوتە دوری (٤ میل) لە باشووری دیمەشق، سوپای خاچپەکان پەلەیان کرد لە پێشکەوتنیان بۆ گوندی "المنره" لەبەر هەبوونی ئاو لەو گوندەدا، سەرەتا سوپای موسڵمانان هەوڵیاندا نەهێڵن خاچپەکان لەوە زیاتر پێشڕەوی بکەن، دواتر لە ئەنجامی تێهەڵچوونی هەردوولادا خاچپەکان هەندێ سەرکەوتنیان بە دەستهێنا و توانیان شارەکە داگیر بکەن، موسڵمانان ناچار بوون شەڕی "عصابات- سەرکێش" ی ئەنجام بدەن، بۆ ڕۆژی دواتر شەڕ لە نێوانیاندا پەرەی سەند و هاوکاری و یارمەتی بۆ موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە دەهات، خاچپەکان ناچار بوون بکشێنەوە بۆ دەشتاییەکانی شورای ڕۆژهەلات، دوا بەدوای ئەو ڕووداوە سوپای موسڵمانان هێرش و پەلاماریان بۆ سەر خاچپەکان تازەکردەوە، خاچپەکان

---

(١) . وەکو "الانير المظفر، ركن الاسلام، عمدة السلاطين، زعيم صيوشن المسلين، ملك الامراء، امير العراقيين والشام"، أبن القلانسي: م.ن،ص،٢٨٤.

(٢) . رنسیمان: هەمان سەرچاوە،ص٣٩٢.

بەناچاری هەنگاوی بەرگری کردنیان گرتەبەر بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانەی تێکەوتبوون، بەڵام سوارە موسڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان دەکردە سەر سوپای خاچیەکان و تیربارانیان دەکردن، بە شێوەیەک هەموو لەناو یەک شڵەژان و ناچار بوون بە تێکشکاوی بگەڕێنەوە بۆ بنکە سەربازییەکانیان، بەهۆی زۆری کوژراوەکانی خاچیەکانەوە بۆنی تەرمەکان هەموو دەشتەکەی گرتبوو،[1] بارودۆخی خاچیەکان لە وڵاتی شام زۆر خراپ بوو، سەرەڕای کوژرانی (عیمادەدین زەنگی) بە دەستی یەکێک لە خزمەتکارەکانی بە ناوی (برتقش) لە ساڵی (٥٤١ک/ ١١٤٧ز)،[2] جوسلین لە دووەم هەوڵیدا لە هێرش بردنەسەر شاری ڕەها بە مەبەستی دەرهێنانی لە دەستی (نوردەین مەحمود) شکستی هێنا، جەنگاوەرانی هەردوولا "موسڵمانان و خاچیەکان" چاوەڕوانی هاتنی بەشی کۆتایی سەربازانی هەڵمەتی دووەم بوون، بەڵام (لویسی حەوتەم) گیرۆدەی پرۆپاگەندەی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان "اليانور الاكوتيانيه" ی خێزانی و میری ئەنتاکیا "ریموند" بوو، بەم هۆیەوە (ڕەهای) لەیادچوو و پەیوەندی کرد بە سوپای "کونرادی سێهەم" لە فەڵەستین و بڕیاری هێرشیاندا بۆ سەر شاری دیمەشق لە بری ڕزگارکردنی شاری ڕەها، لە ئەنجامدا زۆر بە خراپی تێکشکان، ئەمە بوو بە هۆی گەڕانەوەی کونراد بۆ ئەڵمانیا، هەروەها لویسیش لە ساڵی (٥٤٤ک/١١٤٩ز) گەڕایەوە.

لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتەدا ژمارەیەکی زۆری خاچیەکان لەناو چوون، لەوەش زیاتر بڕێکی زۆر چەک و تەقەمەنیان لە دەست دا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم سوپا گەورەیە ئامانجی سەرەکی خۆی بیرچێتەوە، و لە بەرامبەر هێرشی موسڵمانان نەیانتوانی بۆ ماوەی چوار ڕۆژ بەرگری بکەن، ئەمەش بە گەورەترین ئیهانە دادەنرێت بۆ ڕێز و شکۆی خاچیەکان کە دەیانوت سواری خاچی نادۆڕێت، هاوکات هیوا و ئومێدی نوێی دا بە جیهانی ئیسلامی.[3] "نورەدین مەحمود" بەرپرسی حەلەب و "معين الدين انر" بەرپرسی دیمەشق ڕێککەوتن هاوکاری و یارمەتی یەکتر بدەن بۆ ڕاوە دوونانی خاچیەکان لە ئەنجامی دۆڕانیان لە شام لە ساڵی (٥٤٤ک/ ١١٤٩ز)دا، سوپای ئیسلامی دەستی کرد بە تێکدانی قەڵای "العريمه" کە لە ژێر دەسەڵاتی خاچیەکاندا بوو، هەروەها بنکەی هێرش و پەلاماری خاچیەکان

---

(١) . أبو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية،ج١/ص١٣٣.

(٢) . أبن واصل: مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، ص ٩٩- ١٠٠؛ أبن القلانسي: م.ن،ص٨٤- ٨٥.

(٣) . رنسيمان: . هەمان سەرچاوە،ص٤٥٧.

بـوو، تـا لەگەڵ خـاکە کە ڕێـک بـوو، هاوکـات موسـڵمانەکان توانیـان زۆرێـک لە خاچیەکان لە نێوانیاندا "برتراند بچووک" کە یەکێک بوو لە فەرماندەکانی خاچیەکان لەگەڵ خوشکەی بەدیلی بگرن، دواتر بران بۆ شاری حەلەب و (١٢) ساڵ لە زینداندا مانەوە.[١]

بەم شێوەیە هەڵمەتی دووەمی خاچیەکان کۆتـایی هـات هەرچەنـدە ئەم هەڵمەتە پاپـاو قـدیس "برنـارد" پیلانیـان دانـا بـوو، و دوو گەورە پاشـای ئەوروپـا سەرکردایەتیان دەکرد، و دانیشتوانی ئەوروپا هیوایەکی زۆریان بە سەرکەوتنی ئەم هەڵمەتە بوو، بەڵام هەڵمەتەکە شکستی هێناو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو بە دیل گیـرا کە لە نێـو دیلەکانـدا میرێـک هەبـوو. تێکچوونی پەیوەنـدی نێـوان خاچیەکـانی ئەوروپا و بیزەنتەکان و بە پێچەوانەوەی ئەوانەوە یەکبوونی ریزەکانی موسڵمانان لە نێو خۆیاندا کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر بـاری دەروونـی خاچیەکـان لە کاتی شەڕکردندا.

ئۆباڵی شکستهێنانی هەڵمەتی دووەمی خاچیەکان دەکەوێتە ئەستۆی سـەرکردە و فەرمانـدەکانیان بە هـۆی ململانـێ و تێکچـوونی پەیوەنـدی نێوانیـان،[٢]جـگە لە دەرکەوتنـی "نـورەدین مەحمـود" لە سـاڵی (٥٤٦ک/ ١١٥١ز) کە ڕۆڵێکـی گەورەی هەبوو لە بەرگری کردنی هێرش و پەلامـاری خاچیەکـان و چوونە نـاوچەی "راس الما و". [٣]

نوردەین مەحمود سەرکردایەتی سوپای ئیسلامی کرد و لە نـاوچەی "عین الجر" لە دەشـتی بیقـاع و لە نزیـک دیمەشـق دابەزی بـۆ شـەڕ کـردن لەگەڵ خاچیەکـان، هاوکـات دەرکەوتنـی گەشـتیگەلی میسـری لە کەنارەکـان هانـدەرێک بـوو بـۆ نـوێ بـوونەوەی شـەڕ لەگەڵ خاچیەکـان، ئەم گەشـتیگەلیە پـڕ بـوو لە هێـز و چەک و تەقەمەنی و لە (٧٠) حەفتا بەلەمـی جەنگی بە هەمـوو پێداویسـتیەکانیەوە پێکهـاتبوو، گەشتیگەلی میسر هێرشـی کردە سـەر خاچیەکان، دوای تێکشکاندنیان ژمـارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بەدیل گرتن، کەشتیگەلی میسر هەرچیـان هـاتەڕێ سـوتاندیان و بەلەمێکـی زۆری خـاچی و بیزەنتیـان دەسـتکەوت، دوای ئەم سـەرکەوتنە بەرەو شـاری عەککـا بەڕێکەوتـن، موسـڵمانان بەهەمـان شـێوەی (یافـا) شـاری (عەککا)یـان

---

(١) . أبن القلانسي: م.ن،ص٣٠٩- ٣٢١؛أبو شامە: م.ن،ص١٤٩- ١٥١.

(٢) . رنسیمان: م.ن،ص٤٦٢.

(٣) . د. خاشع المعاضیدي واخرون: الوطن العربي والغزو الصلیبي، ص١١٨.

ڕزگار کرد، دوا بەدوای ئەوە موسڵمانان هێرشیان بردەسەر "صیدا و بیروت و تەرابلس" و توانیان زەرەرێکی توند بدەن لە دوژمن، لە ئەنجامی ئەو هەموو سەرکەوتنەی کە کەشتیگەلی میسری بە دەستی هێنا، (نورەدین مەحمود) بڕیاریدا سەردانیان بکات، چونکە خزمەتێکی گەورەیان پێشکەشکرد لە تێکشکاندنی خاچیەکاندا،[١] دوای دوو ساڵ لە دۆڕاندنی خاچیەکان (بلدوین) پاشای بەیت ولمەقدیس بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر شاری عەسقەلان و توانی سوپایەکی زۆر گەورە بە هەموو پێداویستیە جەنگیەکانی ئەو سەردەمە ئامادە بکات، شاری عەسقەلان یەکێک بوو لە بە هێزترین پێگە سەربازیەکانی کەناری دەریا، سوپای خاچیەکان بۆ ماوەی چەند مانگێک گەمارۆیاندا، هەرچەندە گەشتیگەلی میسری بە هانایانەوە هاتن و هەموو چەک و تەقەمەنی و خواردنێکی پێگەیاندن، بەڵام لە ئەنجامی هەڵەی یەکێک لە موسڵمانان لە چوونی بۆ سوتاندنی بورجی خاچیەکان، ئاگری ئەو بورجە پەرەی سەند و گەیشتە شاری عسقلان، و کەلێنی خستە شورای شارەکە، هەندێ لە سوارە خاچیەکان هاتنە ناو عەسقلان و هەرچەندە ئەوان کوژران، بەڵام بەردەوام بوونی گەمارۆکە لە سەریان بووە هۆی داگیرکردنی لە لایەن خاچیەکانەوە، بەمە خاچیەکان شاری عەسقەلانیان کردە سەنتەری دژایەتی کردنی موسڵمانان لە میسر و شام و جەزیرەی فوراتی.[٢]

## ڕووداوە سیاسیەکانی ناوچەی ئیسلامی

ڕووداوە سیاسیەکانی سەر گۆڕەپانی میسر زۆر بە خێرایی بەرەو نەمانی دەسەڵات هەنگاویان دەنا بە تایبەت لە دوای مردنی "الافچل بن بدرالجمالی" لە ساڵی (٥١٥ک/ ١١٢١ز)،[٣] نەبوونی فەرمانڕەوایەکی بە توانا و لێهاتوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، وایکرد وڵاتی میسر بکەوێتە گێژاوەیکی بێ کۆتای پڕ پیلان و خوێن ڕژانەوە، بەمەش دوژمنان لە دەرەوەی میسر خۆشحاڵ بوون، لە ساڵی (٥٤٥ک/١١٥٠ز) بلدوینی سێهەم هەستا بە چاککردنەوەی قەڵای غەززە بۆ هێرشبردنە سەر میسر، شاری عەسقلان کە بە دەستی میسریەکانەوە مابوویەوە، مەترسی بوو لەسەر خاچیەکانی فەڵەستین، خاچیەکان توانییان لە ساڵی (٥٤٨ک/

---

(١) . أبن القلانسي: هەمان سەرچاوە،ص٣١٤.

(٢) . رنسیمان: هەمان سەرچاوە،ص٥٤٥.

(٣) . أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٨/ ص ٣٠٢.

١١٥٣ز)دا داگیری بکەن.[1] بەم شێوەیە تا دوای نیو سەدە لە هاتنی هەڵمەتی یەکەمی خاچیەکان کەنارەکانی فەلەستین نەکەوتە دەستی خاچیەکان، ئەمەش بۆ خۆی هۆکارێک بوو بۆ دۆڕاندنەکانی خاچیەکان لە بەرەکانی باکوور دژ بە (نورەدین مەحمود) و سەرکەوتنیان بەسەر خیلافەتی فاتمی پێشوو لە عەسقەلاندا.[2]
لە ساڵی (٥٥٩ک/١١٦٣ز) بلدوینی سێهەم مرد، ئەم کەسە سیاسەتی دەرەوەی بەرامبەر داگیرکردنی وڵاتی میسر ڕوون و ئاشکرا بوو، بەڵام دوای نەمانی خۆی جێگیرەکەی بە ناوی "امالریک یەکەم" کە بە "عموری یەکەم- Amaloric1" ناسرا، سیاسەتی بریتی بوو لە زنجیرەیەک هەوڵدان بۆ داگیرکردنی میسر، چونکە بارودۆخی سیاسی ئەو سەردەمە وای دەخواست بە تایبەت دوای یەکبوونی حەلەب و دیمەشق لە ژێر فەرمانڕەوایی "نورەدین مەحمود"دا، بە ڕای ئەو داگیرکردنی خاکی میسر تاکە چارەسەر بوو بۆ ڕزگاربوونی خاچیەکان، دوای ئەوەی "عموری یەکەم" دڵنیا بوو لەوەی ئەگەر بێت و میسر و شام یەک بگرن و لە ژێر کۆنترۆڵی موسڵماناندا بمێننەوە ئەوا میرنیشینی خاچیەکان و بەرژەوەندیەکانیان لە ناوچەکەدا دەکەوێتە مەترسیەوە، سەرەڕای ئەم بارودۆخە، (نورەدین مەحمود) لە گۆڕانکارییە سیاسیەکانی ناوچەکە و ململانێی نێوان موسڵمانان و خاچیەکاندا بێ ئاگا نەبوو،[3] بۆیە "نوردەین مەحمود و عموری یەکەم" خۆیان ئامادەکرد بوو بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتە گەورەکە، ئەویش وڵاتی میسر بوو بە هەموو توانا "ئابووری و چڕی دانیشتوان"ە کەیەوە، هەوڵەکانی (عموری یەکەم) لەبەر نەبوونی توانای "مرۆیی و مادی" لە میرنشینی بەیت ولمەقدیس و گۆڕانی نەخشەی پەیوەندی سیاسی نێوان هێزە ئیسلامیەکان لە ناوچەکەدا شکستیان هێنا، لە گرنگترین ڕووداوەکانی سەر خاکی میسر و خیلافەتی فاتمی ئەوەبوو "چرغام و شاور" کوژران و (ئەسەدەدین شێرکۆ) بووبە وەزیر لای (خەلیفە عاچد)، لە دوای مردنی شێرکۆ ساڵی (٥٦٤ک/ ١١٦٩ز) سەلاحەددین یوسفی کوڕی ئەیوب لە وەزارەتدا شوێنی گرتەوە و توانی لە ماوەی کارکردنی لە وەزارەتی فاتمیدا جێ دەستی دیار بێت، هاوکات توانی لەسەر ناوچە ئیسلامیەکان خۆی وەک سەرکردەیەکی قارەمان و جوامێر و لێهاتوو نیشان بدات، ڕووداوە مێژووییەکانی

---

(١) . هەمان سەرچاوە،ج٩/ ص ٤٢؛ أبن القلانسی، م.ن،ص٣٢١.

(٢) . د. قاسم عبدە قاسم: هەمان سەرچاوە،ص ١٣٩.

(٣) . د. قاسم عبدە قاسم: هەمان سەرچاوە،ص ١٣٩- ١٤٠.

ـۆچەکە شاهیدی توانای سەلاحەددین لەو سەردەمەدا، سەرنەکەوتنی پڕۆژەی هێرشی هاوبەشی نێوان "عموری یەکەم و بیزەنتەکان"لە ساڵی (٦٦٥ک/ ١١٦٩ز) لە ـژی میسریەکان، و سەرنەکەوتنی گەمارۆیان بۆ سەر (دیماگ)کە ماوەی (٥٠) ـەنجا ڕۆژی خایاند بەڵگەیەکی ڕوونی تواناو لێهاتویی سەلاحەدینن.[1] ئەم ڕووداوانە هۆکارێکی بە هێز بوون بۆ جێگیربوونی دەسەڵاتی سەرکردەیەکی لاوی وەک (سەلاحەددینی ئەیوبی) لە میسر، ئاڵای (نورەدین مەحمود) بەسەر پێنج پایتەختدا "شەکاوە" بوو ئەوانیش، بریتیبوون لە "دیمەشق، ڕەها، حەلەب، موسڵ، قاهیرە"، نورەدین زۆری لە سەلاحەدینی ئەیوبی دەکرد تا هەنگاوی گرنگ و خێرا بنێ بۆ لە ناوبردنی خیلافەتی فاتمی و گێڕانەوەی میسر بۆ ژێر ئاڵای خیلافەتی عەبباسی، بەڵام سەلاحەددین چاوەڕوانی دەرفەتێکی چاکی دەکرد تا بۆی ڕێک بکەوێت، ئەویش یەکەم ڕۆژی هەینی ساڵی (٥٦٧ک/ ١١٧١ز) بوو کە ناوی خەلیفەی فاتمی لە وتاری ڕۆژی هەینی لابرد و ناوی خەلیفەی عەبباسی هێنا، لە دوای یەک هەفتە خەلیفەی فاتمی "العاچد" کۆچی دوایی کرد، کە دوا کەسی بنەماڵەی فاتمیەکان بوو.[2] لە ئەنجامی ئەم ڕووداوانەدا سەلاحەددین بوو بە دەسەڵاتداری یەکەمی میسر لە قۆناغێکی مێژوویی زۆر گرنگی نێو قۆناغەکانی ململانێی دژ بە خاچیەکان. جگە لە توانا و لێهاتووی سەلاحەددین، کۆمەڵێک هۆکار یارمەتی دەربوون بۆ جێگیربوونی و ناو دەرکردنی، لەوانە دەوڵەمەندی میسر و مردنی (نورەدین مەحمود) لە ساڵی (٥٦٩ک/ ١١٧٤ز)، هاوکات مردنی "عموری یەکەم- امالریک" پاشای بەیت ولمەقدیسی دوژمنی لە هەمان ساڵدا، هەموو ئەمانە چاکترین دەرفەت بوون بۆ دووبارە یەکخستنی بەرەی ئیسلامی دژ بە خاچیەکان و سەرکردایەتی کردنی ئەم بەرەیە لە لایەن سەلاحەددینەوە و چارەسەرکردنی هەموو کێشە و ململانێکانی نێوانیان.[3] دوا بەدوای ئەم ڕووداوە سیاسیانە بە ڕەزامەندی خەلیفەی عەبباسی، سەلاحەددین لە ساڵی (٥٧٠ک/ ١١٧٥ز) پاشایەتی خۆی لە وڵاتی میسر و شام ڕاگەیاند، سەلاحەددین بۆ ماوەی (شەش ساڵ) لە ساڵانی (٥٧٢- ٥٧٧ک/ ١١٧٦- ١١٨١ز) بەمەبەستی ڕێکخستنی بارودۆخی میسر و شام و خۆئامادەکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی خاچیەکان، لە میسر مایەوە، لەو کاتەدا سەلاحەددین بە

---

(١) . أبن الأثير: هەمان سەرچاوە، ج٩/ص١٠٦- ١٠٦

(٢) . أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٩/ ص١١١- ١١٢.

(٣) . هەمان سەرچاوە، ج٩/ ص١٢٤- ١٧٢؛ د. قاسم عبده قاسم، هەمان سەرچاوە،ص١٤٠.

شـێوەیەکی زۆر زەق و گەورە خـۆی لە قەرەی خاچیەکـان نەدەدا، سـەلاحەددین هەمـوو ناوچەکـانی نێـوان نیـل و فـوراتی بە هەمـوو توانـا مـادی و مرۆییەکـانیەوە کۆنترۆڵ کرد.

لەوکاتەدا خاچیەکان چەند هێرش و پەلامارێکیـان بردە سـەر نیمچە دورگەی سینا، تەنانەت هێزەکانیان گەیشتنە دەریاچەکانی نـاوچەی سـویس، هەروەهـا چەند هەڵمەتێکیان بردەسـەر "تیما و"ی نیوە دورگەی عەرەبی،[1] "رنیالدی شاتیون" میری کرک کە بە "ارناگ" ناسراو بوو، هەوڵیدا لە پێناو دەست بەسـەراگرتنی جووڵانە وە و چالاکیە بازرگانیەکانی نێوان بەندەرەکانی میسر و حیجاز، دەریـای سـوور ببڕێت و مەکـکە و مەدینـە داگیـر بکـات، بەڵام گەشـتیگەلی میسـری تـوانی بە تەواوی گەشتیگەلی خاچیەکـان لە نـاو بەرێـت،[2] ئەم ڕووداوانە هەمـوو هۆکـار بـوون بـۆ ئەوەی سـەلاحەددین دەسـتبکات بە گەورەتـرین شـەڕ لەو سـەردەمەدا لە دژی خاچیەکان ئەویش شەڕی (حگین) بوو لە ساڵی (٥٨٢ک/ ١١٨٧ز)دا.[3]

---

(١) . أبن الأثير: م.ن، ج٩/ ص ١٥٢- ١٢٣؛ ابو شامە، م.ن، ج٢/ ص٢٨- ٣٧.

(٢) . أبن الأثير: هەمان سەرچاوە، ج٩/ص ١٥٩- ١٦٠.

(٣). ابن شداد: النوادر السلطانية،ص ٦٠- ٧٣؛ أبن الأثير: هەمان سەرچاوە،ج٩/ص١٧٦- ١٧٩.

## ڕاگەیاندنی دەروونی لە شەڕی خاچپەکان

لەپاش کۆچی دوایی (نورالدین محمود) [1] لە ساڵی (٥٦٩ک/ ١١٧٣ز)دا جیهانی ئیسلامی بوو بەچەند دەوڵەتۆکەیەک و ململانێ کەوتە نێوانیانەوە، تا لەم کاتانەدا سوڵتان سەلاحەددین دەرکەوت کە بۆ دووبارە بنیاتنانەوەو یەکخستنەوەی جیهانی ئیسلامی هەوڵیدەدا کەلەوەو پێش لەدەستی دابوو، بۆ زیندوکردنەوەی ئەو قەوارەیە لە سایەی دەوڵەتی ئەیوبیدا کاری دەکرد. [2]

سوڵتان سەلاحەددین سەرکردەیەکی سەدەکانی ناوەڕاست بوو توانی زۆربەی لایەنەکانی سەربازی و ڕامیاری و کارگێڕی و کۆمەڵایەتی ڕێکبخات، و باشترین ڕێ و شوێنی بۆ دابنێت، ئەوەی لە کەسێتی سەربازی سەلاحەددین بکۆڵێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە لەهەمــوو ئەو گریمــانە ســەربازییانەدا کە پێشــتر لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئــاوادا هەبــوون جیــاوازە، بەشــیکردنەوەو لێکــدانەوە دەردەکەوێ کە تیــۆری جەنگی لای سەلاحەددین لە ڕووی هونەری و تاکتیکی ڕاستی و تواناو مەبەست و ئامانجەکانییەوە جیاوازی زۆرە لەو تیۆرانەی کە پێشتر هەبوون. [3]

هەر لەوکــاتەی ســەلاحەددینی ئەیــوبی جــڵەوی لێپرســراوی گــرتە دەســت بەمەبەستی تەواو کردنی بەرنامە پێشینەکانی، هەڵمەتە ڕاگەیاندنە دەروونیەکانی ڕۆڵێکــی کــاریگەرو گرنگیــان هەبــوو لەیەکخســتنی هێــزە ئیســلامیەکان بــۆ بەرپەرچدانەوەو بەرەنگار بوونەوەی خاچ دروشمەکان، لە ڕێگای ڕێکخستنی ڕای گشتی ئیسلامی و خۆ ئامادە کردنیان بۆ جیهاد لە پێناوی خودا و بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە پاشەڕۆژدا لە ڕێگای چەندین هۆو شێوازی جیاواز، لەوانە نوسینی نامەی سوڵتانی (الکتابە السلگانیە)، [4] نامەی برایانە (الرسائل الاخوانیە)، [1] کە ڕۆڵی

---

(١) . (نورالدین محمود) لەساڵی (٥١١ک /١١١٨ز) لەشاری حەڵەب لەدایک بووە، کوڕی (عماد الدین زنگی)ە، پاش مردنی باوکی ساڵی (٥٤١ ک /١١٤٧ز) دەسەڵاتی وەرگرت، فەرمانڕەوای (شام و جەزیرە و مصر ) بووە، بەپاشای چاکەخواز ناوبانگی دەرکردووە، هەروەها بەچاکترین و دادپەروەرترین پاشاکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێت. (ابن الجوزی: المنتظم في تأریخ الملوک الامم، ج١٠/ ل٢٤٨–٢٤٩؛ سبط ابن الجوزی: مرآة الزمان في تأریخ الاعیان، ج٨/ ل٣٠٥؛ ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٢٧ –٢٢٩).

(٢) . ا.ر.جب: صلاح الدین الایوبی، ل١٩٣؛ فشر: تاریخ اوروبا العصور الوسطی،ل١٨٨.

(٣) . چــونکە ســوڵتان جەنگــی دەروونــی ســتراتیژی و تــاکتیکی لە شــەڕەکانی پیــادەکردووە، و ئاگــاداری ئەوشێوازە دەرونیانە بووە بۆ پێکانی ئامانجەکانی دژی خاچ دروشمەکان، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (ئاراس فریق زینل: جەنگی دەرونی لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبیدا، ل٢٩-٥٠).

(٤) . نــامەی ســوڵتانی (الکتابــة الســلطانیة): تایبەتە بە خۆگرتنی کاروبــاری دەوڵەت و ئیش و کــاری ســوڵتان لەناوخۆو دەرەوە، کە پێکهاتووە لە دانانی خەلیفەکان و میرەکان و لە ڕێو ڕەسمی (مەراسیم) پێدانی پۆستی

ڕاگەیاندنی دەروونی و پڕوپاگەندەیان دەبینی.[2] دەوڵەتی ئەیوبی و فاتمی لە نووسینی تۆماری هەواڵ و بڵاوکردنەوەی ئاگاداریە سوڵتانیەکاندا لەیەک دەچوون، ئەم دوو دەوڵەتە بۆ ئاهەنگ گێڕان لە بۆنە ئاینیە تایبەتیەکانیاندا دەردەچوون، هەرچەندە وتاری ئەو بۆنە ئاینیانە یەکێکی تر دەیخوێندەوە لەزاناکان (العلماء)،[3] جگە لە ڕۆڵی ڕاگەیاندنی نوسەران لەسەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبی کە کاری نووسەری یان لە (دیوانی الانشا و)[4] دا دەکرد، وەک (القاچی الفاچل)[5] کە بەڕێوەبەری ئەم دیوانە بوو و هەروەها (العماد الکاتب).

بۆ نموونە سوڵتان سەلاحەددین کە بۆ خەلیفەی عەبباسی (الناصر لدین الله)[6] ی نووسی، و تێیدا مژدەی ڕزگارکردنی (گبریە وعکا) و کەنارەکانی دەریای شامی

---

وەزارەتەکان و فەرمانەدەیی و فێرکردن و وتار بێژەکان و ئاگاداریەکانی کۆشکی سوڵتان. بڕوانە (القلقشندی: صبح الاعشی، ج٩/ ل٢٩).

(١) .نامەی برایانە (الرسائل الاخوانیة): پێک هاتبوو لە باس کردنی هەستی کەسایەتی لە ڕازی بوون و توڕە بوون و خۆشەویستی و ڕک بوونەوە، گەورە نوسەران ئەو جۆرە نامانەیان چارەسەر دەکرد وەکو (القاضی الفاضل) و (أبن الاثیر) و ئەوانی تر، بڕوانە (نصر الله بن محمد بن الاثیر: المثل السائر في ادب الکاتب والشاعر، ل٤٦-٤٧.

(٢) . هەر لەسەردەمی دەوڵەتی فاتمیەکاندا بۆ بەڕێوە چوونی کاروباری دەوڵەت بەشێوەیەکی ڕەسمی و ئاڵو گۆڕ کردنی نامەی تایبەتی و کەسی. لە نێوان نوسەرەانی ئەو سەردەمەدا، لەو نامانە کەباس لەچالاکی و کەژاوەو دەرچوونیان بۆ ئاهەنگێران و هەستان بۆ نوێژکردن دەکات. (ابن الصیرفی: قانون دیوان الرسائل، ل٢٧).

(٣). أبن شداد: النوادر السلطانیة، ل٢٤٩.

ج

(٤).دیوانی الانشاء: ئامرازی پەیوەندی حکومەتە لەگەڵ لقەکانی لەناوخۆو دەرەوە ، هاوکات دەربڕی هەستەکانی میللەت بوو، و ئەگەر بێت و پەڕاوەکانی دیوانی الانشاء کۆبکرایەتەوە مێژوویەکی تەواوی لێ دەردەچوو. بڕوانە (القلقشندی: صبح الاعشی، ج١/ ل١٣٥؛ بدوی: الحیاة الادبیة في عصر الحروب الصلیبیة بمصر والشام، ل٣٣٤).

(٥).القاضي الفاضل: ناوی (عبدالرحیم بن علی بن محمد بن حسن بن البیسانی اللخمی العسقلانی) ناسراو بوو بە (القاضي الفاضل)، لە ساڵی ٥٢٩ک/١١٣٥ز لە شاری عسقلان لەدایکبووە، چوە بۆ ئەسکەندەریە، پاشان بۆ قاهیرە، یەکێک بوو لە کەسە هەرەنزیکەکانی سوڵتان سەلاحەددین، هاوکات وەزیری بووە، ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە (دیوان الانشاء)، نامەیەکی زۆری هەبوو، لە ساڵی (٥٩٦ک/١٢٠٠ز) لەشاری قاهیرە کۆچی دوایی کرد.(ابن خلکان: وفیات الاعیان، ج٣ل/ ١٥٨؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرە، ج٦/ ل١٥٦؛ابن الساعي: الجامع المختصر في عنوان التواریخ وعیون السیر، ج٩/ ل٢٨).

(٦). الناصر لدین الله: لە ساڵی (٥٥٣ک/١١٥٨ز) لە دایک بووە ، لە پاش مردنی باوکی ساڵی (٥٧٥ک/١١٧٩ز)، بووە خەلیفەی عەباسی بۆماوەی (٣٧) ساڵ، پیاوێکی زمان پاراو ولێهاتووبوو، لە سەر دەمی ئەم خەلیفە

پێراگەیاند، وتی: "سوپاس بۆ خوا بۆ بەجێهێنانی بەڵێنەکەی، بۆ سەرکەوتنی ئەم ئایینە لە رابردوو و داهاتوودا، (گبریە) ئاڵای ئیسلامی تیا هەڵکرا و لە (عکا)ش میللەتی کافرەکان تێک شکێنران، کە مسوڵمانەکان بە چاوی خۆیان بینیان ئاوەدان بوو، خۆشترین و پیرۆز ترین رۆژیان بوو".[1]

سەلاحەددین هەوڵی دەدا دەوڵەتەکەی ببەستێتەوە بەچەندین تۆڕی خێرایی پەیوەندیکردنەوە،[2] ئەوەی کە بەلای سەلاحەددینەوە گرنگ بوو زانینی هەواڵی جێگرو فەرمانڕەواکانی و زانینی هەموو شتێک کە لە ولاتدا ڕوو دەدات و دەرکردنی بڕیاری تایبەت بەو مەسەلانە بوو. دەوڵەتەکەی سەلاحەددین هەمیشە لە حاڵەتی ئامادەییدا بووە، بەهۆی ئەو شەڕو شۆڕە زۆرانەی کە لەنێوان خۆی و خاچ دروشمەکاندا ڕووی دەدا، زۆربەی ساتەکانی فەرمانڕەوایی ئەوێی گرتەوە.[3] ئەمەش وای دەخواست هەمیشە گوێ قوڵاخی هەواڵی بێت و لەکاتی پێویستدا خۆی ئامادە بکات، ئەگەر دوژمن بیری لەشەڕ بکردایەتەوە کە هێرش بکاتە سەریان، یان ولاتێک لە ولاتەکان هێرش بکاتە سەر ولاتێکی تر لەو کاتەدا هێزی فریاکەوتنی بۆ دەناردن،[4] سەلاحەددین لە گەیاندنی هەواڵدا پشتی بەم سێ ڕێگایە دەبەست:-

**١-پۆست.[5]**

**٢-کۆتری نامەبەر (الحمام الزاجل).[1]**

---

خاچ دروشمەکان لاواز بوون، بە هۆی سەرکەوتنەکانی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی، لە ساڵی (٦٢٢ک/١٢٢٥ز) کۆچی دوای کرد. (السیوطي: تاريخ الخلفاء، ل٤٤٨-٤٥٠).

(١). القلقشندی: مأثر الانافة في معالم الخلافة، ج٣/ ل٣٠١.

(٢). بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە العمري: المصطلح الشريف ل٢٣٤.

(٣). ابن واصل: مفرج الكروب، ج١/ ل٢٨٣؛ ابن قاضی شهبة: الكواكب الدرية، ل٢١٥.

(٤). القلقشندی: صبح الاعشی، ج٤/ ل٦١؛المقريزي: الخطط، ج٢/ ل٢١١.

(٥). پۆست: بریتی بوو لە گواستنەوەی نامەو هەواڵ بە ئەسپ و حوشتر، ئەگەر ئەمانەیش نەبوونایە بە پیادە دەیان گواستەوە. پۆستە یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی گواستنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناوخۆو دەرەوە، ئەم هۆکارەش لەلایەن زەنگیەکانەوە گرنگی یەکی زۆری پێ دەدرا.ئەم شێوەیەش تا هاتنی نەوەی ئەیوبییەکان و تا کۆتایی هاتنی دەوڵەتەکەیان هەر بەردەوام بەکاریان دەهێنان، گرنگیەکی زۆریان بە هەواڵی دەوروبەرو ئەو ڕووداوانەی کە بەسەریاندا دێت دەدا تەنانەت لە کاتی شەڕیشدا بەردەوام بوو، بە تایبەت لەلایەن هێزی دەوروبەری پاشا (دەرگاه)وە، و کە هەموو شتێکی دەربارەی پاشاکان پێدەگەیشت لەکاتی شەڕو ئاشتی ئاگادار دەکرایەوە هەروەها لەهەموو کارێک لە شەو و ڕۆژدا دەیانکرد، هەموو ڕۆژێکیش لە لایەن سیخوڕەکانیەوە هەواڵی پێ دەگەیشت. (أبن الاثير: الباهر، ل٨٧؛ القلقشندی: صبح الاعشی، ج٤/ ل٣٧؛ العمري: المصطلح الشريف، ل٢٥٤). بۆزیاتر زانیاری بڕوانە( امين: الاستخبارات الايوبيه، ل٢٩٤-٢٩٦؛ حسين: الجيش الايوبی، ل١٧٣-١٧٤).

**٣-ئاگردان.[٢]**

سوڵتان (نورالدین محمود) بۆ یەکەمجار کۆتری نامەبەری بۆ گەیاندنی نامەی حکومی بەکارهێنا،[٣] دوای ئەوەی بینی حکومەتەکەی بەرەو فراوانی دەڕۆیشت، خاچ دروشمەکانیش لەدەوریان بوون، کەهێرشیان دەکردە سەر وڵاتێک لە وڵاتەکانی پێویستی بەگەیشتنی هەواڵی ئەو ناوچەیە دەبوو بەئەوەی رزگاریان بکات.

بەم هۆیەوە بوو لە ساڵی (٥٦٧ک/١١٧١ز) لەسەردەمی وەزارەتی سەلاحەددیندا بڕیاری دروستکردنی وێستگەیەک لەسەر گرنگترین ڕێگەکانی وڵاتدا درا، و چەندین فەرمانبەرو راهێنەری شارەزای بۆ دامەزرێنرا، نامەکەشیان لەسەر پەڕۆیەکی تەنک دەنوسی و بەتیرێک بەبن باڵی کۆترەکانەوە دەبەست و بۆ شوێنی مەبەستیان دەنارد، قۆناغ بە قۆناغ لەکۆترێکەوە بۆ کۆترێکی تر دەیانگواستوە تاکو دەگەیشتە ئەو شوێنەی کە (نورالدین محمود)ی لێبوو، سەلاحەددین بایەخ و گرنگی کۆتری نامەبەری دەزانی، بۆیە چەندین ویستگەو هێڵی ئاسمانی لەنێوان فەرمانڕەواکانیدا لەشام و مصر ڕێکخست.[٤] لە چوارچێوەی کارو چالاکیەکانی چۆن گرنگی بەکاروباری شام دەدا، هەروەها گرنگی بە کاروباری مصریش دەدا، و زۆر هەوڵی دەدا بە خەڵکی شام بڵێت کە ساغ و سەلامەتە و بە ماوەیەکی کەم گەیشتۆتە مصرو دڵنیایان بکاتەوە، بۆیە سەلاحەددین بە کۆتری نامەبەر نامەکانی بەخێرایی دەنارد، بەمەبەستی پوچەڵ کردنەوەی ئەو پڕوپاگەندانەی کە دژی سەلاحەددین دەکران و بڵاودەکرانەوە. هاوکات (العماد الکاتب) دەگێڕێتەوە هەر بەگەیشتنی بۆ شاری قاهیرە بڕیاریدا بە نووسینی نوسراوێک بۆ لایەنی پەیوەندیدار لە وڵاتی شام و تیایدا وتی: "بۆ پووچەڵ کردنەوەی پڕوپاگەندەکان، و گۆڕینی ئەو

---

(١). کۆتری نامەبەر (الحمام الزاجل): دەتوانین بە پۆستی ئاسمانی ناوی بنێین لە دەوڵەتی ئەیوبی، لەبەر ئەوە دەوڵەتان لەسەر ئەم جۆرە پۆستە ڕاهاتبوون پێش دەرکەوتنی دەزگا پەیوەندی یە نوێیەکان بە تایبەتی لە کاتی شەڕەکاندا بەهۆی تیژی بیری و خێرایی فڕینی و گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی ئەگەر چەند ساڵێک لەو شوێنەوە دووربێت. (أبو شامة: الروضتین، ج١/ ل٥٢١؛ ئەمین: الاستخبارات الایوبیة، ل٣٠٠). (بۆزیاتر زانیاری بڕوانە امین: الاستخبارات الایوبیە،ل٣٠٠؛ حسین: الجیش الایوبی، ل١٨٠-١٨٩).

(٢). ئاگردان: شوێنێکە بۆ بەرز کردنەوەی ئاگر لە شەودا و دوکەڵ لە ڕۆژدا بۆ بە ئاگا بوون لە جموجۆڵی دوژمن. (المقریزي: الخطط، ج٥/ ل١٩).

(٣). العمري: المصطلح الشریف، ل٢٥٤؛ المقریزي: الخطط، ج٢/ ل٢٣١.

(٤). العمري: المصطلح الشریف، ل٢٣٤؛ المقریزي: الخطط، ج٢/ ل٢١١، ٢٣١.

مەترسیانەو بۆ دڵنیایی، هەواڵی مژدە بەخشمان پێدا ڕەوانە کرد".[1] هەروەها لە ڕەمەزانی ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) سەلاحەددین بە کۆترێک نامەیەکی نارد بۆ (حلب)، و (حماه) و لەوێوە بۆ (عکا)، تاکو جێگرەکەی (الملک القاهر) باڵا دەستی (حلب) لە هێرشی خاچ دروشمەکان ئاگاداری بکاتەوە کە بەهۆی بێهێزی و سستی سوپای ناوچەکەوە هێرشیان کردبووە سەر ئیمارەتی (أنگاکیە)ی نزیک (حلب)، بەهۆی ئەوەی سوپاکەیان لە (عکا)بوو، بەڵام هێزە یەدەگەکانی (حلب) توانیان شکست بە دوژمن بهێنن و نەهێڵن بە خۆیان بزانن تا شمشێریان لە ڕوویاندا هەڵکێشا و (٧٥) سەربازیان لێکوشتن و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گرتن.[2]

هەروەها لەکاتی گەمارۆدانی خاچ دروشمەکاندا بۆ شاری (عکا) لە نێوان ساڵانی (٥٨٥-٥٨٧ک/١١٨٩-١١٩١ز)دا بەردەوام بە ڕێگای ئەم جۆرە کۆترانەوە هەواڵی موسڵمانە گەمارۆ دراوەکانی پێ دەگەیشت. بەهەمان شێوە بە پێچەوانەشەوە لە سەلاحەددینەوە بۆ دانیشتوانی ئۆردوی (عکا). (القاچی الفاچل) وەسفی ئەو کۆترانە دەکات و دەڵێ: "کۆترەکان فریشتەی پاشاکانن".[3] ڕۆڵی کۆترەکان بەو فریشتانە دەچووێنێ کە دادەبەزنە سەر پێغەمبەران، ئەمە جگە لەوەی کە هەواڵ و ئەمانەتی گرنگیان دەگەیاند، هاوکات لە خیانەت کردن دوور بوون.

ئەوە باسی خێرایی پۆستە بوو، کە باڵی کۆترەکان لە بارودۆخی شەڕ لەگەڵ خاچ دروشمەکاندا گەیەنەری هەواڵ بوون، ئەوەی کە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو کارێکی سەربازی پێویست بوو بۆ پووچەڵ کردنەوەی پیلانەکانی دوژمن لە باری ئاسایی دا بەپۆستدا بە حوشتر و ئەسپ دەنێردرا.

بەم شێوەیە سوڵتان سەلاحەددین بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی بۆ زیاتر ئاگادار بوون لە هەواڵەکانی دەوڵەتەکەی، گرنگی زۆری بەم شێوازە دەدا(واتە پشت بەستن بە کۆتری نامەبەر).

مردنی (نورالدین محمود) ڕێگەی بۆ خاچ دروشمەکان خۆش کرد کە دەست بخەنە نێو کارو بارو کێشە نێو خۆییەکانی وڵاتی شام، بەهۆی ئەو بارودۆخەوە

---

(١).أبو شامە: الروضتین، ج١/ ل٢٧٤.

(٢). أبن شداد: النوادر السلطانیة، ل١٤٣. کورتی و وردی لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانی کۆترە نامە بەرەکان بوو، هاوکات (بسم الله)و پێشەکی و نازناو هەمووی هەڵدەگیران تەنها کات و مێژوو دیاری دەکراو بەهێڵێکی باریک دەنووسرا،و قەبارەی ئەم نامە ئاسمانیانە یەقەدەر نینۆکی پەنجە دەبوو بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (العبادی: دراسات فی تاریخ الحضارە العربیة، ل١٧٠؛ ویست: الحروب الصلیبیة، ل١٧٨.

(٣). أبو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٠٥؛ ابن قاضی شهبة: الكواكب الدریە، ل٢١٥.

سەلاحەددین لە مصرەوە بەرەو وڵاتی شام بە مەبەستی جیهادو پاک کردنەوەی وڵات لە خاچ دروشمەکان کەوتە ڕێ. کە مەبەستی پشتگیریکردنی (الملک الصالح اسماعیل)[1] بوو دژ بە دوژمنی دەرەکی و لەناوبردنی ئەوانەی هاوکاری خاچ دروشمەکانیان دەکرد لەدژی مسوڵمانان.[2]

ئەوەی کە ئاشکرایە میرەکانی دیمەشق لە پشتگیری کردنی سەلاحەددین دڵنیا نەبوون، هەر لەبەر ئەوەش پەیمانەکەیان لەگەڵ خاچ دروشمەکان پووچەڵ نەکردەوە، بۆیە سەلاحەددین لە ڕێگەی ڕاگەیاندنی دەروونییەوە هەوڵی دا ڕای گشتی دژیان کۆبکاتەوە، بۆ ئەومەبەستەش زانایانی ئاینی بەکاردەهێنا، بۆ نموونە داوای لە (شێخ أبن أبی عصرون)[3] کرد کارێک بکات موسڵمانانیان لێ بە ئاگا بهێنێ، و پتر مەبەستی سەلاحەددین لەو کارە چوونی بۆ وڵاتی شام بووە، چونکە دەیزانی کە زانایانی ئاینی زیاتر کار دەکەنە سەر خەڵک، بۆیە سەلاحەددین بۆ شەڕی نوریەکان پشتی بەیەکێ لەو زانایانە بەست، ئەمەش لە وتەیەکیدا دەردەکەوێت کە دەڵێت:"فأن بلسانه تغمد السیوف"[4] واتا" بەزمانی شمشێر دەوەستێ". سەلاحەددینی ئەیوبی لە کاتی کردە سەربازیەکانی ڕووی کردە (صیدا) و لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی (سوپاکەی سەلاحەددین) لە ٢١ جمادی یەکەم ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) شارەکە خۆی بەدەستەوەدا. لەدواییدا ڕووی کردە بەیروت دوای ڕۆژێک ئابڵوقەی داو لەو کاتەدا پڕوپاگەندەیەکی زۆر بڵاوببویەوە کە گوایە سوپای ئەیوبی چوونەتە نێو شارەکە و سەرکردەکانی خاچ دروشمەکان سۆراخی ئەم

---

(١). الملک الصالح اسماعیل: کوڕی (نورالدین محمود)ە، (٥٥٨-٥٧٧ک/ ١١٦٢-١١٨١ز)، لەپاشاکانی بنەماڵەی زەنگیە لەشام و جەزیرە، پاش کۆچی دوایی باوکی ساڵی (٥٦٩ک/١١٧٤ز)، دەسەڵاتی (دیمەشق و حلب)ی گرتە دەست لە تەمەنی (١١) ساڵیدا، بۆیە میر (شمس الدین محمد بن عبدالملک بن المقدم بن خلدون) کاروباری دەوڵەتەکەی بۆ دەبرد بەڕێوە، لەتەمەنی (١٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. (سبط أبن الجوزي: مرات الزمان، ج٨/ ل٣٦٦؛ المقریزي: السلوک، ج١/ ل١٦٧؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج٦/ ل٨١-٨٢).

(٢). کاتێک خاچ دروشمەکان هێرشیان کردە سەر (بانیاس) لە پاش مردنی (نورالدین محمود) لە کۆتایی مانگی شەوالی ساڵی (٥٦٩ک/١١٧٤ز) گەمارۆیان دا. (أبن المقدم) بەمەستی ڕێککەوتن بۆ لایان دەرچوو بەمەرجێک پارەیەکی زۆریان پێدا هاوکات دیلەکانیان ئازاد بکات. (نوری: سیاسة صلاح الدین، ل١٢٨).

(٣). شیخ بن ابي عصرون: دادوەری شارەکانی (شەنگار و نصیبین و حەران)بوو، لە ساڵی (٥٤٥ک/١١٥٠ز) گەیشتە شاری حلب و لەگەڵ نورالدین محمود چووە شاری دیمەشق لە کاتی رزگارکردنی ساڵی (٥٤٩ک/١١٥٤ز) ، چەند پۆستێکی وەرگرت لە ناوەوە و دەرەوەی شاری دیمەشق، لە ساڵی (٥٧٣ک/١١٧٧ز) بوو بە داوەری داوەرانی شاری دیمەشق، پێش مردنی بە ١٠ساڵ چاوەکانی لە دەست دا. (ابن تغري بردي:النجوم الزاهرة، ج٦/ ل١١٠).

(٤).سبط ابن الجوزي: مرات الزمان،ج٨/ ل٣٢٤؛ابو شامة:الروضتین، ج١/ ل٢٣٣.

مەسەلەیان کرد بۆیان دەرکەوت کە پروپاگەندەیە، و سوپاکە نەهاتوونەتە نێو شارەکە و ویستیان خەڵکەکە هێور بکەنەوە بەڵام نەیان توانی، چونکە خەڵکەکە ترسێکی زۆریان لێ نیشتبوو بەهۆی ئەو پروپاگەندانەی کە لەناویاندا بڵاودەکرایەوە، هەربۆیە ناچار بوون داوای ئاسایش و ئارامی لە سەلاحەددین بکەن. سوڵتان بەدەنگ داواکەیانەوە چوو و لە ٢٩ی جمادی یەکەمی ساڵی ٥٨٣ ک/ ١١٨٧ز)دا شارەکە درا بەدەستی مسوڵمانەکانەوە.[(١)] بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو سەرکەوتنە ئەنجامی ئەو پروپاگەندانە بوو لە شارەکەدا دەکرا. هەروەها نووسەرەکان (الکتاب) ڕۆڵێکی ڕاگەیاندنی دەروونی گرنگیان بینی لەسەردەمی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبیدا لەنێو ئەو نوسەرانەشدا (القاچی الفاچل) کە سوڵتان ستایشی کرد کاتێ بۆ مجاهیدەکان دواوەو ووتویەتی: "وا هەست نەکەن کە من بە شمشێری ئێوە توانیومە دەست بەسەر وڵاتدا بگرم، بەڵکو بە پێنوسەکەی (الفاچل) توانیومە ئەم کارانە ئەنجام بدەم".[(٢)] الفاچل وەسفی جەنگی ئازایانی گەلەکەی دەکات و لەوانەش وەسفی شمشێرەکەی سەلاحەددین دەکات و دەڵێ:

ماچیات علی الدوام دوامی هی فی النصر نجده الاسلام

فی یمین السلگان اژا جردتها أشبهتها صواعق فی غمام[(٣)]

(القاچی الفاچل) بوو بە زمانحاڵی گەل و لەسەر زاری سەلاحەددینەوە بۆ خەلیفەو پاشاو میرەکان قسەی دەکرد. ڕووداوەکانی وڵاتی تۆمار دەکرد و بڵاوکراوەکانێ پەخش دەکردو وێنەی جەنگەکانی دژی خاچ دروشمەکان دەکێشا و نامەی سەرکەوتنەکانی دەنووسی، هەروەها وەسفی شوراکان و جەنگەکانی دەکرد، بۆیە نامەکانی لە پالأ بایەخە ئەدەبیەکەیدا بایەخێکی مێژوویيان هەیە.

(العماد الکاتب)یش وەک گەواهیدەرێک بەشداری دەکات، کەخۆی شتەکانی دەبیست و وەسفی جەنگەکانی دەکرد و دەربارەی سەلاحەددین دەیگوت: "لە

---

(١). ابن الاثیر: الکامل ، مج٧/ ل٣٣٠؛ أبو الفداء: المختصر، ج٢/ ل١٥٦.

(٢).المقریزي:الخطط،ج٢/ ل٣٦٦؛ ابن العماد: شذرات الذهب، ج٤/ ل٣٢٤.

(٣). العماد الکاتب: خریدة القصر-قسم شعراء مصر، ج١/ ل٣٥. واتە:

هەردەم لەسەر کارەکانی لێوەشاوە و لێهاتوو بووە

کە لە سەرکەوتندا هەردەم فریاد ڕەسی ئیسلام بووە

ئەو شیرەی کە لەلا ڕاستی سوڵتان بکێشایە

شێوەی هەورە بروسکە لە ئاسمانێکی هەوراوی

خزمەتـی دابـووم و لەتەکیـدا دەڕۆیشـتم و لەتەکیشـیدا دادەبەزیـم".[1] سـەردەمی سـەلاحەددین بەهێزتـرین سـەردەمی بەرەنگـار بـوونەوەی دوژمـن بـوو و پڕبـوو لەسەرکەوتنی سەربازی بەشێوەیەکی ئەدەبی سەرکەوتنەکانی سەلاحەددینی تۆمـار کـردووەو بەهـۆنراوەش وەسـفی ئەم سـەرکەوتنانەش دەکـات، لەوانەش لە پـارچە هۆنراوەیەکدا کە باس لە ڕزگار کردنی قودس و شام دەکات وەسفی سـەلاحەددین دەکات و دەڵێت:

رأيت صلاح الدين أفچل من غدا

وأشرف من أچحى، وأكرم من أمسى

وقيل: لنا فى الارچ سبعه أبحـــر

ولسنــــا نرى الا أناملـــه الخمسا[2]

(العمـاد الكاتـب) شـەڕەکانی (نورالـدين و صـلاح الـدين)ی تۆمـار کـردووەو و شـاعيران هۆنراوەيـان پيـا هەڵـداوە و لەسـەر زمـانی ئەوان نـامەی نووسـيوە و بەدەستی خۆی مژدەی سەرکەوتنەکانی دەنووسی، کاتێک کە دوژمـن لە (عکا) شـکا سی يان چل مژدە نامەی نووسی،[3] لە کاتی ڕزگارکردنی قـودس، حەفتـا نوسـراوی مژدە بەخشی نوسی کەبەسـەر خەڵکيدا لە مزگەوتەکانـدا دەخـوێنرانەوە،[4] لەوانەش نوسـراوەکەی بـۆ (الـديوان) لە بەغـدا کەسـەرەتاکەی بەمُ ئـايەتە دەسـت پێـدەکات، دەڵێت: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّزِينَ يَمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى الْأَرْچِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّزِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّزِى ارْتَچَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً﴾.[5] لەکاتی شيکردنەوەی نامەی نوسەردا دەردەکەوێت کەسـەرەتا بە ئـايەتێکی قورئـانی پيـرۆز دەسـتی پێکـردووەو دوای ئەوەی سوپاسـی خـوای کـردووە بـۆ ئەو سەرکەوتنەی بەسـەر کافرەکانـدا و گەڕانەوەی قـودس بـۆ ژێـر دەسـتی موسـڵمانان، نامەکە بەردەوام دەبێت لە دەرخستنی گەورەيـی ئەو سـەرکەوتنە تاوەسـف کردنـی هەموو سـەرکەوتنەکان کۆتايی دێت جگە لە (صور) کە نوسـەر مزگێنی ئەوە دەدات

---

(١).العماد الكاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٥.

(٢). العماد الكاتب: خريدة القصر، بداية قسم شعراء الشـام، ل٣٤-٣٧، ٥٤-٥٦؛ خريدة القصـر- قسـم شـعراء مصر، ل٦-٩. واتە:

(٣).ابو شامة: الروضتين،ج٢/ ل٩٦.

(٤).هەمان سەرچاوە، ل١٥٩.

(٥). واتە :"خوا بەوانەی لە ئێوە بڕوايان هەيە و ئاکار و چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمينە دەيانکاتە جێگە نشين ، هەروەکو چۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێنشين. دينەکەشيان - کە خۆی پەسـەندی کردووە- هەر بۆيـان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشيان بۆ دەکاتە دڵنيايی".(سورەتی نور، ئايەتی ٥٥، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار).

که بەم زوانە ڕزگـار دەکرێـت و ئەم نـامەیە بە پەخشـانێکی سـەروادار (السـجع) نووسراوە.[1]

هەروەهـا هـاوەڵێکردنی زانایـان و سـۆفیەکان بـۆ سـەلاحەددین لە کـاتی ڕزگـار کردنی (بیت المقدس)دا ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) کە خەڵکیان هان دەدا بۆ جیهاد کردن و حەماسـەتی خەڵکیـان بەرز دەکردەوە، و مژدەی سـەرکەوتنی نزیکیـان بە خەڵـک دەدا کە نـزیکەی (٩١) سـالأ بەدەسـتی خـاچ دروشـمەکانەوە دیل بووە کە لە سـاڵی (٤٩٢ک/١٠٩٨ز) دەسـتیان بەسـەری داگرتبـوو، لەم بـارەیەوە (أبـن شـداد) دەڵێـت: "سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا، خەڵکێکی زۆر لە ئەهلی زانست و پەیڕەوکەرانـی تەریـقەت کاتێـک بیسـتیان کە خـوای گەورە لەسـەر دەسـتی سـوڵتاندا سـەرکەوتنی بەدەست هێناوە، لە کەنارەکان و قودس دا بە سوپاسگوزاری و نزاو پاڕانەوە بۆ ئەو سەرکەوتنە بەرز بووبۆوە".[2]

لەو زانایانەی کە ڕۆڵێکی گرنگیان لە وشیار کردنەوەی خەڵکی بۆ جیهادو بەرز کردنەوەی ورەیان بۆ ڕزگار کردنی وڵاتی شام بینی (الحسین بن عبدالله بـن رواحه الانصـاری) [3](ت٥٨٥ک/١١٨٩ز) بـوو، کە یەکێکە لەو زانـا بەنـاو بانگـانەی کە شـان بەشانی سەربازانی ئیسلام دژی دوژمنـان دەجەنگـان و ڕۆڵێکی گرنگیـان هەبـوو لە کۆڕی ڕێنمـاییە ئاینییەکـان و وەڵامـدانەوەی خەڵکی و خەڵـک خسـتنە سـەر ڕێگـای ڕاسـت و بانگەشـەیان بـۆ جیهـاد کـردن و بەرز کـردنەوەی ورەیـان دەکـرد، کە لەشەڕی خاچ دروشمەکان شەهید بوو.[4]

خـۆ ئامـادەکردنی دەروونـی و هێرشـی ڕاگەیانـدن بـۆ یەکخسـتنی هێـزە ئیسـلامیەکان و و جیهـاد کـردن کـارێکی سـانا نەبـوو، گیـانی خۆ بەدەستەوە دان و دووبەرەکـی زۆر بەربـڵاو بـوو بەتـایبەت لە نێـو بەرپرسـە ناوخۆییەکانـدا، بەڵام لێهاتوویی و دڵسۆزی وای کرد کە خەڵک وشیار بکاتەوە و ڕای گشتی فشار بخاتە

---

(١). بروانە دەقی نامەکە لە پاشکۆی ژمارە(١) ی ماستەر نامەی (ئاراس فریق زینل:جەنگی دەروونی لە سەردەمی سەلاحەددیندا)..

(٢). النوادر السلطانیة، ل١٨٢.

ج

(٣). الحسین بن عبدالله بن رواحه الانصاری: لە سـاڵی ٥١٥ک/١١٢١ز لە دایک بووە باوکی وتـاربێژی حمـاه بوو، ماوەیەک بە دیلی لای خاچ دروشمەکان مایەوە ، لە ساڵی ٥٨٥ک/١١٨٩ز لە شـەڕی عکا کوژرا.(الكتبی: فوات الوفیات، ج١/ل٣٧٦-٣٧٧).

(٤). الصفدي:الوافي بالوفیات، ج١/ ل٣٧٦.

سەر بەرپرسە ناوخۆییەکان. سەلاحەددین هەوڵی دەدا بزوتنەوەی جیهادی بۆ ڕزگار بوون فراوان بکات و هەموو جیهانی ئیسلامی تێیدا بەشدار بێت.(١)

ئەمە سەرەڕای ڕۆڵی مزگەوتەکان لە ڕووی ڕاگەیاندنی دەروونییەوە، چونکە مزگەوت لە ڕۆژانی هەینی‌دا شوێنی گوتار بێژی بوو، لەکاتی نائاساییدا خەڵکیان بۆ گوێگرتن لەو گوتارانەی کە بەو بۆنەیەوە دەدرا کۆدەکردەوە، وەکو ئەوەی لە دوای مردنی (الملک الصالح أسماعیل) ساڵی (٥٧٧ک/١١٨١ز) و جوڵەی خاچ دروشمەکان لە (دمیاگ) کەدەیانوویست دەست بەسەر مصردا بگرن، لەسەربازەکانەوە نوسراوێک لەو بارەیەوە بۆ قاهیرە چوو و لەمینبەری مزگەوت خوێنرایەوە کە بەم ئایەتە دەستی پێ دەکرد:: ﴿انْفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(٢) ئەو نوسراوە ڕێنمایی و ئامۆژگاری زۆری تێدا بوو کە هانی خەڵکی دەدا بۆ جیهاد لە پێناوی خودا و بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی مصرو قاهیرە دەست بەگریان و باوکەڕۆ بکەن، و خۆیان پێ نەگیراو ژمارەیەکی زۆریان بۆ جیهاد کردن دەرچوون.(٣) هەندێک جاریش گوتار لە مزگەوتەکاندا نەدەخوێنرایەوە ئەمەش بەگوێرەی پێویست بوو. (أبن شداد) لە وەسفی شەڕی (عکا)دا، دەیگێڕێتەوە کە سەلاحەددین میرو خاوەن ڕایەکانی لە خێوەتەکەی خۆیدا کۆ کردەوە و پێی وتن کە گوێ لە قسەکانی بگرن و پاشان وتی: "بەناوی خوا، سوپاس بۆ خوا، درود لەسەر پێغەمبەری خودا، بزانن کە ئەم دوژمنە دوژمنی خودا و دوژمنی ئێمەیە، و هاتوونەتە وڵاتمان، و پێیان ناوەتە ناو خاکی ئیسلام، و خەریکە بەتەواوی بەسەریانا سەردەکەوێ، پەنا بە خودا، ژمارەیەکی کەمیان ماوە، و دەبێ گرنگی بدرێت بە ڕیشەکێش کردنیان، وخوا فەرمانی ئەوەی پێ کردووین، ئێوە دەزانن کە ئێمە و سوپاکەمان هیچ شتێکمان بەدواوە نی‌یە کە بگاتە فریامان، تەنها (الملک العادل) نەبێت ئەویش بەڕێگەوەیە، ئەم دوژمنە ئەگەر بمێنێ و دەست بەسەر دەریادا بگرێت پشتیوانی زۆر پەیدا دەکات، ئەمە بۆچوونی منە، و هەر کەسێکیش بۆچوونی لەم بارەیەوە هەیە با پێمان بڵێت".(٤)

---

(١). الجنحاني: حطين رمز الوحدة والتحرر، مجلة المؤرخ العربي، العدد (٣٩)، السنة ١٥، ١٩٨٩، ل١٨٠.

(٢). واتە:"سوکبارین یان گرانبارین ، بۆ غەزایە ڕێ دابگرن و لە گیان و ماڵ بەخت کردن درێغ مەکەن. گەر بزانن هەر بە قازانجی خۆتانە".(سورەتی تەوبە، ئایەتی ٤١، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار).

(٣). المقريزي: الخطط، ج١/ ل٣٥٦.

(٤). النوادر السلطانية، ل٩٧.

(أبن شداد) له وەسفی گەمارۆی قودس دا له لایەن دوژمنەوە دەڵێت: "کۆمەڵێ میر له خێوەتی سوڵتان کۆبوونەوە و پێی وتم که قسەیان لەگەڵدا بکەم و هانیان بدەم بۆ جیهاد و ئەوەی خودا بۆی ئاسان کردم پێم وتن و بەقسەیان کردم".[1]

نابێ ڕۆڵی ڕاگەیاندنی دەروونی شاعیرانی سەردەمی سەلاحەددین لەیاد بکەین. کاتێ که هێرشە توندەکانی خاچ دروشمەکان بۆ سەر شام دەستی پێکرد هانی شاعیرانی دەدا که هۆنراوە بنووسن و بەشان و باڵی ئەو سەرکردانەدا هەڵا بدەن که مسوڵمانانیان له حاڵەتێکی شکست و بێ هیواییەوە گەیاندە حاڵەتی ڕاپەڕین و بەرهەڵستی کردنی داگیرکاری و سەرکەوتن و بەتەواوی دوژمنیان له وڵاتدا دەرکردووە. هەر لەسەرەتاوە که سەلاحەددین هاوڕێیەتی (اسدالدین شێرکۆ)[2]ی مامی دەکرد لەکاتی هێرشەکانی بۆ سەر مصر تا گرتنە دەستی سەرکردایەتی، هەموو هەوڵێکی بۆیەکخستنی بەرەی ئیسلامی بووە له چوارچێوەی ئامانجە دەروونیەکانیدا و شاعیرانی مصرو شام هاوڕێی بوون و وەسفی سەرکەوتنەکانیان دەکرد و شانازیان به سوپاکەیەوە دەکرد، لەوانە (أبو محمد فتیان)(٥٣٠-٦١٥ک/١١٣٥-١٢١٨ز)[3] که وەسفی سەلاحەددین و توانای سوپاکەی و شکاندنی خاچ دروشمەکانی له (دمیاگ) ساڵی (٥٦٥ک/١١٦٩ز) دەکرد. هەروەها (سبع بن خلف) ی شاعیریش وەسفی جیهادی سەلاحەددین لەدەست بەسەرا گرتنی دیمەشق له ساڵی (٥٧٠ک/١١٧٤ز) دەکات، دواتریش دەست دەکات بەیەکخستنەوەی بەرەی ئیسلامی و گێڕانەوەی داستانە مێژووییەکانی سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا به نەمری هێشتنەوەی شەڕکەرو ناودارەکانی سوپای سەلاحەددین.

له ڕوانگەی ئەوەی باسکراو سەرکردەکانی ڕای گشتی ئیسلامی له سەردەمی سەلاحەددین لەنوسەرو زاناو گوتار بێژو شاعیران له ڕووی ڕاگەیاندنەوە کردیان، بووە هۆی ئەوەی گیانی جیهادی له خوێنی موسڵمانان بچەسپێ و بەزوویی ئەو

---

(١). هەمان سەرچاوە، ل٢١٢.

(٢). اسدالدین شیرکو: ناوی (شیرکو بن شادی بن مروان) وەزیری خەلیفە (العاضد)ی فاتمی بوو له مصر، شێرکو بەواتای (اسد الجبال-شێری چیاکان) دێت، سەرکردایەتی سێ هەڵمەتی کرد بۆ وڵاتی مصر له ساڵی (٥٥٩ک/١١٦٤ز) که به هەڵمەتی یەکەمی سەر مصر ناسرا، و هەڵمەتی دووەم له ساڵی (٥٦٢ک/١١٦٧ز)، و سێیەم له ساڵی (٥٦٤ک/١١٦٨ز)، شایەنی باسە تەنها دوو مانگ و پێنج رۆژ له وەزارەت مایەوە و له ٢٢ی جەمادی الاخرە ساڵی (٥٦٤ک/١١٦٨ز) کۆچی دوایی کرد. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە ( عطا عبدالرحمن محی الدین: ئەسەددین شێرکۆ ژیاننامە و ڕۆڵی له شەڕی خاچییەکاندا ).

(٣). أبن خلکان: وفیات الاعیان، ج٤/ ل؛٢٤ العماد الکاتب: خریدة القصر-قسم شعراء الشام، ج١/ ل٢٤٧.

بانگەشـەیەی کە ئەو ڕووناکبیرو خاوەن بۆچوونانە سـەرکردایەتیان دەکرد بـووە بزووتنەوەیەکی میللی بەهێز، لەسـەرووی هەموویـانەوە سـەلاحەددینی ئەیـوبی کە دەوڵەتێکـی دامەزرانـد، قەڵەمڕەوەکەی لە حەلەبەوە درێـژ دەبـۆوە تـاکو ڕووبـاری فـوڕات لە بـاکورەوە تـا قـاهیرە و ڕووبـاری نیـل لە باشـوورەوە و لە خـۆ ئامادەکردنیشدابوو بۆ پەلاماردانی خاچ دروشمەکان لە شام،[1]ڕاگەیاندنی دەروونی لەسەردەمی شـەڕو ئاشتی‌دا هاوپەیمانی دبلۆماسی یە، ئەمەش چەکێکی کاریگەرە کە لەسـەرخۆیی و ئـارام گـرتن لەگرنگتـرین خاسـیەتەکانیەتی، هاوکـات لەوێ دەردەکەوێت کە پیشاندانی هێز بۆ دوژمن و ترساندنی لە کاتی شـەڕو ئاشتی دا چەندین ئامـانج دەستەبەر دەکات، خۆئامـادەکردن و هێز پێکەوە نـان ئامانجەکانی ڕاگەیاندنی جەنگی دەروونین، ئەویش لە ڕێگای ترس بردنە دڵی دوژمنەوە کە وای لێبکات زات نەکات بجوڵێتەوە. بۆ نمونە لە ڕۆژی (٨ی محرمی سـاڵی ٥٦٧ک/١١ی ئەیلولی ١١٧١ز) لە قـاهیرە نمایشـێکی سـەربازی بـۆ هێزە سـەربازییە مصـریەکان ئەنجام درا، سەلاحەددین ئەو کاتە هێشتا وەکو وەزیری خەلیفەی (فاتیمی)و جێگری (نورالدین محمود) بوو لە مصـر.. نێردراوی (بیزنگە و خـاچ دروشـمەکان) ئامـادەی ئەو نمایشە بوون، ڕۆژو شەوێک بەردەوام بوو ژمـارەی ئەو سوپا ڕێکخـراوەی کە ئامـادەی نمایشـەکە بـوو (١٤٧) (گلـب)[2] بـوو، [3]نەهاتوەکـانیش (٢٠) (گلـب) بـوون، ژمـارەی ئامـادە بـووانیش گەیشـتە (١٤) هەزار، سـوارەکان زۆربەی زۆریـان لە

(١). ئەوەش دوا قۆنـاغ بـوو لە قۆناغەکانی یەک گرتنی بەرەی ئیسـلامی دوای رزگـارکردنی حەلەب سـاڵی (٥٧٩ک/١١٨٣ز) سـەلاحەددین خـۆی ئامـادەکرد بـۆ ڕوو بەڕووبـوونەوەیەکی بەر بـلاو لە دژی خـاچ دروشـمەکان. لەو کـاتەدا خـاچ دروشـمەکان لە دوورگەی (سـینا) چەنـد هێرشـێکیان کـرد تـاکو گەیشـتنە ناوچەکانی (السویس)، هەروەها هەندێ هێرشیان کردە سـەر (تیماء) لە باکووری نیمچە دوورگەی عەرەبی، وای‌کرد (أرناط) میری (الکرک) دەریای سوور دابەش بکات و هەوڵی داگیرکردنی مەککەو مەدینەش بدات بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی ڕێگەکانی بازرگانی نێوان ئاسیاو مصر، ئەوە بوو هێرشی کردە سـەر هەندێک لە بەنـدەرەکانی مصـرو حیجـاز، بەڵام کەشـتی گەلی مصـری تـوانی شکسـت بە هەوڵەکـانی بهێنێت. بڕوانە (البنداري: سنا البرق الشامی، ل٢١٢، ٢١٣).

(٢). طلب: ووشەیەکی کوردییە بە واتای میر دێت کە فەرماندەی (٢٠٠) سوار دەکات لە گۆڕەپانی شەڕدا، هاوکات بە فەرماندەیی (١٠٠ یان ٧٠)یش دەوترێت، بۆیەکەم جار ئەم زاراوەیە لە مصرو شام لەسـەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبی بەکارهاتووە، پاشـان واتاکەی گۆڕا بـۆ (کتیبە- تیپ). (المقریزی: السلوک، ج١/ ل٢٠٧ پەراوێزی ١).

(٣). أبن شداد: النوادر السلطانیة، ل٢٤٠؛ا.ر.جب: صلاح الدین الایوبی، ل١٦١.

گواشـیەکان) [١]بـوون، بەڵام ئەوانـی تـر لە سـوپاکە لە (قەراغلامیەکـان) [٢]بـوون، سەرباری گالیسکەکان کە پاشکۆی سوپاکە بوون.[٣]

بەم شـێوەیە سـەلاحەددین لە جێبەجـێ کردنـی ئامانجەکەیـدا سـەرکەوتوو بـوو، ئەویش ئاراستە کردنی جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی دژ بە خاچ دروشمەکان بـوو، بۆ نمونە لەماوەی پێشڕەویان لە ڕێگەی پلانێکی زیرەکانەوە، کە سەلاحەددین خۆی داینا بوو تێیدا هۆکاری پەلامـاری لەناکاو، و خسـتنە ڕووی هێزو پێشـڕەوی بەرەو (حگین)،[٤] لە نمایشێکی سەربازیدا بۆ پەشـۆکاندنی خـاچ دروشـمەکان و پەکخسـتنی عەقڵ و هێزیان کە بووە هۆی دروست کردنی درزێک لە هاوسـەنگی دەروونیاندا و متمانەیـــان لە ئەرکـــی ڕوو بەڕوو بـــوونەوە یـــان ســـەرکەوتن بەســـەر ســـوپای سـەلاحەددیندا جـێ لەق کـرد، ئەمە بـووە هـۆی بەتـاڵ کردنەوەیـان لە ئیـرادەی ڕووبەڕوو بوونەوەدا.[٥] وەکو لەم ئایەتەدا هـاتووە﴿سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرَّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾.[٦] بێگومـان گرنگتـرین ئامانجەکـانی سـوپا ڕووخاندن و تێکدانی گیانی ورەی سوپای دوژمنە، بە ڕێگەی کردە سـەربازیەکان، یـان بە ئامرازەکـانی ڕاگەیانـدنی دەروونـی، چـونکە سـوپای شـەڕکەر هەوڵ دەدات ئامرازی خۆ ئامادەکردن وەربگرێت بۆ سەربازەکانی، دوای ئەو سـەرکەوتنەی خـاچ دروشمەکان لە شەڕی (الرملە)دا بەسـەر ئەیوبیەکاندا بەدەسـتیان هێنـا، سـەلاحەددین گەڕایەوە وڵاتی شام و فەرمانی دەرکرد کە سەربازەکانی خۆپێشاندانێکی سەربازی نمـایش بـکەن بەمەبەسـتی گێـڕانەوەی متمـانەو ورە بـۆ دەروونـی سـەربازەکان.[٧] سـوڵتان سـەلاحەددین بـۆ بەرزکـردنەوەی ورەی موسـڵمانان و ڕووخانـدنی وورەی دوژمن ، چەندین شێوازی ڕاگەیاندنی دەروونـی بەکـار دەهێنـا، وەک نمـایش کردنـی

---

(١). الطواشیة: سەربازی پلە یەکەمە... کە بەرزترین پلەی سەربازی ڕێکخراوە. العریني: مصر في العصر الایوبي، ل١٥٤، پەراوێزی (١).

(٢). القراغلامیة: سەربازی ئاسایی یە... لە سەربازی (الطواشیة) پلەیان نزمترە، ئەمانە لەکاتی تێپەڕ بوونی سوپادا چاودێری ڕێگاو بانیان لەسەر بوو، ئەمڕۆ پێیان دەوترێ تیپی (سەرا سۆکردن)، بڕوانە (المقریزي: السلوک، ج١/ ل١٨٧).

(٣). المقریزي: السلوک، ج١/ ل١٨٧؛ ا.ر.جب: صلاح الدین الایوبی، ل١٦٠-١٦١.

(٤). زکار: حطین و الفتح الصلاحي للقدس، ل٨٧.

(٥).العسلي: فن الحرب الاسلامي، مج٤/ ل١٣٨.

(٦).واتە:"منیش ترس وەبەر خوانەناسان دەنێم. سا ئێوە لە ملیان دەن و هەموو ئەنگوستەکانیشیان بپەڕێنن". سورەتی ئەنفال، ئایەتی ١٢، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار.

(٧).العماد الکاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل٣٢١-٣٢٢؛ نوري: سیاسة صلاح الدین، ل٢٧٤.

دیلەکانی دوژمن و ئەنجامدانی مانۆڕی سەربازی بەتایبەتی لەپاش ڕووداوی (بیت الاحزان) ساڵی (٥٧٠ک/١١٧٤ز) پاش سەرکەوتنی بەسەر خاچ دروشمەکان، دیل و سەرە کوژراوەکانیان گەیشتە شاری دیمەشق کە هەردوو سواریان خستە سەر حوشترێک و هەریەکەیان ئالایەکی لەگەڵدا بوو، هاوکات پێشەواکان بەسەر ئەسپەکانەوە بوون (الزردیە والخودە)یان پێ بوو و لەدەستێکیاندا ئالایان پێ بوو و هەر سێ یا چوار یان کەمترو زیاتر لە گوریسێک بەسترا بوون، و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی شار لە پیرو گەنج و ژن و منالأ بۆ بینینی ئەو دیمەنانە ڕژانە سەر شەقامەکان و سوپاسی خوایان بۆ ئەو سەرکەوتنە گەورەیە کردو ورەیان بەرز بۆوەو زیاتر پەرۆشی جیهاد کردن بوون.[١]

لەو شێوازە دەروونیانەی سەلاحەددین پەیڕەوی دەکرد، ئەنجامدانی مانۆڕی سەربازی بوو بۆ ترساندنی خاچ دروشمەکان و ڕووخاندنی گیانی مەعنەویان و پەکخستنی ئیرادەیان لە بەگژدا چوونی ئەیوبییەکان و خوڵقاندنی حاڵەتێک لە دڵە ڕاوکێ و ترس لەناو ڕیزەکانیان،[٢] بۆ ئەوەی لە ئەنجامی زاڵبوونی ئەو بارە دەروونیەدا بەسەر سەربازەکانیاندا توانای هاتنە مەیدانی شەڕیان نەمێنێت، نموونەش لەسەر ئەمە ئەو مانۆڕە گەورەیە بوو کە سەلاحەددین لەکاتی درەچوونی لە دیمەشق ئەنجامیدا لەیەکی موحەڕەمی ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) [٣]بەو شێوەیە سوور بوو لەسەر ڕووخان و تێکشکاندنی خاچ دروشمەکان لە ڕووی دەروونی و مەعنەوی و سەربازییەوە، کاتێک گەیشت بە شارۆچکەی (عشترا) لە باکوری (الکرک) و کردی بە شوێنێک بۆ کۆکردنەوەی سەربازەکانی و بانگەوازی ڕەوانەی هەموو هێزە موسڵمانەکان کرد وەک لافاو ڕژانە سەری و لە (مصرو شام و جەزیرەو دیاربەکر) هێزی پێگەیشت،[٤] پاش ئەوەی مانۆڕەکەیان تەواو کرد، ژمارەیان گەیشتە (١٢) دوانزە هەزار سەرباز لەشێوەی (اگلاب) ڕێکی خستن، پاشان سەلاحەددین پلانی بۆ شەڕ دارشت و سەربازی بۆ ناوەڕاست و هەردوو قۆڵ و ڕاست و چەپ دانا، بەشێوەیەک هەریەک لەوانە لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا

---

(١). أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل١٠٨.

(٢). مصطفى: صلاح الدين الايوبي، ل٢٦٠.

(٣). المقريزي: السلوك، ج١/ ل٢٠٧.

(٤). العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٧١؛أبن شداد: النوادر السلطانية، ل٨٥.

کلری خۆیان بزانن. [1]بەم شێوەیە سوڵتان توانی وورەی سەربازەکانی بەرز بکاتەوە و وورەی خاچ دروشمەکانیش بڕوخێنێ، لەکاتێکدا لەگەرمەی بەرپێوە چوونی شەڕی گبریە) دابوون، (ریموند) لەم بارەیەوە وتی: "سوێند بێت بە خودا لەکۆن و ئێستادا سەربازی موسڵمانانم دیووە، بەڵام هەرگیز لەم سەربازانەی لەگەڵ سەلاحەددین دایە بەهێزترو زۆرترم نەدیووە". [2]

ئەمەش بەڵگەیە بۆ بڵاوبوونەوەی ترس و دڵە ڕاوکێ لە نێوانیاندا، لە ئەنجامی ئەو مانۆڕە سەربازییەی کە سەلاحەددین پێی هەستا لە (گبریە). گومانی تیا نی یە ڕاگەیاندنی دەروونی هۆکارێکی گرنگە لە هۆکارەکانی سەرکەوتن، دەتوانین بڵێین گرنگترین هۆکارە بۆ سەرکەوتن، چونکە ئەو ڕاگەیاندنە دەروونییە لایەنی پۆزەتیڤ لای سەربازەکان دەخوڵقێنێ و وایان لێ دەکات بەشێوەیەکی بەردەوام لە حاڵەتی ئامادەیی دابن. [3]

سەلاحەددین دەستی بە کردە سەربازیەکانی دژی خاچ دروشمەکان کرد و گەورەترین سەرکەوتنی لە شەڕی (حگین)دا لە ٢٤ی ڕەبیعی دووەم سالی (٥٨٣ک/٤ی تەممووزی ١١٨٧ز) بەدەست هێنا. [4]

ڕاگەیاندنی دەروونی لەسەردەمی شەڕدا بەشێکی جەنگە کە لەپێش جەنگ و لەکاتی جەنگ و لەدوای جەنگدا دەکرێت، و بەنوێترین جۆری چەک دادەنرێ کە ئاراستەی بیرو باوەڕو ئازایەتی و باوەڕ بەخۆ بوون دژی ئارەزووی جەنگ دەکرێت، هەروەها ئەم جۆرە جەنگێکی بەرەنگاری و هێرش بردنە لەکاتی جەنگ کە هەوڵدەدات وورەی جەنگاوەرەکانی بچەسپێنێ و لەبەرەی ناوخۆوە کۆمەک دەکرێ و هەوڵ دەدات بۆ ڕووخاندنی وورەی دوژمن. هەروەها سەلاحەددینی ئەیوبی لە جێگەی خۆیەوە وەکو سەرکردەی سوپای موسڵمانان چەندین شێوازی ڕاگەیاندنی دەروونی لە دژی خاچ دروشمەکان بەکارهێناوە. بۆ نمونە سوڵتان سەلاحەددین لە کۆتایی ساڵی (٥٨٥ک/١١٨٩ز)دا گەیشتە لوتکەی سەرکەوتنی سیاسی و سەربازی،

---

(١).ابن الآثیر: الکامل، ج٧/ ل٣٢٣؛ أبو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٧٦؛ أبن خلدون: تاریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٣٠٦؛رنسیمان: تاریخ الحروب الصلیبیه، ج٢/ ل٧٣١-٧٤٣؛ العسلي: صلاح الدین الایوبی، ل١٥٦-١٥٧.

(١) ابن الآثیر: الکامل، ج٧/ ل٣٢٤.

(٢). ابن الآثیر: الکامل، ج٧/ ل٣٢٤.

(٣). عاشور: الحرکة الصلیبیة، ج٢/ ل٨٠٤؛ پیریه: الذکاء و القیم المعنویة في الحرب، ل١٠٧.

(٤). العماد الکاتب: الفتح القسی، ل٢٣؛ أبن الاثیر: الکامل، ج٧/ ل٣٢٦ ؛ أبن شداد: النوادر السلطانیة، ل١٢١؛ أبو شامه: الروضتین، ج٢/ ل٧٧؛ أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٩٠؛ ابن تغري بردي: النجوم الزاهره، ج٦/ ل٣٢.

و خاچ دروشمەکان جگە لە شارەکانی (صور، انگاکیا، گرابلس، حصن المرقب)[1] هیچ شوێنێکی تریان بەدەستەوە نەما، ئەو سەرکەوتنەی سەلاحەددین لە نامەکەیدا بۆ (سیف الاسلام گغتکین) ی برای کە لە (یمن) جێگری بوو ناردو تێیدا ئامۆژگاری دەکات و دەڵێت: "ئەمڕۆ لە وڵاتی شام، کە لەوێدان، نە قسەی هەرزە دەبیستن، نە وتارێکی نارەوا، مەگەر سەڵاو لەیەکتر بکەن و وەڵامی پێ بدەنەوە". [2]

ئەم دەستەواژانە بەشێکن لە شێوازەکانی ڕاگەیاندنی دەروونی لای سەلاحەددین، سەرەڕای ئەمە توانی سەرکەوتن لە گۆڕەپانی ناوخۆ و دەرەوەدا دژی خاچ دروشمەکان بەدەست بهێنێ، توانی کەسایەتیە قین لە دڵ و دەروون نزمەکان لەسەر ڕێگای خۆی دوور بخاتەوە، و سوپاکەی لە ژێر ئاڵای دەوڵەتی ئەیوبی‌دا یەک بخات. هەروەها سەلاحەددین هاوارکردنی لەجەنگدا بەکاردەهێنا بەمەبەستی فیزکردن و بەهێزی لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵا خاچ دروشمەکاندا. وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە:﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفاً مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ ﴾،[3] لە پێناو بەرزکردنەوەی گیانی ورەیی موسوڵمانان لە کاتی شەڕی خاچ دروشمەکان و بەدەست هێنانی سەرکەوتن، و وەرگرتنی هەر شکستێک ئەگەر ڕوویدا، بە بیرهێنانەوەی ئەو ناز و نیعمەتانەی خوا داویە بە موسوڵمانان لە پاشە ڕۆژدا ئەویش بەهەشتە. لە ڕۆژی سێ شەممەی ٧ی ربیعی دووەم ساڵی (٥٨٧ک/١١٩١ز)و لەکاتی ئابڵوقەی شاری (عکا) لەلایەن خاچ دروشمەکانەوەو کاتێ سوڵتان هەواڵی وەستانی موسڵمانانەکانی لەبەرەنگاری کردنی خاچ دروشمەکان پێ گەیشت، سەربازەکانی بەرەو خاچ دروشمەکان بردو کشانەوە نێو سەنگەرەکان تا سوپاکەی هەمووی چووە ناوی، سوڵتان سەلاحەددین وەکو دایکێکی مناڵ ونبوو بە ئەسپەکەی دەسوڕایەوە لە داوایەک بۆ داوایەکی تر و خەڵکی هاندەدا بۆ جیهاد، لە نێوان خەڵکیدا هاواری دەکرد (وای بۆ ئیسلام). هاوارکردنەکەی سەلاحەددین لە

---

(١).حصن المرقب: شارۆچکە و قەلایەکی بەهێزە دەڕوانێتە سەرکەناری دەریای شام و شاری بانیاس،(یاقوت:معجم البلدان، ج ٤/ ل ٢٥٠).

(٢). أبو شامە: الروضتين، ج٢/ ل٣٦؛ سعداوي: الحرب والسلام، ل١٦-١٧.

(٣). واتە: "ئەی پێغەمبەر ! هانەی باوەڕداران بدەن بچنە خەزا ؛ ئەگەر ئێوە بیست کەس بن و خۆڕاگر بن،- بە ئیزنی خوا- دوو هەزار کەس لە خوا نەناسان رادەنێن؛ چونکە ئەوان کەسانێکی بێ ئاوەزن" سورەتی ئەنفال، ئایەتی ٦٥. وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار.

کاتی جەنگدا بۆ بەرزکردنەوەی وورەی موسڵمانان بوو. ئەمە جەنگێکی هێرش بردنە کە سوپا بەچەکێکی فیکری و سۆزی لە پێناو ڕووخاندنی هێزی بەرەنگار بوونەوە لە نێو سوپای دوژمندا پێیهەڵدەستێ.[1] ڕووخاندنی گیانی ورەیی گرنگترین ئامانجە کە سوپا شەڕکەرەکان هەوڵی بۆ دەدەن ئەویش لە ڕێگەی شەڕێکی سەربازی یان بە جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی لەکاتی شەڕدا. کەواتە هەر لایەک لە لایەنەکانی شەڕ هەولأ دەدات پێش دەستپێکردنی شەڕ یا لەکاتی شەڕەکە هەڵوێستی بەرامبەرەکەی لاواز بکات بەڕێگای هێرش کردنە سەر لایەنی ڕۆحی و دەروونی دوژمنەکەی و بەهێز کردنی خۆی. لەم ڕووەوە لەکاتی شەڕدا، سەلاحەددین خۆی بەسەر سەربازەکاندا دەگەڕاو هانی ئەدان و وورەی بەرز دەکردنەوە، فەرمانی بە چاکە پێ ئەکردن و هانی ئەدان لەو شتانە بەدوور بکەونەوە کە خراپن، خەڵکیش ملکەچی وتەکانی ئەبوون وبەرامبەر بەو شتانەی ئەو ڕەتی دەکردەو هەڵوێستیان وەردەگرت.[2] ئەم شێوازە ڕاگەیاندنە دەروونیە کاریگەریەکی گەورەی لە بەهێز کردنی ورەی هێزەکانیان هەبوو.

لە هۆکارە ڕاگەیاندنە دەروونیەکانی ئەو شەڕە موسڵمانەکان دەستیان بەسەر خاچە گەورەکەیاندا گرت، کەپێی دەوترێ خاچی خاچان (صليب الصلبوت) ، ئەم شەڕە کە خاچ دروشمەکان هەر لەسەرەتاوە لە ڕووی دەروونی و مەعنەوی و سەربازییەوە تێیدا دۆڕابوون، سەرەتای کۆتایی هاتنی دەوڵەتەکەیان بوو لە قودس.[3]

کەواتە دەتوانین بڵێین سەربازەکانی سەلاحەددین ئەم شەڕەیان بردەوە، بۆیە بەشەڕێکی ئاینی ڕاگەیاندنی نوێ دەژمێردرێ کە مەملەکەتی خاچ دروشمەکان گەمارۆ درابوون و تێیدا ڕۆحی خاچ پەرستیان ون کردبوو، کەچی سوپای سەلاحەددین ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) لە ئاستێکی گیانی و مەعنەوی و دەروونی و حەماسەتێکی ئایینی وا دابوون وەک سەردەمی خاچ دروشمەکانی ساڵی (٤٩١ک/١٠٩٩ز) .[4] کەواتە هەل و مەرجەکە گۆڕانی بەسەردا هات و ڕۆحی

---

(١).نوفل: الحرب النفسية من منظور الاسلامي، ل٣٤.

(٢). أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥؛ العسلي: فن الحرب الاسلامي، ج٤/ ل١٤٠.

(٣).قاسم: ماهيه الحروب الصليبيه، ل١٤٣.

ج

(٤). باركر: الحروب الصليبية، ل١٠٥.

مەعنەوی و دەروونی هەموو کات سەرکەوتن دەستەبەر دەکات، چونکە بەهێزترین پاڵنەرە کەسەرباز هان دەدات دابەزێتە گۆڕەپانی شەڕو بۆ بردنەوەی شەڕەکە ورەی بەرز بێت.

شکستی خاچ دروشمەکان لە شەڕی (حگین)و کەوتنی (بیت المقدس) بەدەستی سوڵتان سەلاحەددین و ڕزگار کردنی کەنارەکانی شام، دەنگدانەوەیەکی گەورەی ڕاگەیاندنی دەروونی بوو لەنێو ئەوروپادا، هەروەها کارێکی گەورەی لە جیهانی مەسیحی کرد،[1] بۆ ئەو مەبەستەش قەشەو ڕەبەنەکان و زۆر لە ناودارەکانیان دڵتەنگی خۆیان بۆ ئەو دۆخە تازەیە نیشاندا و جەختیان لەسەر وەرگرتنەوەی قودس دەکردەوە و بۆ کۆکردنەوەی پشتگیری لە دژی موسڵمانەکان و گێڕانەوەی (بیت المقدس)، دەستیان کرد بە گەڕان بە وڵاتە ئەوروپیەکاندا، [2]تابلۆیەکی گەورەیان پێ بوو و ئاماژەی بۆ گۆڕی پیرۆزی (مەسیح) دەکرد کە بەسمی ئەسپی موسڵمانەکان پیس بووە و وێنەی مەسیحی لەسەر بوو و لەدواوە عەرەبێک بە قامچی لێی دەداو دەیان گوت ئەمە پێغەمبەری ئیسلامە لە مەسیح دەدات،[3] یەکەم کەس کە دەستی بە پروپاگەندەی ڕاگەیاندن کرد سەرۆکی (أساقیفە)ی شاری (صور)، (جوسیاس) بوو کە (کونراد مرکیس)ی لە کۆتایی هاوینی ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) نارد بۆ ڕۆژئاوای ئەوروپا، چاویان کەوت بە پاپا (ئۆربانی سێیەم) [4]ڕاستی هەڵوێستی خاچ دروشمەکانیان لە وڵاتی شام دەرخست، و دەڵێن گوایە کاتێک پاپا ئەمەی بیست یەکسەر مرد،[5] پاپا (گریگوری هەشتەم) [6]بە ناردنی

---

(١).أبو الفداء: المختصر، ج٢/ ل١٥٥-١٥٦؛حسن: التاريخ الاسلامي، ج٤/ ل١٠٧؛ سعداوي:التاريخ الحربي ، ل٢١٥.

(٢). أبو شامە: الروضتين، ج٢/ ل١٥١؛عاشور:الحركة الصليبية،ج٢/ ل٨٤٢

(٣). ابن واصل: مفرج الكروب،ج٢/ ل٢٨٨؛ النويري: نهايە الارب، ج٢٨/ ل٤١٦؛ باركر: الحروب الصليبية، ل١٠٩.

(٤). ئۆربانی سێیەم: یاخود ایربانی سێیەم ، لە پاش شەڕی (حطین) و کەوتنی بیت المقدس بەدەستی موسوڵمانان بە بیستنی ئەم هەواڵە جەرگبڕە لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١١٨٧ز/٥٨٣ک) کۆچی دوایی کرد(سعداوي: الحرب والسلام، ل٢١٦).

(٥). عاشور: الحركە الصليبيە، ج٢/ ل٨٤٣

(٦). گریگۆری هەشتەم: لەپاش مردنی (ایربانی سێیەم) ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) بوو بە پاپای مەسیحیەکان، و بە وەرگرتنی ئەم پۆستە یەکسەر نامەیەکی پروپاگەندانەی ئاراستەی دانیشتوانی ئەوروپا کرد، و توانی ڕێککەوتننامەیەکی ئاشتبونەوە لەنێوان پاشاکانی ئەوروپا واژۆ بکات بۆ ڕاگرتنی شەڕ و خستنە لاوەی کێشەکان بۆ ماوەی حەوت ساڵا بە پێی پەیمانی (هدنة الرب – ئاگربەستی خواوەند – ئاشتی خواوەند) و

نوسراو بۆ پاشای ئینگلتەراو فەرەنجە و ئیمپراتۆری ئەڵمانی دەست پێشخەری کرد، هەرچەندە کێشەی زۆر لە نێوانیان هەبوو، بە تایبەتی لە نێوان فەرەنساو ئینگلتەرادا،[1] و ئاگر بەستیان راگەیاندو کێشە ناوخۆییەکانیان وەلاناو بەمەبەستی بلاوکردنەوەی ئاشتی لەنێو هەموو کاپولیکەکاندا شەڕیان حەرام کرد، لەپێناو بەشداریکردن لە هەڵمەتی ئازاد کردنی (بیت المقدس) لە دەستی سەلاحەددین، سەرەڕای ئەمە مەسیحیەکان شارەکانی (صورو أنگاکیاو گرابلس) یان لەبەردەستدا مایەوە.[2]

ئەم هەڵمەتەی ڕاگەیاندنی دەروونییە هیوایەکی لە دڵیان جێ هێشت و کەشتیە ئیتاڵیەکان کۆنترۆڵی دەریای ڕوم (ناوەڕاست)یان دەکردو ئامادەبوون بۆ گواستنەوەی جەنگاوەرە خاچ دروشمەکان ئەگەر کرێیان بدایە، لە شێوازەکانی پروپاگەندەو ڕاگەیاندنی دەروونی تایبەت بە سۆزی ئایینی کە خاچ دروشمەکان پەیڕەوییان دەکرد، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆ کۆکردنەوەی هەموو تواناکانی جیهانی مەسیحی دژی موسڵمانەکان، ڕەبەن و قەشەکان و خەڵکانێکی زۆرو سوارە ناودارەکانیان جلی ڕەشیان لەبەر کردوو (بگریکی قودس) ولاتانی ئەورویای مەسیحی پێ گەڕاندن و سوڕی دەدان و بووە هۆی دروست کردنی گیانی دوژمنایەتی لە دژی ئیسلامەکان،[3] هانی ژمارەیەکی زۆریان لە پیاوان و ژناندا بۆ جەنگ یان پێشکەش کردنی یارمەتی ماددی لە جیاتی خۆیان، هەروەها توانی تەنها

---

بەستنی ئەنجومەنێک لە (لۆمانز) ساڵی (٥٨٤ک/١١٨٨ز)، کە تیایدا بڕیاری سەپاندنی باجی دەیی (عشور صلاح الدین)ی کرا بۆ تەواو کردنی پێداویستیەکانی هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان بۆ ڕۆژهەلات.(رنسیمان: تاریخ الحروب الصليبية، ج٣/ ل٢٢-٢٤؛العمری: اصول العلاقات السياسيه الدوليه، ل١٤٥-١٤٩).

(١).دوای ئەوەی ڕێککەوتن لەسەر پێشڕەوی بۆ ڕۆژهەلاتی ئیسلامی و دابەش کردنی هەموو دەست کەوتەکان، هەروەها دانانی باجی دەیی (ضريبة عشرية) لەسەر ئەو کەسەی بەشداری ئەم شەڕە ناکات، و ئەم باجە بە (عشور صلاح الدين) ناسراو بوو. (بولارد: س.پ، ل٦؛ نوري: سياسة صلاح الدين، ل٣٢٠ک).

ج

(٢). عاشور: الحركه الصليبيه،ج٢/ ل٨٥٢؛سعداوي: الحرب والسلام، ل٢١؛ Grousset: Histoire descroisdeset، P.18.111.

(٣).أبن واصل: مفرج الكروب، ج٢/ ل٢٨٨-٢٨٩؛ العليمي: الانس الجليل، ج١/ ل٣٣٠-٣٣١.

له شاری (رومیه)ی گەورە چوار کەشتی (شینی)[1] پڕ بکات له پاره دوای ئەوەی هۆکاری دەروونی و ئایینی لا وروژاندن بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجەکانیان.[2]

بەرامبەر بەم کارە راگەیاندنەی خاچ دروشمەکان سولتان سەلاحەددین نوسراوێکی ڕەوانەی (ریچاردی شیردلأ) پاشای ئینگلتەرا کردو پێی ڕاگەیاند کە ئامادەیە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی، چونکە ئەو سوورە لەسەر لەشکرکێشی بۆ ڕۆژهەلات، وەک جەنگێکی راگەیاندنی دەروونی بۆ ترساندنی، هەروەها ڕووداوەکانی هەڵمەتی دووەمی خاچ دروشمەکان بە سەرکردایەتی باوکی (هنری دووەم) لە سالّی (٥٤٤ک/١١٤٩ز) بەبیر دەهێنێتەوە، ئەو کاتە سەلاحەددین ئەفسەرێکی بچوک بوو لە سوپای (نورالدین محمود)ی فەرمانڕەوای شام، کە بەرگری شاری دیمەشقی لە مەترسی خاچ دروشمەکان پێ سپێردرابوو.

له ڕاستیدا ناوی سەلاحەددین زۆر بە خێرایی لە نێو ئەوروپادا بڵاو بۆوە، بەشێوەیەکی وا کە ترسی دەخستە دڵ و دەروونی ئەوروپاییەکانەوە، بۆ نمونە دایکان بۆ ژێر کردنەوەی منداڵەکانیان و خەواندنیان بە سەلاحەددینی ئەیوبی دەیان ترساندن.[3]

پاشاکانی ئەوروپا بە ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەی تایبەتی خۆیان وێنەی سەلاحەددینیان بۆ داماڵینی لە هەموو ڕەوشتێکی مرۆڤانە پیشاندەدا وەک جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی، هاندەر بۆ خۆئامادە کردن و بەشداری لە هەڵمەتێکی نوێی خاچ دروشمەکان دژی سولتان سەلاحەددین بەکاریان هێنا، بۆیە نامە گۆڕینەوەی نێوان سەلاحەددین و ئەوان بێ سوود بوو،و نەگەیشتن بە هیچ ئامانجێکی یەکلا کەرەوە بۆ خزمەتی کێشەی ئاشتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

نوێنەرایەتی دەسەڵاتە بە هێزەکانی ئەوروپا پێکهاتبوو لە (ئینگلترا، فەڕەنسا، ئەلمانیا) لە خۆئامادەکردنێک بۆ هەڵمەتێکی نوێ کە بە هەڵمەتی سێیەم ناسراوە،[4] بۆیەکەم جار لە مێژووی هەڵمەتەکانی خاچ دروشمەکان بۆ ڕۆژهەلات تایبەتمەندی

(١). شینی: کەشتیەکی گەورەی نەفەر هەڵگر بوو، پێی دەوترا (دال)، بە (القار) بۆیە دەکرا، هەروەها قوللە و قەلای تایبەتیان لەسەر دروست دەکرد، بەمەبەستی بەرگری کردن و هێرش بردن، (ابن مماتي: قوانين الدواوين، ل٣٤٠؛ حسين: الجيش الايوبى ، ل٣٤٢؛ ماهر: تاريخ البحرية في مصر الاسلامية، ل٣٥٢).

(٢).عاشور: أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ل٤٦٦-٤٦٧.

(٣). سعداوي: الحرب والسلام، ل٢٤.

(٤). بۆزیاتر زانیاری بڕوانە نەخشەی ژمارە (١) لەپاشکۆی ماستەر نامەی (ئاراس فەریق:س-پ).

علمانی و ڕاگەیاندنی لە خۆ گرتبوو، هاوکات لایەنە مادديەکان زاڵتر بوون لە ڕوحیەکان بەسەر سەرکردەکانی ئەم هەڵمەتەدا.

بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە خاچ دروشمەکان بەدەست بەستراوی لە ئاستی ئەیوبیەکاندا وەستابن، ئەوانیش توانیان جەنگی ڕاگەیاندن لەکاتی شەڕدا ئاڕاستەی ئەیوبیەکان بکەن، بەتایبەتی کاتێک (أرناگ) میری (الكرك) لە ساڵی (٥٨٢ک/١١٨٧ز) دەستی بەسەر کاروانێکی گەورەی ئەیوبیەکاندا گرت و هەموویانی بەدیلی گرت،[١] هەرچەندە ڕێککەوتنێکی کاتی لەنێوانیاندا بەسترا بوو کەماوەکەی چوار ساڵ بوو لە (٥٧٩ک/١١٨٥ز) تاوەکو (٥٨٣ک/١١٨٩ز)،[٢] سوڵتان سەلاحەددین نوێنەری خۆی بۆ لای ڕەوانە کردو ئەو ڕێککەوتنە کاتییەی بەبیر هێنایەوە، داوای کرد دیلەکانی ئازاد بکات، بەڵام (أرناگ) ئەوەی ڕەت کردەوەو داواکاریەکەی پشت گوێ خست،[٣] بگرە جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی دژ بەدیلە موسڵمانەکان دەست پێکرد و پێی وتن: "ئەگەر متمانەتان بە (محەمەد) هەیە با (محەمەد) بێت ڕزگارتان بکات". کاتێک سەلاحەددین ئەو هەواڵەی بیست، سوێندی خوارد (أرناگ) بەدەستی خۆی بکوژێ دوای ئەوەی بەسەریدا سەردەکەوێت،[٤] مەبەستی (أرناگ) لە ئاڕاستە کردنی ئەم جەنگە ڕاگەیاندنە دەروونییە دژ بە ئەیوبیەکان جێبەجێکردنی ئامانجە سیاسییە دوژمن کاریەکانی خۆی بوو، بەبێ ئەوەی پەنا بۆ جەنگی سەربازی بەرێت، مەبەستی بوو ترس بخاتە دڵ و دەروونی ئەوانەی لە کاروانەکەی ئەیوبیەکاندا بوون، هاوکات ورەیان بڕوخێنێ و ملکەچی داواکانی بن.[٥]

---

(١). أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٠؛ أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٧٥؛ قاسم: ماهية الحروب الصليبية، ل١٤٣.

(٢). ديورانت: قصة الحضارة، م٤ ج٤/ ل٣٦؛ زكار: حطين و الفتح الصلاحي للقدس، ل٩٢.

(٣). أبن الاثير: الكامل، ج٧/ ل٣٢٠؛ ألمقريزي: السلوك، ج١/ ل٢٠٥؛حسن: تاريخ الاسلام، ج٤/ ل١٠٦.

(٤). ديورانت: قصه الحضارة، م٤ ج٤/ ل٣٦؛ باركر: الحروب الصليبية، ل١٠٤، دەڵێن: "خوشکی سەلاحەددین لەم کاروانەدا بوو، بەڵام سەرچاوە ئیسلامیەکان ئاماژەیان پێ نەکردووە.( سبط ابن الجوزي: مراة الزمان، ج٨/ ل٣٨٩؛ العسلي: فن الحرب الاسلامي، ج٤/ ل١٣٥).

(٥). لەم بارەیەوە (گروسیە) دەڵێت: "ئەم کارە... ئەو دزە دزیەوەی کارێکی پێکرد کە ئەو پەڕی بێزاری لە ویژدانی موسڵماناندا بخولقێنێ، زۆری پێ نەچوو سەلاحەددینی ئەیوبی شەڕی لەگەڵ خاچ دروشمەکاندا دەست پێکردەوە، (أرناط) هەستی موسڵمانەکانی سەر لەنوێ گرتێبەردایەوە کاتێک کەشتیەکەی خۆی خستە نێو دەریای سوورەوە و هەڕەشەی لە شارە پیرۆزەکانی موسڵمانان وەکو (مەککەو مەدینە) دەکرد، ئەمەش بە لەکەدار کردنێکی گەورەی پیرۆزترین حورمەتی موسڵمانان دەژمێردرێت بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (ألحروب الصليبية، ل٧٣).

کاتێکیش (بالیان) لە ڕێککەوتن و سازش کردن لەگەڵ سەلاحەددین بێ ئومێد بوو بیری کردەوە جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی دژ بە سەلاحەددین بەرپا بکات بۆ ترساندنی لەلایەک و جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی لەلایەکی ترەوە،[1] بە سەلاحەددینی گوت: " سوڵتان ئەوە بزانە کە ئێمە خەڵکێکی زۆرین لەو شارەدا، بەتەنیا خودا نەبێت کەس نازانێت، لە جیاتی شەڕ داوای ئەمان دەکەن، بە بڕوای خۆیان وەلامیان دەدەیتەوە وەک وەلامدانەوەکانی ترت، حەزیان بە ژیانەو رقیان لە مردنە، ئەگەر بینیمان لە مردن بەو لاوە هیچی تر نیە، سوێند بە خودا هەموو ژن و منالەکانمان دەکوژین و ماڵ و حاڵیشمان دەسوتێنین، ناهێڵین دوای خۆمان سود لە یەک دەرهەم یا دینار وەربگرن، قبوڵ ناکەین ژن و پیاومان ئیهانە بکرێن یان بە دیلی بگیرێن، ئەگەر لەوانە بووینەوە ئەوا گومەزە بەردینەکە و مزگەوتی (الاقصی) و شوێنەکانی تر وێران دەکەین و هەموو دیلە موسوڵمانەکان دەکوژین کە ژمارەیان (٥) هەزار دەبێت، هاوکات هەموو ئاژەڵەکان دەکوژین، ئەو کاتە بۆ شەڕێک دەردەچین کە هەرکەسێک گیان و خوێنی خۆی بپارێزێ، ئەوکاتە کەسێک ناکوژرێت، ئەگەر چەند کەسێک وەکو خۆی نەکوژێت، یا بە سەربەرزی دەمرین یادلێرانە سەردەکەوین".[2]

(بالیان) بەم شێوازە ڕاگەیاندنە دەروونییە توانی سەلاحەددین بترسێنێ، ئەو ئامانجەش جێبەجێ بکات کە لەپێناویدا هاتووە.. ئیدی سوڵتان فەرمانی دەرکرد کە کۆبوونەوەیەک بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژکاریەکەی ببەستێت، تاوەکو لەبارەی ئەوەوە کاری پێویست بکرێت لە ئاست قسەکانی (بالیان) ڕاوو بۆچوونی خۆیان دەرببڕن.. وەک ترسێک لەو قسانەی (بالیان) وتویەتی کە هەموویان لەسەر ئەوە پێکهاتن کە وەلامی دڵنیا بوون بدەن بە خاچ دروشمەکان.[3]

کاتێکیش سوڵتان سەلاحەددین چووە ناو شاری (قودس)ەوە، شێوازی ڕاگەیاندنێکی دەروونی ئاشتیخوازانەی گرتەبەر، کاتێک دەرگاکانی کڵێسەی (القیامە)[4] ی بەمەبەستی بێبەشکردنی خاچ دروشمەکان لەو شوێنە پیرۆزە

---

(١).أبن الاثیر: الکامل، ج٧/ ل٣٢٣.

(٢).العماد الکاتب: الفتح القسي، ل ١٢٦-١٢٧؛ ابن الاثیر: الکامل ، ج٧/ ل٣٢٤؛ ابن واصل: مفرج الکروب،ج٢/ ل٢١٢-٢١٤؛ ألنویري: نهایه الارب: ج٢٨/ ل٤٠٤.

(٣). ابن الاثیر: الکامل ، ج٧/ ل٣٣٥؛ابن واصل: مفرج الکروب، ج٢/ ل٢١٥؛ ألنویري: نهایه الارب: ج٢٨/ ل٤٠٥.

(٤). قیامە یان قمامە: مەزنترین کڵێسەی خاچ دروشمەکان بوو لە (بیت المقدس)، دەکەوێتە ناوەڕاستی شارەکە، گۆڕستانێکی لێ یە پێی دەڵێن (القیامە)، چونکە پێیان وایە کە (مەسیح) قیامەتی لەوێ هەستاوە،

ناخست، بەڵام لەو بارەیەوە پرسی بە گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەی کرد. هەندێکیان ئاماژەیان بۆ ڕووخاندنی خانوەکانی دەکرد تا وەکو میوان ڕووی تێنەکەن، هەندێکیشیان وتیان ئەوە هیچ سوودێکی لێناکەوێتەوە، چونکە پەرستراوی ئەوان لە شوێنی خاچ و گۆڕەکەیە نەک چەند خانوویەکی بینراو، سەلاحەددینیش ئەو بۆچوونەی پێ باش بوو و چاوی لە (عمر بن الخگاب) بڕی کاتێک نەیروخاند لەکاتی ڕزگارکردنی (بيت المقدس)دا، لەهەمان کاتدا فەرمانی دەرکرد بە کردنەوەی بۆ هەرخاچ دروشمێک کاتێک سەردانی دەکات، بەرامبەر بە کرێیەکی دیاری کراو.[1] ئەمەش بۆخۆی جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی گەورە بوو لە حاڵەتی نەبوونی شەڕدا کە سەلاحەددین بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجە سیاسیەکانی و خوڵقاندنی حاڵەتێکی دەروونی پڕ لە ترس و سەرسامی و بێزاری لە نێوان خاچ دروشمەکان.
بەهەمان شێوەی سەلاحەددین، لە کاتی گەمارۆدانی شاری (عكا)دا کە ماوەی دوو ساڵی خایاند لە (٥٨٥ک/١١٨٩ز) تاوەکو ساڵی (٥٨٧ک/١١٩١ز) لەماوەی پێشڕەوی هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان بەسەرکردایەتی سێ لە پاشا گەورەکانی ئەوروپا ئەوانیش (فليب ئۆگستس)[2] پاشای فەڕەنساو (ریچاردی شیردلأ) پاشای ئینگلتەرا و (فردریک بەربەرۆسا)ی ئیمپراتۆری ئەڵمانیابوون،[3]لەو شێوازە ڕاگەیاندنە دەروونیانەی کە (فردریک بەربەرۆسا) بەکاری دەهێنا لەکاتی خۆئامادەکردن بۆ هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان نوسینی نووسراوێک بوو بۆ ئەو سەرکردانەی کە سوپاکەی بە وڵاتەکەیان تێدەپەڕێت وەکو پاشای (المجر-

---

بەڵام ڕاستی ناوەکە قیامە نی یە بەڵکو القمامە، چونکە زبڵخانەی دانیشتوانی شارەکە بوو، هەروەها لەسەر شورای شارەکە دەستی خراپە کارانیان دەبڕی و دزەکانیان تێدا لەخاچ دەدا، بەڵام کاتێک مەسیح لەخاچ درا (واتا ئەو کەسەی کە شێوەی لە مەسیح دەچوو) لەوکاتەوە ئەو شوێنە پیرۆز بوو لایان، بەڵام ئێمە پێمان وانیە کە ئەم شوێنە پیرۆزە زبڵخانە بێت). ( ناصر خسرو: سفرنامه، ل٧٤-٧٥؛ياقوت: معجم البلدان، ج٤/ ل٤٤).

(١). العماد الكاتب: الفتح القسي، ل١٤٥-١٤٦.

جج

(٢).فیلیب ئۆگستس: یان فیلیپی دووەم ن کە ناز ناوی (الفاتح یا الغازی) بوو کوڕی لویسی حەوتەمە، لەساڵی (٥٦١ک/١١٦٥ز) لە شاری غینیس لە دایک بووە، و لە ساڵی (٥٧٦ک/١١٨٠ز) بووە پادشای فەڕەنسا، بەشداری هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکانی کرد بۆ ڕزگار کردنی قودس، شەڕی هەردوو پادشای ئینگلیترای کرد (هنری دووەم و ریچاردی شێردل)ی کوڕی و توانی سەربکەوێت بە سەریاندا، لە ساڵی(٦٢٠ک/١٢٢٣ز) کۆچی دوای کرد. (العسلی: فن الحرب الاسلامي، ج٤/ل٢٢٣، پەراوێزی (١)).

(٣). گروسية: الحروب الصليبية، ل٧٦.

هەنگاریا) و ئیمپراتۆری (بیزنگی)، (أسحاق أنجیلیوس)و سولتانی سەلجوقی (قلج ارسلان)و نامەیەکی بە نوێنەرێک بە ناوی (هنری دییتز) نارد کە هەڕەشەو گوڕەشە بوو لە سەلاحەددین و داوای لێدەکرد هەموو (فەلەستین)یان بۆ بگێرێتەوە و لە گۆڕەپانی (صوعن) [1]ڕووبەڕووی ببێتەوە. لە سالی (٥٨٤ک/١١٨٨ز) نوێنەری (بیزنگی)یە کان گەیشتە (نورمبرگ) لە ئەلمانیا بۆ خۆئامادە کردن و کۆکردنەوەی پێداویستی تەواو بۆ کارئاسان کردنی تێپەڕ بوونی سوپای خاچ دروشمەکان بە ولاتی ئیمپراتۆری (بیزنگی)دا. هەروەها لە سالی (٥٨٥ک/تشرینی دووەمی ١١٨٩ز) پاشای (المجر)و سولتانی (سەلجوقی) وەلامی داواکاریەکەی (فریدریک بەربەرۆسا)یان دایەوە و پەیمانی هاوکاریان پێدا. بەلام وەلامی سەلاحەددین بەهێز بوو، دەربارەی ئەم وەلامە (سعداوی)دەلێت: "گیانی ئازایەتی عەشایەری کوردی و دبلۆماسیەتی ئەیوبیی مصری پێوە دیارە". [2] ئەمەش بۆخۆی شێوازێکی ڕاگەیاندنی دەروونی بوو کە سولتان سەلاحەددین لە دژی بەربەرۆسا پیادەی کرد. ڕاگەیاندنی جەنگی دەروونی لەکاتی شەڕدا هۆکارێکی گشت گیرو تەواوە لە هەلویستی سەربازی کە لە هەموو کاتێکدا کاریگەری هەیە، [3] هەلدەستێ بە ڕووخاندنی ورەی هێزی دوژمن، هەروەها ڕاگەیاندنی دەروونی لەسەردەمی جەنگدا هەولدەدات بۆ ڕێگرتن لە ئەندامانی سوپاکەی بۆ ئەوەی نەچنە بەرەی دوژمنەوە،و هەولدان بۆ ئەوەی دۆستەکانی دوژمن بێ لایەن بکات و کاریگەری کردنە سەر سوپای دوژمنەوە بەوەی کە بەرەنگاری هیچ سوودێکی نی یە. [4]

ئەمەی دواییان واتە ئیمپراتۆری ئەلمانیا لە ماوەی بەڕێوە چوونی هەلمەتی ناوبراودا جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی دژ بە سەلاحەددین بەرپا کرد، کاتێک نامەیەکی درێژی بۆ نووسی لە سالی (٥٨٤ک/١١٨٨ز) و داوای لە سەلاحەددین کرد دەست لە (بیت المقدس)و ناوچەکانی تری ڕۆژهەلات کە لەخاچ دروشمانی بووەوە هەلبگرێت، (فریدریک) سەلاحەددینی لە مەترسی ئەنجامەکانی ئەم شەڕە ئاگادار

(١).صوعن: ئێستا ناسراوە بە (صمان الحجر) لە ڕۆژهەلاتی ڕووباری نیل لە ولاتی مصر ئەو شوێنەیە کە فیرعەون و موسا بەیەک گەیشتن. بڕوانە (رنسیمان: تاریخ الحروب الصلیبیة، ج٣/ ل٣٣ ).

(٢). التاریخ الحربي المصري ، ل٢١٨.

ع

(٣).نصر: الحرب النفسیە، ج١/ ل١١٠.

(٤). رشتی: الدعایە و استخدام الرادیو فی الحرب النفسیە، ل٢٧٣.

کردەوە،[1] کەچی سەلاحەددین لەهەمان ساڵدا بەرامبەر بەوە بەجەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی لە ڕێگەی نامەیەکی درێژەوە وەڵامی نامەکەی (بەربەرۆسا)ی دایەوە، نامەیەک کە حەماس و هێزو متمانەی سەرکەوتنی لێ ئەڕژا، کە بۆخۆی نیشانەی دیبلۆماسیەتێکی بەرزو گرنگیدانێکی بەرفراوان بوو بەسیاسەتی نێو دەوڵەتی هاوچەرخ دووپاتی کردەوە کە سوورە لەسەر بە زۆر گێڕانەوەی (صورو گرابلس و أنگاکیا)و ئەو قەلایانەی خاچ دروشمەکان کە لەڕۆژهەلاتدا ماون، ئەگەر زوو بەزویی سەرکردەکانی خۆ بەدەستەوە نەدەن. هەروەها سەلاحەددین ئاماژەی بۆ پەڕینەوە لە دەریای ناوەڕاست کرد بۆ داگیرکردنی خودی ئەوروپا، ئەگەر (بەربەرۆسا) پێ لەسەر هەڕەشەکردن لەسەر ئاشتی و ئاسایشی ناوچەی ڕۆژهەلاتدا هەڵنەگرێت.[2]

(ڕیچارد شێردلأ) شێوازێک لە شێوازەکانی جەنگی ڕاگەیاندنی دەروونی بەکارهێنا کە بریتی بوو لە کاری چەواشە کاری و فرت و فێڵ بۆخۆی و جارێکیان نوێنەری خۆی ڕەوانەی لای سوڵتان سەلاحەددین کرد. [3] پاشان خاچ دروشمەکان ناچار بوون کە لە (الرملە) ساڵی (٥٨٨ک/١١٩٢ز) بکشێنەوە و بۆ داواکردنی ڕێککەوتن و ئاشت بوونەوەو نوێنەریان نارد، کشانەوەی ڕیچارد کاردانەوەیەکی گەورەی هەبوو لە نێو ڕیزی موسڵمانەکان و سەلاحەددین هەناسەیەکی وەبەر هاتەوەو ورەی سەربازەکانیشی بەرزبۆوە.[4] وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾[5] (ڕیچارد) نامەیەکی بۆ سەلاحەددین نارد، تێیدا هاتبوو "موسڵمانەکان هیلاک بوون و وڵات وێران بوو، موڵک و ماڵێکی زۆر بە فیڕۆ درا، خەڵکێکی زۆر کوژرا، ئەم کارەش هەقی خۆی بردو هیچ باسێک نەماوە تەنیا قودس و خاچ نەبێت. قودس پەرستگامانەو هەرگیز

---

(١).لەبەر ئەوەی زۆرێک لەگەلانی ئەوروپا هاوکاری دەبن و شان بەشانی هێرش دەکەنە سەر ڕۆژهەلات و قەلاو شوێنەکانیان تەختی زەوی دەکەن و ماڵ و کێڵگەکانیان وێران دەکەن، ژنەکانیان دەبەن و مناڵەکانیان هەتیو دەخەن.

(٢).سعداوي: الحرب والسلام، ل٢١-٢٢.

(٣).العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٠١؛ ابن شداد: النوادر السلطانية، ل١٥١.

(٤). المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٠٩؛ عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٨٩٣.

(٥).واتە :"ئەگەر داوای شەڕبەسیان کرد، قبولی کەو هەرخۆت بە خودا بسپێرە؛ هەر خۆی گوێدێر و زانایە"، سورەتی ئەنفال، ئایەتی ٦١، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار.

ج

دەستبەرداری نابین و هەمووشمان لە پێناوی بکوژرێین وازی لێ ناهێنین، وڵاتەکان هەموومان بۆ دەگێڕنەوە، و خاچی خاچان لای ئێوە تەنیا دارێکە هیچ بەهایەکی نی یە، بەڵام لای ئێمە زۆر پیرۆزەو سوڵتانەکان بۆ فەرمانڕەوایی بەکاری دەهێنن، دەمانەوێ لەو هیلاکیە پشوو بدەین".[1] هەروەها (ڕیچارد) لەکاتی دانوساندنەکانی لەگەڵ سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی شێوازی هەڕەشەو زۆری بەکار دەهێنا، بۆ نموونە بە سەلاحەددین دەڵێ: "بە دواکەوتنم لەخۆبایی مەبە، بەران دوا دەکەوێ بۆ ئەوەی قۆچ بووەشێنێ". [2]

سەلاحەددین لە وەڵامدا وتی: "قودس چۆن هی ئێوەیە ئاوا هی ئێمەشە،و لای ئێمە زۆر پیرۆزترە وەکو لای ئێوە، چونکە پێغەمبەرمان (د.خ) لەوێوە چوو بۆ ئاسمان و شوێنی کۆبوونەوەی فریشتەکانە، و باوەڕ ناکەم هیچ کاتێک وازی لێ بهێنین و ناکرێ باسی ئەو شتە لای موسڵمانەکان بکەین، بەڵام وڵاتەکانیش لە بنچینەدا هی ئێمەن و ئێوە بەشێوەیەکی کت و پڕ دەستان بەسەریاندا گرت، کەبەهۆی لاوازی ئەوکاتەی موسڵمانەکانەوە بوو، لەناو چوونی خاچیش بەدەستی ئێمە کارێکی مەزنە، ناتوانین واز لە هیچ شتێک بهێنین ئەگەر لە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان نەبێت".[3]

ئەگەر ناوەرۆکی هەردوو نامەکە شی بکەینەوە دەبینین نامەی یەکەم بۆنی دۆڕاندنی لێ دێت لەلایەن (ڕیچارد)ەوە، کە ئاماژە بۆ هێما ئایینیەکانیان دەکات و وەکو قودس و ئامادەن لە پێناویدا فیداکاری بدەن و بەوە کۆتایی پێ دێنێت کە سەلاحەددین خاچەکەیان پێ بداتەوە، و نامەی دووەم بە زمانێکی پڕ لەهێزو (منگق-لۆژیک) وەڵامی دەداتەوە و باسی مافێکی ڕەوای موسڵمانەکان دەکات. هەردوو نامەکە بەزمانێکی پڕوپاگەندەی ئایینی نوسراون کە لە ناوەرۆکدا باس لەترس و تۆقاندن دەکەن لە پێناو بەدەستهێنانی دەسکەوت و شکانی بەرامبەر.

---

(١). أبن الفرات: تاريخ ابن الفرات، م٤ ج٢/ ل٣٩.

(٢). بڕوانە (أبن واصل: مفرج الكروب، ج٢/ ل٣٩٠-٣٩١).

(٣). أبن الفرات: تاريخ ابن الفرات، م٤ ج٢، ل٣٩-٤٠.

**بارودۆخی جیهانی ئیسلامی**

له سـهدهی دوازدهیهمـدا، دوو زلهێـزی گهوره دهسـتیان گرتبـوو بهسـهر ڕۆژههڵاتی ناوهڕاستدا، ئهوانیش بیزهنتییه مهسیحیهکان و فاتمیه شیعهکان بوون، له نێوان ئهم دوو هێزهدا دهوڵهتی عهبباسی له بهغدا، که سهلجوقیهکان[1] دهستیان بهسهردا گرتبوو لاواز ببوو، سهلجوقیهکان ناوچهکانی خۆیان فراوان کرد له (ماورا و النهـر)هوه تـا دهگـاته ئهرزڕۆم و شـام، له سـاڵی (٤٨٥ ک/١٠٩٢ز) دهوڵهتـی سـهلجوقی له ئهنجامی ململانێ له نێوان میرهکانیاندا پارچه پارچه بوو، بهمهش باشـترین دهرفهت ڕهخسـا بـۆ خاچیهکـان تـا هێـرش ببهنه سـهر وڵاتـی شـام، فاتمیهکـانیش له سـاڵی(٢٩٧ ک/ ٩٠٩ ز) له بـاکووری ئهفریقیـادهوڵهتی فاتمییـان له تـونس دامهزرانـد، و له سـاڵی (٣٦٢ ک/ ٩٧٢ ز) میسـریان خسـتهژێر دهسـهڵاتی خۆیانهوه، له ساڵی (٤٧٨ ک/ ١٠٥٨ ز) وڵاتی شامیشیان داگیرکرد و کردیانه بنکهی بانگهشهی مهزههبی شیعه، ههر له ههمان ساڵدا بانگهشـهی فاتمی له بهغدا دهستی پێکرد، بهڵام ههر له سهرهتای سهدهی (١١ز) له شامدا خاچیهکان دهرکهوتبوون، و ههوڵـی ئهوهیان دهدا، نـاوچه پیرۆزهکانی فهلهستین بخهنه ژێر دهسهڵاتی خۆیـان، لهم دهمهدا بـارێکی شـێواو و پهرتبـوون له شـامدا ڕوویـدا بـوو، گهلێک میرنشـین لهلایهن سـهرداره عهرهبهکانهوه پهیدابیوون، سهلجوقیهکان بهشی باکووری شـامیان بهڕێوه دهبرد، و فاتمییهکانیش حوکمڕانی بهشی باشـووریان دهکرد، ئهم پشـێوی و دابهش بـوونه، چـاکترین ههل بـوو بۆ بیزهنتییهکـان تـا هێـرش بهێنـنه سـهر نـاوچه کهنارییهکـانی وڵاتـی شـام.[2] له سـهرهتای سـهدهی "٥"ی کـۆچی "١١"ی زایینـی ڕۆژههڵاتـی ئیسـلامی تووشـی حـاڵهتێکی ئـاژاوه بـوو به هـۆی لاوازی دهسـهڵاتی خیلافهتی عهبباسی، ئهمهش بووه هۆی له دهستدانی کۆنترۆڵی لهسـهر ولایهتهکانی ژێـر دهسـهڵاتی خـیلافهت، ئهم دۆخه به هـاتنی داگیرکـاری بوهیهیهکـان[3] بـۆ بهغدا

---

(١). سهلجوقی: هۆزەیەکە لە تورکەکان لە پشتی ڕووبار نزیک بخاری دەژیان و ناویان لە باپیرە گەورەیان وەرگیـراوە کە "سـلجوق" بـوو و بیـوونە موسـڵمان وە خۆیـان بە پـارێزەری مەزهەبـی سـنی دادەنـا و لە سەردەمی طغرلبک دەسەڵاتی سەربەخۆیان وەرگرت، (أبن تغری البردی: النجوم الزاهرة).

(٢) . د. خاشـع المعاضـيدي وأخـرون: الـوطن العربـي والغـزو الصـليبي، ص٢٩، محمـد رفعـت ومحمـد احمـد حسونة: معالم تأريخ العصور الوسطى، ط٤، مصر، ١٩٢٧، ص ١٤٨.

(٣) .بوەیهیەکان: ڕەگەزیان دەگەڕێتەوە بۆ "ال بویە" لە دیلمی وڵاتی فارس، سێ کوڕی هەبوو توانیان وڵاتی فارس و بەغدا داگیر بکەن و ماوەی فەرمانڕەوایان لە نێو ساڵانی "٣٣٤- ٤٤٧ک/ ٩٣٢- ١٠٥٥ز" (بڕوانە: أبن الجوزی : المنتظم في تأريخ الملوك والأمم، حيدر، اباد، ١٩٣٨، ج٦/ ص ٢٧٠).

ئاشكراتر دەركەوت، چونكە هەموو دەسەلاتەكانی "خەلیفەیان" خستە ژێر ڕكێفی خۆیانەوە، بەم جۆرە پێگەی بەهێزی خەلیفە نەما و ڕێزی كەم بووەوە، سەرباری ئەوەی بوەیهیەكان شیعە مەزهەب بوون كە دژی خیلافەتی عەبباسی سوننە مەزهەب بوون، بەڵام هێشتنەوەی خەلیفە عەبباسیەكان بە مەبەستی شەرعیەت دان بوو بە فەرمانڕەواییان.[١]

سیاسەتی بوەیهیەكان پشتی دەبەست بە نانەوەی ئاژاوە لە نێوان مەزهەبەكانی كۆمەڵگەی ئیسلامی،[٢] كە ئەم سیاسەتەش بووە مایەی شەڕ و ململانێ لە ناوخۆ، ئەوەش بۆ خۆی بووە مایەی لاوازكردنی ڕۆڵی كۆمەڵگا لە بەرەنگاربوونەوەی دەسەلات و مەترسی بێگانە، دەسەلاتی بوەیهیەكان درێژەی نەخایاند و بە هۆی شەڕ و ئاژاوەی نێوان ئەندامانی خێزانی دەسەلاتدار لەسەر سەركردایەتی بەرەو نەمان ڕۆشت ئەمە جگە لە هەڵوێستی خەلیفە لە دژیان.

لەو كاتانەدا كە دەسەلاتی بوەیهیەكان بەرەو نەمان دەچوو، هێزێكی نوێی لاو هاتنە مەیدان ئەوانیش سەلجوقیەكان بوون، كە لە ساڵی (٤٢٩ك / ١٠٣٧ز) بە سەركردایەتی "گغرلبك" دەستیان گرت بەسەر هەرێمی خوراساندا و خەلیفە "القائم بأمراللە" پاڵپشتی لێكردن، ئەوانیش خۆیان بە پارێزەری ولات و هەوڵدان بۆ گەڕانەوەی دادوەری و دەسەلاتی خیلافەت دادەنا، لە ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز)[٣] خەلیفەی عەبباسی بۆ بەرەنگاربوونەوەی پلانەكانی (البساسیری)[٤] و دەوڵەتی فاتمی كە لە میسر دەسەلاتیان فراوان ببوو، هەستا بە بانگێشت كردنی (گغرلبك) بۆ بەغدا بۆ ئەوەی ببێتە یارمەتی دەری.[٥]

بە هاتنی "گغرلبك" بۆ شاری بەغدا گۆڕانكاریەكی گەورە لە باڵانسی هێزەكانی نێوان دەوڵەتی عەبباسی و فاتمیدا ڕوویدا و ولاتی شام بووە گۆڕەپانی شەڕی

---

جج

(١) . كلود كاهن: تأريخ الشعوب الأسلامية، ص٣٠٠.

(٢) . السيوطي: تأريخ الخلفاء، تحقيق- محمد محي الدين، ط٣، بغداد، ١٩٨٧،ص ٤٠.

(٣) . حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، بغداد، ١٩٦٥، ص٤٦- ٤٧.).

(٤) . البساسیری :ناوی(أبو الحارث ارسلان بن عبدالله التركي) لە ممالیكی (بهاء الدولة)ی بوەیهی لە پێشەنگی توركەكان بوو دواتر چووە پاڵی فاتمیەكان و ناسرا بە بساسیری كە دەگەڕێتەوە بۆ یەكێك لە شارۆچكەكانی ولاتی فارس (بڕوانە أبن خلكان: وفيات الاعيان وأنباء أبناء الزمان، القاهرة، ١٩٤٩، ج١/ص ٧٦).

(٥) . البنداری: تأريخ دولة ال سلجوق، بيروت، ١٩٧٦، ص١٠- ١١.

سەربازی نێوانیان، چونکە سەلجوقیەکان خۆیان بە پارێزەری موڵکی خیلافەتی عەبباسی دادەنا کە وڵاتی شام بەشێکی زیندووی ئەو موڵکە بوو، بۆیە سەلجوقیەکان پاش پوچەڵ کردنەوەی پلانەکەی البساسیری و جێگیربوونی دەسەلاتیان لە بەغدا چاویان بڕیە ئەو شوێنە، وڵاتی شامیش وەک ناوچەکانی تر کە لە ژێر رکێفی دەسەلاتی خیلافەتدا نەما بوو، ڕووبەڕووی چەندین ئاژاوە و شەڕی هێزە ناوخۆییەکان ببووەوە، لەوانەش سەرکردەی هۆزە عەرەبەکان لە حاڵەتێکی شڵەژان و نا ئارامی سیاسیدا دەژیان لە دژی (عهد کوڕی مرداس) و ئەو کێشانەی (بنو الجراح) لە فەلەستین دروستیان کرد.

لەساڵی (٤٦٢ک/ ١٠٦٩ز)[١] میر (مەحمودی کوڕی نصری کوڕی ساڵح کوڕی مرداس) میری حەلەب لەگەڵ سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)[٢] پەیمانی بەست بەوەی لە خوتبەی جومعەدا ناوی خەلیفە (القائم بأمر الله)[٣] بهێنێت، پاش ئەوەی سوڵتان لە بەغداوە ناوی(نەقیبی نوقبا و)ی بۆ نارد تا بانگەواز بۆ عەبباسیەکان بکات،[٤] لە ساڵی (٤٦٣ک/ ١٠٧٠ز) سوڵتان ملکشاه فەرمانی بە (اتزابن اتبی) فەرماندەی تورکی کرد بۆ ڕۆشتن بەرەو وڵاتی شام و دەستگرتن بەسەر ناوچەکانیدا، سوپاکەی توانی دەستبگرێت بەسەر (الرملە و بەیتولمەقدیس) و دەورووبەری جگە لە (عەسقلان)، پاشان بەرەو (دیمەشق) ڕۆشت و ئابلۆقەی دا، بەڵام بە هۆی بەرەنگاربوونەوەی فاتمیەکان نەیتوانی داگیری بکات،[٥] (اتزابن) هەر بەردەوام بوو لە گەمارۆدانەکەی تا لە ساڵی (٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز) توانی بەهۆی خراپی باری

---

(١) . محمد جمال الدين سرور: النفوذ الفاطمي في بلاد الشام والعراق، القاهرة، ص٥٩.

(٢) . ئەلب ئەرسلان: لەساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز) لەدایک بووە، لەنێو ساڵانی (٤٥٥-٤٦٥ک/١٠٦٣-١٠٧٢ز) لەپاش (طغرل بگ) دەسەلاتی سەلجوقیەکانی گرتە دەست، سەرەڕای کەمی ماوەی دەسەلاتی بەلام شوێن دەستی دیار بوو، گرنگترینیان سەرکەوتنی بوو بەسەر بێزەنتیەکان لەساڵی (٤٦٣ک/١٠٧٠ز) لەشەڕی مەلازگرد.

(٣) . القائم بأمر الله- ناوی (أبو جعفر عبدالله بن القادر بن المقتدر)ە، لەساڵی (٣٩١ک/١٠٠٠ز) لەدایک بووە، لەنێو ساڵانی (٤٢٢-٤٦٧ک/١١٣١-١٠٧٤ز) خەلافەتی عەبباسی گرتە دەست، لەسەردەمی ئەودا سەلجوقیەکان کۆتاییان بە دەسەلاتی بوەیهیەکان هێنا و خۆیان دەسەلاتی بەغدایان گرتە دەست، نزیکەی (٤٥)ساڵ حوکمڕانی خەلافەتدا بوو. (الذهبي: العبر في خبر من غبر،ج٢/ص٣٢٢؛ الحنبلي: شذرات الذهب،ج٣/ص٣٢٦ السيوطي: تأريخ الخلفاء،ص٤١٨).

(٤) . أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، بيروت، ص٥٨.

(٥) . أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج١٠/ ص٦٨.

ئابوورییەوە دەستی بەسەردا بگرێت، بەم جۆرە دیمەشق چووە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقیەکانەوە و لەو بەرەوارە بە دواوە بانگی فاتمییەکانی تیا نەدرا.[1]
سەلجوقیەکان بەمەش نەوەستانەوە بەڵکو هەوڵیاندا دەسەڵاتی خیلافەتی فاتمی لە میسردا لە ناوبەرن، بۆ ئەم مەبەستەش هێزێکی گەورەیان ئامادەکرد بە سەرکردایەتی (اتزابن) و لە ساڵی (٤٦٩ک/١٠٧٦ز) چوونە زەویەکانی میسرەوە، بەڵام بە هۆی بەرەنگاربوونەوەی فاتمیەکانەوە نەیانتوانی بچنە ناو قاهیرەوە چونکە میری فاتمیەکان (بدرالدین الجمالی) توانی هێزێکی گەورە کۆبکاتەوە و شکست بە هێزی (اتزابن) بهێنێت و تا الرملە ڕاویان بنێت،[2] ئەم شکستە کاری کردە سەر لاوازکردنی هێزەکەی اتزابن، کاتێک سوپای فاتمیەکان بەرەو دیمەشق دەکشا، (تتش کوڕی ئەلب ئەرسەلان) لە وڵاتی شام دەرکەوت و دەستی گرت بەسەر ئەو ناوچەیەدا کە مەلکشای برای پێی بەخشیبوو جگە لە سنوری دەسەڵاتی خۆی، ئەوەی تێبینی دەکرێت (تتش) لە دەسەڵاتی (اتزابن)ی تورکمانی لە وڵاتی شامدا دەترسا و وەک خەتەرێک لەسەر دەسەڵاتی خۆی سەیری دەکرد، بۆیە لە ساڵی (٤٧١ک/ ١٠٧٨ز) یەکەم هەلی لە دەست نەدا بۆ لە ناوبردنی.[3]
جێی ئاماژە بۆ کردنە پاش شکست هێنانی(اتزابن) فراوان بوونی دەسەڵاتی سەلجوقی بەرەو ڕۆژئاوای فاتمی وەستا، ئەگەر چی چەند هەوڵێکی سەرنەکەوتوو هەبوو لە لایەن (تاج الدولە) (تتش)ەوە کە سەرقاڵی جەنگێکی بەردەوام بوو لەگەڵ (موسلمی کوڕی قرینقی) فەرمانڕەوای موسڵ لە لایەک و فاتمیەکان لە لایەکی تر،[4] دواتریش لە ساڵی (٤٧٧ک/ ١٠٨٤ز) لەگەڵ (سلێمان کوڕی قتلمش)ی سەلجوقیدا تووشی ململانێ بوو کە ئەو کاتە دەستی گرتبوو بەسەر (قونیە) و ئەنتاکیا و هەوڵیدا دەسەڵاتی فراوان تر بکات، بەڵام سوپاکەی لە بەرامبەر تاج الدولە (تتشدا) تووشی شکست هات و بە هۆیەوە لە ساڵی (٤٧٩ک/ ١٠٨٦ز)[5] سلێمان خۆی کوشت، لە ناوەندی ململانێی نێوان میرە سەلجوقیەکان لەسەر وڵاتی شام و نێوان خەڵکەکەی بە تایبەتیش پاش مردنە چاوەڕوان نەکراوەکەی سلێمان، ململانێ لە

---

(١) . أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص١٠٨.
(٢). أبن القلانسي: ن،م، ص١٠٩؛ أبن الأثير: ن،م، ج١٠/ ص١٠٣- ١٠٤.
(٣) . أبن القلانسي: ن،م، ص١١٢؛ المقريزي: اتعاظ الحنفا، تحقيق- محمد حلمى محمد، القاهرة، ١٩٧١، ج ٢/ص ٣٢٠.
(٤) . أبن الأثير: الكامل، ج ١٠/ ص٢٣٢- ٢٣٤.
(٥) . أبن الأثير: البداية والنهاية،بيروت،١٩٧٧،ج١٢/ص١٣.

نێوان میره تورکەکان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات زیادیکرد، لێرەدا (ملکشاه) هەستا بە دانانی دوو فەرماندە بۆ فەرمانڕەوایی ڕۆم، کاتێ هەواڵی هاتنی سوڵتان (ملکشاه) گەیشتە (تتش)لە حەلەب هەڵهاتن بۆ دیمەشق.[١]

هەرچەندە سەلجوقیەکان لە وڵاتی شام خۆیان بەهێز دەکرد و سنوری دەسەڵاتیان لەسەر حسابی بیزەنتەکان فراوان دەکرد بە تایبەت دوای سەرکەوتنیان لە شەڕی (ملازگرد)دا لە ساڵی (٤٦٣ک/ ١٠٦٩ز)، کە لە ئەنجامە گرنگەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی ڕۆم بوو،[٢] بەڵام لە دوای مردنی سوڵتان (ملکشاه) لە ساڵی (٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز)، دەوڵەتەکەیان بە هۆی ململانێی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات ڕووی لە لاوازی کرد، بەجۆرێک ناکۆکیەکان پەرەی سەند بۆ شەڕ لە ئەنجامدا دەوڵەتەکەیان دابەش بوو بۆ پێنج بەش،[٣] لە ئەنجامی ئەم دابەش بوونە بارودۆخی وڵاتی شام تێکچوو، ئەمەش بووە هۆی دەست تێوەردانی فاتمیەکان لە کاروباری ناوخۆیی بە تایبەت دوای گواستنەوەی پایتەختی خیلافەتیان لە ساڵی (٣٥٨ک/ ٩٧٣ز) لە مەغریبەوە بۆ میسر،[٤]پێویستی سیاسی و جەنگی ناوچەکە وای خواست کە چالاکیەکانیان ئاڕاستەی وڵاتی شام بکەن، بە مەبەستی لاوازکردنی پایەی خیلافەتی عەبباسی و کۆنترۆلاً کردنی جیهانی ئیسلامی و بانگەشە کردن بۆ مەزهەبی شیعە، لە ساڵی (٣٥٩ک/ ٩٧٣ز) دەستیان کرد بەجێ بەجێ کردنی ئەم سیاسەتە ئەویش بە ناردنی هەڵمەتێک بە فەرماندەی (جعفر بن فلاح)کە توانیان فەلەستین داگیر بکەن،[٥]بەڵام ئەم دۆخە زۆری نەخایاند و قەرامیتەکان[٦] سەریان هەڵدا، هاوکات هێزی هۆزە عەرەبیەکان لە ناوچەکە پەرەی سەند لەوانەش (بنی گیء) لە فەلەستین کە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەسەر ڕووداوە سیاسیەکانی ناوچەکە لە ساڵانی (٣٨٨- ٤٢٠ک/ ٩٨٨-َ ١٠٢٩ز)دا، هەروەها (بنو کلاب و بنو

---

(١) . أبن العديم: زبدة الحلب في تأريخ حلب- ت،سامي الدهان،دمشق،١٩٥١،ج٩٩/٢ص-١٠٣.

(٢) . أبن الأثير: الكامل،ج ١٠/ ص٦٢- ٧٦؛ رنسيمان، ن،م،ج ١/ ص٦٩.

(٣) . عاشور: ن،م، ج١/ ص ١١٤.

ج

(٤) . المقريزي: اتعاظ الحنفا، ج١/ص ١٠٢.

(٥) . المقريزي: اتعاظ الحنفا، ج١/ص ١٠٢.

(٦) . قەرامیتەکان: بانگەوازێکە لە "سواد الكوفة" بڵاوبووە لەسەر دەستی "حمدان بن الاشعث" و لە شوێن کەوتووی بانگەوازی خیلافەتی فاتمی بوو هاوکات لە ژێر کاریگەری "مزدکی و زەردەشتی" بوو و توانیان یەکەم دەوڵەتی کۆماری لە بەحرەین دامەزرێنن و گەورەترین مەترسی بوون لە ناوچەکە- (بڕوانە: أبن الجوزي: المنتظم،ج ٥/ ص ١١٠؛ أبن خلدون: العبر وديوان المبتدأ والخبر، بيروت، ١٩٧١، ج٤/ ص ٨٨- ٨٩).

الجراح) بوونه هاوپەیمان لە دژی فاتمیەکان لە وڵاتی شامدا،[1] بەمەش خیلافەتی فاتمی ناچار بوو لە دژیان سوپایەک ئامادە بکات، بەڵام بارودۆخی فاتمیەکان لە شام بە هۆی مەترسی سەلجوقیەکانەوە بەردەوام سەقامگیر نەبوو.[2]

پاشماوەی ئەم ڕووداوانە بارودۆخێکی نائاسایی و نائارام و پشێووی لە ناوچەکەدا خوڵقاند، ململانێی سیاسی ببووە هۆی تێکچوونی باری ئابووری لە نیوەی دووەمی سەدەی)٥ک- ١٠ز(، بە شێوەیەک (ابن القلانسی)[3] دەڵێت (لەو ساڵانەدا نرخی شت و مەک لە دیمەشق زۆر گران بوو بە ڕادەیەک دانەویڵەیان نەمابوو)هەروەها دۆخی میسریش هیچ کاتێک لە شام چاکتر نەبوو، لە ئەنجامی ململانێ نێوان سەربازەکانیان کە لە بەربەری و سودانیەکان لەگەڵ تورکەکان،[4] پێکهاتبوو نزیکەی "١٠" ساڵ برسێتی بەخۆ بینی، ئەم بارودۆخە ئاڵۆزەی کە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی تیا دەژیا ببووە هۆی لاوازبوونی کۆمەڵگای ئیسلامی لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکانی دەرەوەدا، بە جۆرێک زۆربەی مێژوونووسان بارودۆخی ڕۆژهەڵات بە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی هەڵمەتی خاچیەکان دادەنێن لە قۆناغەکانی یەکەمیدا، هەواڵی ئەم پشێویی و نائارامیەی ناوچەکە لە ڕێگای حەجاجەکان و بازرگانەکانەوە دەگەیشتە ئەوروپا و لە ئاسانی داگیرکردنی ناوچەکە ئاگاداریان دەکردنەوە بە هۆی نەبوونی دەسەڵاتێکی بە هێز بۆ بەرگری کردن لە ناوچەکە.

دۆخی ناوچەکە دەرفەتی بۆ خاچیەکان ڕەخساند لە جێبەجێ کردنی کاری سیاسی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە داگیرکاریەکانیان، ئەویش بە بەکارهێنانی حەزی ناوچەگەرێتی لە نێوان دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکەدا "فاتمیەکان، سەلجوقیەکان، تورکمانەکان، میرە ناوخۆیەکان" و ئەم کارەیان زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی دیار بوو لە ئەنجامی بوونیان لە قوستەنتنیەدا چونکە ئیمپراتۆری بیزەنتی زانیاری چاکی لەو بارەیەوە پێ دەبەخشین.[5]

شایەنی باسە پەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی نێوان ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و خیلافەتی فاتمی لە میسر لە ڕێگای وەفد و نامە گۆڕینەوە و بەرژەوەندییە

---

(١). أبن القلانسي: ن،م، ص١٣٥.

(٢) . أبن الأثير: الكامل، ج١٠/ص ٢٨٢- ٢٨٣.

(٣) . هەمان سەرچاوە لە میانەی ڕووداوەکانی ساڵی "٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز"، ص١٠٨.

(٤) . المقريزي: اتعاظ الحنفا، ج١/ص ٢٧٩- ٢٨٠.

(٥) . رنسيمان: ن،م، ج١/ص ٣٢٥؛ أبن الأثير: الكامل،ج ١٠/ص ٢٧٣.

بازرگانیە هاوبەشەکانی نێوانیان دەرفەتی ڕەخساند بۆ زانینی ئەو زانیاریانە. لە ڕاستیدا مەترسی سەلجوقیەکان بۆ سەر خیلافەتی فاتمی و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی وای لێکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەترسیە پەیوەندیان خۆش بێت. ئەم هۆکارانە دەرفەتیان ڕەخساند بۆ هاتنی خاچیەکان و دەست پێکردنی پرۆسەی داگیرکردنی ناوچەکە.

## بنەماڵەی ئەیوبیەکان

دامەزرێنەی ئەم دەوڵەتە باپیری سەلاحەددینی ئەیوبی (شادی کوڕی مەڕوان)بوو کە لە کوردانی هۆزی ڕەوادی بوو لە شاری دوین لە عەشیرەتی هەزبانی،شاد دوو کوڕی هەبوو بە ناوەکانی (ئەیوب، شێرکۆ) لە گوندی (ئەجدنکان) لە دایک بوون، "شادی کوڕی مەڕوان" لەگەڵ (بەهرۆزی رۆمی) پەیوەندی ودۆستایەتیەکی چاکی هەبوو،[1] ئەم (بەهرۆزە) مامۆستای منداڵی سەلجوقیەکان بوو، لە پڕێکدا (بەهرۆز) شاری دوینی بەجێ هێشت و ڕووی کردە شاری بەغداد، لە ماوەی مانەوەی لە شاری بەغداد توانی بە چالاکی و زیرەکی خۆی ناو دەرکات و خۆی نزیک بکاتەوە لە سوڵتانی سەلجوقی (مەسعودی کوڕی ملکشاە)، بۆیە سوڵتانی سەلجوقی کردی بە پارێزگاری شاری بەغداد، دوای ئەوەی لە بەغداد دەسەڵاتی وەرگرت، ناردی بە دوای (شادی کوڕی مەڕوان) بۆ لای خۆی، باپیری سەلاحەددینی ئەیوبی بە هیوای (مجاهەددین بەهرۆز) وڵاتی خۆی بەجێ هێشت و بەماڵەوە چووە شاری بەغدا،[2] لە دوای ماوەیەکی کەم سوڵتان (مەسعود) شاری تکریتی بە موڵکانە دا بە بەهرۆز، ئەویش (شادی کوڕی مەروانی) کرد بە نوێنەری خۆی و ناردی بۆ شاری تکریت و لەسەر ئەو موڵکانە داینا، لە پاش چەند ساڵێک شاد لە تکریت دەمرێت و نەجمەددین ئەیوب کە کوڕە گەورەی شاد بوو لە جێگای دانرا، ئەمیش وەک باوکی بووبە نوێنەری بەهرۆز لەسەر ئەو موڵکانە.

لە ساڵی (٥٢٦ک/١١٣١ز)دا (عیمادەدین زەنگی) کە خاوەن ئەتابەکی موسڵ بوو، لەگەڵ (ئۆردووی) سەلجووقی بەغدا لە باشووری تکریت بە شەڕ هاتن، (عیمادەدین

---

(١) . شرف خان بدليسي: شرفنامة، تر:محمد جميل الملا احمد الروزبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني، اربيل، ٢٠٠١، ص١٧٣.

(٢).. محمد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تأریخی (کورد و کوردستان)، بەرگی دووەم، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ص ٧٣.

زەنگی) لەم شەڕەدا شکا و هەڵهات بۆ شاری تکریت، (نەجمەدین) پێشوازی لێ کرد و یارمەتیدا بۆ پەڕینەوەی لە ڕووباری دیجلە، بەم کارە فەرمانڕەوای بەغداد لە نەجمەدین زویر بوو،[1] ئەوەی زیاتر بارودۆخەکەی ئاڵۆز کرد هەستانی (ئەسەدەدین شێرکۆ) برای (ئەیوب)بوو بە کوشتنی یەکێک لە ئەفسەرانی قەڵای تکریت، بەمە (موجاهەدین بەهرۆز) لەبەر پلە وپایەی خۆی لای سوڵتانی سەلجوقی، (نەجمەدین)ی لە وەکیلی خۆی دەرکرد و داوای لێکرد شاری تکریت بەجێ بهێڵێت، بۆیە (نەجمەدین) و براکانی وماڵەوەیان بەشەو شاری تکریتیان بەجێ هێشت و بە ئومێدی چاکەکانیان لەگەڵ (عیمادەدین زەنگی) ڕوویان کردە شاری موسڵ، لەوێ (عیمادەدین زەنگی) پێشوازی لێ کردن و چاکەی ئەیوبییەکانی لە پێش چاو بوو، نەجمەدین و کەس و کارەکەی لە موسڵ مانەوە لەگەڵ عیمادەدیندا و بەشداری چەند شەڕێک یان کرد، کاتێک (عیمادەدین زەنگی) لە ساڵی(٥٣٤ک/١١٣٩ز) هێرشی کردەسەر سوریا و بەعلەبەکی داگیر کرد (نەجمەدین ئەیوبی) کرد بە فەرمانڕەوای ئەو شارە.[2]

## سەلاحەددین و بنەماڵەی ئەیوبی

سەلاحەددین لە ماوەی فەرمانڕەوایەتیدا هەرێمەکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکەی دابەش کرد بە سەر ئەندامانی بنەماڵەکەیدا، کە لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکان دەسەڵاتی تەواویان هەبوو، دەسەڵاتی حکومەتە سەرەکیەکانی میسر و وڵاتی شام بە دەستی هەر سێ کوڕەکەیەوە بوو، (الافچل عەلی) کە گەورەیان بوو فەرمانڕەوای شاری دیمەشق بوو، هەروەها (الگاهر- الغازی) شاری حەلەبی بەڕێوەبرد، (العزیز عیمان) لە وڵاتی میسر حوکمڕان بوو، بەڵام حکومەتی سەرەکی چوارەم کە دەکەوتە خاکی کوردستان لە ناوچەی جەزیرە و سەروی دۆڵی رافیدەین و دیاربەکر کە میافارقین پایتەختی بوو بە دەستی (عادل سیف الدین)[3] ی برایەوە بوو، هاوکات (معظم عیسی) کوڕی عادل فەرمانڕەوای (کرک) و ڕۆژهەڵاتی

---

(١) . صالح قەفتان: مێژووی گەلی کورد، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا، ١٩٦٩ز،ص ٢١٧.

(٢) . محمد ئەمین زکی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٧٥.

(٣). "سیف الدین أبوبكر بن ایوب" ساڵی (٥٣٩ک- ١١٤٤ز) لە دایک بوو، دەسەڵاتی میسری وەرگرت لە جێگای سەلاحەددین و ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لەسەر ڕووداوە سیاسیەکان و شەڕی خاچیەکان ساڵی (٦١٥ک- ١٢١٨ز) کۆچی دوای کرد، بڕوانە( الحنبلي: شفاء القلوب في مناقب بني ایوب، ت- ناظم رشید، بغداد، ١٩٧٨، ص٢٠٠- ٢٢٩).

ئوردن) بوو له جێگای باوکی، هەروەها کۆمەڵێک له خزمانی چەند ویلایەتێکیان بەڕێوه دەبرد له وڵاتی شام بۆ نموونه ولایەتی (حماه) له لایەن (المنصور محمد) کوڕی (تقی الدین عمر) بەڕێوه دەچوو که دەکاته برازای سەلاحەددین، ولایەتی (حمص) سەلاحەددین دای به (المجاهد شێرکۆ دووەم) ولایەتی (بەعەلەبەک) درا به (الامجد بهرام شاه)ی کوڕی (فروخ شاه) که ئەمەش برازای سەلاحەددین بوو.[1]

بەڵام له دوای مردنی سەلاحەددین له (٤)ی ئازاری ساڵی (٥٨٩ک/١١٩٣ز) ئەو یەکێتیەی که کەسایەتی و دەسەڵات و لێهاتووی سەلاحەددین رایگرتبوو وەستێنرا و هەموو ولایەتەکان جگه له ولایەتی (کرک) سەربەخۆ و جیاواز بوون، بەمەش سەرەتای کێشه و ململانێ له نێو بنەماڵەی ئەیوبیەکان لەسەر دەسەڵات و بەرژەوەندی تایبەت سەریهەڵدا، و بووه هۆی لاواز بونیان له ناوچەکە، ئەمەش زەمینەی ڕەخساند بۆ دەستتێوەردانی کاروباری ناوخۆیان له لایەن بێگانەکانەوه، ئەوەش سەرەتای له ناوچوونی حکومەتی ئەیوبی کوردی بوو که ڕۆڵ و کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو له سەر گۆڕەپانی سیاسی ناوچەکە و شەڕی خاچیەکان و مێژووی ئیسلام له سەدەکانی ناوەڕاست، ئەم لاوازیه باشترین دەرفەت بوو بۆ پەلاماری مەغۆلەکان و سەرهەڵدانی مەمالیک[2] وەک قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ له ناوچەکە.[3]

بێگومان له سەردەمی ئەیوبیەکاندا گەشەسەندنێکی بەرچاو له وڵاتانی میسر و شامدا بەدی دەکرا به تایبەت له بواری ڕۆشنبیری و هونەری و ئەدەبی و فیکریدا، ئەمەش بەهۆی پەیڕەوکردنی سیاسەتی دوربینانه له هاندان و پێشخستنی کشتوکاڵ و ئابووری و پاراستنی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ شارەکانی ئیتاڵیا و بەستنی سیاسەتی ئاشتی خوازانەوەبوو. له سەرەتای فەرمانڕەوایی ئەیوبیەکانەوه کەسایەتی سەلاحەددین کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو، توانی ڕۆڵی خۆی ببینێت وەک کەسێکی سەرکرده له فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی و به هێزکردنی پایەی

---

(١).جب:س-پ،ل٢٠٤.

(٢). المماليک: پێکهاتەیان لەو کۆیلانەیه که له وڵاتی "اتراک" هێنابویان که دەکەوته ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئاسیا و له هەندێ شوێنی ئەوروپا، دەسەڵاته ئیسلامیەکان بەکاریان دەهێنا له کاروباری کارگێری و سوپا دوای مەشق پێکردنیان و فێرکردنیان، (بڕوانه جمال الدين الشيال: تأريخ مصر الاسلاميه، القاهره، ١٩٦٧،ج ٢/ص ١٤٥).

(٣). د.محسن محمد حسين:الجيش الايوبي،ص١٢٩-١٣٥.

دەسەڵاتی لە میسر و وڵاتی شامدا،[1] هاوکات زۆر سیاسەتی فێڵ و دبلۆماسیەتی بە کاردەهێنا، هەروەها هەریەک لە "مەلیک عادل" پاشا "کامل و تورانشاه" ڕۆڵی خۆیان هەبوو، بە کوشتنی تورانشاه بە دەستی مەمالیک لە ساڵی (٦٥٦ک/١٢٥٨ز) دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەیوبی کوردی کۆتایی دێت، مێژووی ئەیوبی لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا مێژوویەکی پڕشنگدار و پڕ سەروەریە.

سەلاحەددین، سیاسەتمەدار، سەکردەی ستراتیجی، پاڵەوانی سەردەمی خۆی، جەنگاوەر، دیبلوماتکار و بە ناوبانگترین جەنگاوەری مێژووی ئیسلامە و بە یەکێک لە هێما بە نرخ و بە بەهاکانی دەوڵەتی ئەیوبی کوردی و مێژووی ئیسلام دەدانرێت، ئەو کەسێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو کۆمەڵێک تایبەتمەندی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو، وەک (چاکی و دڵنەرمی و خۆش ڕەفتاری) جگە لەوەی لە کاتی شەڕەکانی دژ بە خاچیەکان زۆر بە توانا بووە و بەهەموو توانایەکیەوە لە میانەی شەڕی خاچیەکاندا دەرکەوت، ڕۆڵی ئەو یەکێکە لە داستانە هەرە گەورەکانی مێژووی جیهان بۆ هەر قۆناغێک چەندەها تایبەتمەندی لە خۆ گرتبوو.

سەلاحەددین لە ئەنجامی ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی ناوچەکە دەرفەتی دەرکەوتنی بۆ ڕەخسا وەک سەرکردەیەکی بلیمەت و بەتوانا، بۆ ئەمەش کۆمەڵێک هۆکار یارمەتی دەربوون، لەوانە لاوازی خیلافەتی عەبباسی و تێکچوونی بارودۆخی خیلافەتی فاتمی و مردنی (ئەسەدەدین شێرکۆ)ی مامی کە زەمینەی ڕەخساند بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە میسر ولاواز بوونی خاچیەکان و مردنی (نورەدین مەحمود) و کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی وڵاتی میسر کە زۆر هۆکار و یارمەتی دەربوو بۆ سەلاحەددین، چونکە وڵاتێکی دەوڵەمەند بوو لە ڕووی ماددی و مرۆییەوە جگە لە بوونی چەند فەرماندەیەکی بە توانا لە بنەماڵەی ئەیوبیەکان کە هاوکاری سەلاحەددین بوون بۆ فراوان کردنی سنوری دەوڵەتەکەیان لە ناوچەکەو سەقامگیر بوونی دەسەڵاتیان بەسەر دانیشتوانەکەیدا. سەلاحەددین لە دوای مامی توانی خیلافەتی فاتمی بڕوخێنێت و بەرەی ئیسلامی یەکبخات، ئەمە جگە لە دروستکردنی سوپا و گێڕانەوەی هێمنی و ئارامی بۆ وڵاتی میسر و ڕاکێشانی خاچیەکان بۆ شەڕی "حەتین" کە تیایدا گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێنا جگە لە ڕزگارکردنی "قودس" کە نزیکەی سەدەیەک بوو بە دەست خاچیەکانەوە بوو، هاوکات بەرەنگار بوونەوەی هەڵمەتی سێهەمی خاچیەکان و

---

(١). جب: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٠٦.

ـوزینـەوەی چـاکترین ڕێگـا بـۆ پەیوەنـدی لەگەڵ دوژمنـان ئەویـش ڕێگـای ـیبلوماسیەت و دانوساندن و بەستنی ڕێککەوتننامە بوو کە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات ـە دوای سەلاحەددین زۆر بە زەقی پەیڕەویان دەکرد. لە دوای مردنی سەلاحەددین بە هـۆی سـەرهەڵدانی ململانێـی نێـوان ئەنـدامانی بنەمـاڵەی ئەیوبیەکـان لەسـەر ـەسـەڵات دەوڵەتەکەی ڕووی لە لاوازی کـرد،ئەمەش دەرفەتـی ڕەخسـاند بـۆ دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی دەوڵەتەکە و پەنابردن بۆ لای دوژمنان لە پێناو پڕکردنەوەی ئارەزووەکانیان و نەمانی دەسەڵاتی ئەیوبی کوردی و هاتنی مەمالیک و کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی ناوچەکە و گەڕانەوەی یەکێتی نێوان شام و میسر.

بێگومان هەموو مرۆڤێک کەم و کوڕی خۆی هەیە، سەلاحەددینیش بەدەر نیە لە کەموکـورتی بەڵام کـوڕی سـەردەمی خـۆی بـووە و بەپێـی تێگەیشـتنی ئەو سەردەمە ڕوانیویەتە ڕووداوەکان.

## سەلاحەددین و دەوڵەتی ئەیوبی

سـەلاحەددین کـوڕی نەجمەدیـن ئەیـوبە، لە کوردەکـانی ڕەوادیـیە لە سـاڵی (٥٣٢ک/١١٣٧ز) لە شاری تکریت لە دایک بووە، (نەجمەدین ئەیوب) لە دوای مردنی شـاد، دەسـەڵاتدارێتی تکریتـی گرتـۆتە دەسـت، و لەگەڵ عیمـادەدین زەنگـی دەسەڵاتداری موسڵدا پەیوەندی دۆستانەی بە هێزیان هەبووە، کاتێک (عیمادەدین زەنگی) هێرشی بردەسەر بەغدا، نەجمەدین ئەیوب توانی ژیانی عیمادەدین ڕزگار بکات،[1] سەلاحەددین لەو ڕۆژەدا لە دایک بوو، کە باوک و مامی بە زۆرە ملێ لە تکریـت دەرکـران، نەجمەدیـن ئەیـوب بەپێـی فەرمـانی (عیمـادەدین زەنگی)کـرایە دەسەڵاتداری بەعلەبەک، سەلاحەددین قۆناغی منداڵی لە بەعلەبەکدا بردۆتەسەر، و لەم شـارەدا زانسـتی ئـاین و قورئـانی پیـرۆز و فەرموودەکـانی پێغەمـبەر (د.خ) و فیقهـی ئیسـلام و مێـژوو و زمـان و ئەدەبـی وەرگرتـووە و پێیـان ئاشـنا بـووە، و شارەزاییەکی تەواوی لە یاری تۆپ و ڕاو و سوارچاکیدا بووە، سـەلاحەددین لەگەڵ شێرکۆی مامیدا لە حەلەب بووە، کاتێک مامی لە خزمەتی(نورەدین مەحمود)دا بوو، سـەلاحەددین پـاش زویـر بـوونی بـرا گەورەکەی، بـوو بە سـەرکردەی لەشـکری دیمەشـق لە سـاڵی (٥٥١ک/١١٥٦ز)، بەڵام پـاش مـاوەیەک وازی لەم کـارە هێنـا و گەڕایەوە بـۆ حەلەب، لە سـاڵی (٥٥٦ک/١١٦٠ز) سـەلاحەددین بـۆ جـارێکی دی

---

(١). شرف خان بدلیسی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٧٧.

کرایەوە بەسەر لەشکری دیمەشق،[1] (نورەدین مەحمود) لاوازی فاتمییەکانی بە هەل وەرگرت و توانی میسر ڕزگار بکات و سەرکەوتنی ڕامیاری و سەربازی بە دەست بهێنێت، لە ساڵی (٥٦٠ک/١١٦٤ز)دا سەلاحەددین بەشداری ئەو شەڕانەی کرد کە شێرکۆی مامی پێی هەڵسابوو بۆ ڕزگارکردنی میسر،[2] لە ساڵی (٥٦٥ک/١١٦٩ز) (ئەسەدەدین شێرکۆ) لە سەردەمی دوا خەلیفەی فاتمییەکاندا،کرا بە وەزیر، (ئەسەدەدین شێرکۆ) پاش وەرگرتنی دەسەڵاتداریتی لە میسردا بە ماوەیەکی کورت کۆچی دوایی کرد، سەلاحەددین شوێنی گرتەوە و بوو بە وەزیر لە میسردا لە سەردەمی خیلافەتی فاتمیەکان، مەزنترین ئامانجی سەلاحەددین خۆ بەختکردن و درێژەدان بە جەنگ بوو لە دژی خاچپەکان، سەلاحەددین دوای ئەوەی بوو بە وەزیر توانی خیلافەتی فاتمیەکان لاواز بکات، داوای لە وتاربێژی مزگەوتەکان کرد کە وتارەکانیان لە خزمەت خەلیفەی عەبباسیدا (ئەلموسنەسیر)دا بێت، لە جێگەی خەلیفەی فاتمی، دوای کۆچی دوایی (نورەدین مەحمود)، سەلاحەددین سەربەخۆیی میسری ڕاگەیاند، و دەستی کرد بە بەرهەڵستی(ئیسماعیل کوڕی نورەدین مەحمود) و تورانی برا گەورەی سەلاحەددین، ئەو پشێوییەی بە هەل زانی لە یەمەندا هەبوو، هێرشی بردنەسەر و ڕزگاری کردن بەڵام حیجاز چووە پاڵ میسر، بەم شێوەیە دەوڵەتی ئەیوبی دامەزرێنرا.[3]

## سەلاحەددین و سیاسەتی بەرامبەر خاچپەکان

هەڵوێستی ڕامیاری سەلاحەددین بەرامبەر خاچیەکان لەدوای مردنی (نورەدین مەحمود)، بریتی بوو لە نەرمی و ڕێککەوتن، چونکە سەلاحەددین هەوڵی ئەوەی دەدا بە تەواوی بەسەر خاچپەکاندا سەربەکەوێت تا بتوانێت دەوڵەتێکی بە هێز و یەکگرتوو دابمەزرێنێت، هەر لەبەر ئەمەش بوو ڕێککەوتنی ئاشتی لەگەڵ خاچیەکاندا دەکرد،[4] هەرچەندە گەلێک پێکدادان لە نێوان سەلاحەددین و خاچیەکاندا

(١). محمد ئەمین زکی: م،ن، ص٧٥

(٢). صالح قەفتان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٢٠.

ججج

(٣). محمد ئەمین زکی: م،ن، ص ٧٦.

(٤). محمد رفعت احمد حسونە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٦٧.

ڕوویدا، و سەلاحەددین بە بەردەوامی هێرشی دەبردە سەر شوێنە گرنگ و پتەوەکانی خاچپیەکان، بەڵام هەندێک جار بە شێوەی کاتی و بۆ ماوەی کورت پەیمانی ڕێککەوتنی لەگەڵ خاچپیەکاندا دەبەست، بە مەبەستی خۆ ئامادەکردن و پتەوکردنی ڕیزەکانیان، تا بە تەواوی وڵاتی شام لە دەست خاچپیەکان ڕزگار بکات. لە بەیت ولمەقدیسدا ئاژاوەیەک دروست بوو، ئەم ئاژاوەیە (میری کرک) دەیویست سوودی لێوەرگرێت، بۆ ئەم مەبەستە، هەوڵی ئەوەی دەدا کە پەیمانی ڕێککەوتنی نێوان بەیت ولمەقدیس و سەلاحەددین بشکێنێ، دەسەڵاتداریتی (کرک) هێرشی کردەسەر کاروانێکی مەککە و تالانی کرد، و هەروەها هەوڵی دەدا لە دەریای سوورەوە پەلاماری مەدینە بدات، بەڵام هەندێک لەشکری دیمەشق بەریان لێگرت و شکانیان و گەڕایەوە بۆ کرک.[1] دوای ئەوەی خاچپیەکان پەیمانی ڕێککەوتنیان شکاند، سەلاحەددین دەستی کرد بە خۆ ئامادەکردن و بزووتنەوەی خۆ بەختکردن (جیهاد)ی ڕاگەیاند، لە دیمەشقەوە بەرەو باشوور کەوتەڕێ، و لە شاری بوسراوە ڕووی کردە ئوردن، کاتێک خاچپیەکان زانیان سەلاحەددین لە ڕووباری ئوردن پەڕییەوە، دەستیان کرد بە خۆ ئامادەکردن، و نزیکەی (٥٠) هەزار شەڕکەریان کۆکردەوە، سەلاحەددین لە ماوەیەکی کورت و کەم خایاندا توانی (صفوریە) داگیر بکات، کاتێک خاچپیەکان گەیشتنە چیای تەبەریە، سەلاحەددین هێرشی کردە سەریان و هەموو ڕێگایەکی لێگرتن و ئاوی لێبڕین، لە نیوە شەودا سەلاحەددین گەمارۆی دان، خاچپیەکان هەر ئەوەندەیان پێکرا کە خۆیان بگەیەننە نزیک چیای حەتین، لەوێ دا شەڕێکی سەخت و گران لە نێوان هەردوولا ڕوویدا، و بە سەرکەوتنی سەلادحەین کۆتایی هات و زیانێکی زۆر لە خاچپیەکان کەوت و میری کرک بە دیل گیرا، لە شاری (جای لوز جنان) کە تەنها (١٥٠) شەڕکەر ڕزگاریان بوو، ئەوانیشی بە دیل گرت،[2] ئەم سەرکەوتنەی سەلاحەددین دەگەڕێتەوە بۆ دانانی پلان و نەخشەی سەربازی و لێهاتووی و دانایی خۆی کە لە شەڕەکەدا بە کاری هێنا و بەشداربوونی خۆی لە مەیدانی شەڕدا. سەرکەوتنی سەلاحەددین تەنها ئەوە نەبوو، کە پادشای خاچپیەکان و دارو دەستەکانیان بەدیل بگرێت، بەڵکو ژمارەیەکی بێ سنوری لە خاچپیەکان کوشت، سەلاحەددین ڕووی دەکردە هەر

---

(١).د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م،ن، ص ١٦٥.

(٢).محمد ئەمین زەکی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم/ ص٩٥.

ع

بنکەیەکی خاچیەکان، یەکە یەکە دەیڕوخـان و تێکی دەدا، سـەلاحەددین دانیشـتوانی شـارە ڕزگارکراوەکـانی دڵنیـا دەکـردەوە کە سـەرو ماڵیـان پـارێزاوە، بـۆ ئەم مەبەسـتەش بڕیـاری لێبـوردنی گشـتی دەکـرد، ئەمەش بـووە هـۆی ئاسـان کردنـی ڕزگار کردنی شارەکانی تر.[1]

## ڕۆڵی کورد لە شەڕی خاچیەکاندا

بە دەرکەوتنی (عیمادەدین زەنگی) دەسەڵاتداری موسڵ، کە ئەتابەگی تورک بوو، سـەردەمێکی نـوێ دەسـت پێـدەکات، تیایـدا موسـڵمانەکان سـەردەکەون بەسـەر خاچیەکانـدا، (عیمـادەدین زەنگـی) حـوکمڕانی نـاوچەیەکی دەکـرد، کە پێکهـاتبوو لە (حەلەب و حەران و موسـڵ) و لە نـاوچەی موسـڵ دەوڵەتـی زەنگـی دامەزرانـد، لە سـاڵی (٥٣٩ک/١١٤٤ز) عیمـادەدین زەنگـی شـاری ڕەهـای ڕزگـارکرد لە دەسـت خاچیەکـان، دوای (حـوس و حەمـا و حەلەب)، گەلێـک نـاوچەی دیـکەی سـوریای ڕزگارکرد، بە ڕزگارکردنی ڕەها، عیمـادەدین فەرمـانی دەرکرد بە کۆتـایی هێنان بە کوشتن و بڕین، و داوای لە سەربازەکانی کرد، هەرچی سامان و مـاڵی دانیشـتوانی شارەکە هەیە بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان و هەموو بەندەکانی ئازادکرد، هەروەها بە مەسیحیەکانی ڕاگەیاند کە (عیمادەدین زەنگی) هـاتووە بۆ ڕزگارکردنیـان لە دەسـت فەرەنجەکـان، نەک بـۆ داگیرکردنیـان و تـاڵانی و کوشـتن و بـڕین، ئەم هەڵوێسـتەی عیمادەدین وایکرد، سوریەکان یارمەتی بدەن لە گرتنی ڕەهادا، شکاندنی خاچیەکان لە ڕەهـا بـووە هـۆی ڕوودانـی هێرشـی دووەمـی خاچیەکـان بە سـەرکردایەتی ئیمپراتـۆریەتی (فەرەنـج و ئەڵمـان و ئینگلیـز)، ئەم هێرشـە لە سـوارەی (فەرەنـج و ئەڵمـان و ئینگلیـز) پێکهـاتبوو، ئەو لەشـکرەی لە قـودس ئامـادەکرابوو گەمـارۆی دیمەشـقیدا، بەڵام بـێ سـوود بـوو، و هـیچ پاشـماوەیەکی جـێ نەهێشـت. دوای عیمـادەدین زەنگـی، نـورەدین مەحمـودی کوڕی دەسـەڵاتی گـرتە دەسـت و شـاری حەلەبی کـردە پـایتەختی خـۆی، لە سـاڵی (٥٤٩ک/١١٥٤ز) نـورەدین مەحمـود پاشـا شاری دیمەشقی ڕزگارکرد، بە ڕزگـارکردنی دیمەشـق هـیچ کۆسـپێک نەمـا لە نێوان ناوچەی زەنگیەکان و قودسدا.[2]

---

(١). صالح قەفتان: م،ن، ص ٢٣٤.

(٢). محمد ئەمین زەکی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ب٢/ ص٩٥، صـالح قەفتان: هەمـان سـەرچاوەی پێشوو، ص٢٥٥.

## هەڵوێستی مەمالیك بەرامبەر بە خاچیەكان

مەمالیک لە ڕووی چەمکی مێژووییەوە بە واتای کۆمەڵی کویلەی سپی "مجموعه رقیق البیج" دێن، چونکە زۆربەی ئەم مەمالیکانە پێست سپی بووین،[١] کۆیلایەتی وەک سیستمێک سەرەتا لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا سەری هەڵدا، و دواتر بە هۆی چەند فاکتەرێک ئەم سیستمە گەیشتە ڕۆژهەلات و بە تایبەت جیهانی ئیسلامی، ئەو جیاوازییەی لە سیستەمی کۆیلایەتی جیهانی لە نێوان جیهانی ئیسلامی و ئەوروپا هەبوو ئەوەبوو کە لە جیهانی ئیسلامیدا بۆ کاروباری سەربازی و جەنگیدا بەکاردەهاتن، بەڵام لە ئەوروپا زیاتر بۆ کاروباری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بەکاردەهێنران، ئەوەی پەیوەندی بە بنەچەی مەمالیکەکانەوە هەیە ئەوەیە ناتوانرێت هەموویان بگەڕێنینەوە سەر یەک بنەچە، چونکە لە چەندین شوێنەوە دەهێنران، جا بە هۆی بە دیل گیرانیانەوە بوو بێت یاخود بە هۆی کڕین و فرۆشتنەوە بوو بێت، کە ئەمەی دووەمیان زیاتر پیادە دەکرا، ئەمەش لە کاتێکدا بوو بازرگانەکان لە مەڵبەندە جیا جیاکانەوە دەیانهێنانە جیهانی ئیسلامی و بە نرخی بەرز دەیانفرۆشتن، گرنگترین مەڵبەندەکانی هێنانی مەمالیکەکان و بازرگانی پێکردنیان ئەمانەن:

١. وڵاتی قەفجان و پشت ڕووباری (ماورا و النهر).

٢. لە ناوەڕاستی ئاسیا و شاری سەمەرقەند، نیساپور، وەخان، و مەڕ و.

٣. لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و فەڕەنساوە بۆ ئیسپانیا و لەوێشەوە لە ڕێگای دەریاوە بۆ میسر.[٢]

سەبارەت بەسەرەتاکانی سەرهەڵدان و دەرکەوتنیان، ئەوە بۆ سەردەمی خەلیفەکانی عەباسی دەگەڕێتەوە، و خەلیفە (مأمون)[٣] ئەم دیاردەیەی هێنایە نێو

---

(١). د. سعيد عبدالفتاح عاشور: العصر المماليكي في مصر والشام، الطبعة الآولى، مطبعة لجنة البيان العربي،١٩٦٥، ص١.

(٢). أحمد مختار العبادي: قيام دولة المماليك في مصر والشام، بيروت، ١٩٦٩، ص ١٧- ١٨.

(٣). مأمون: ناوی (عبدالله بن هارون)ە حەوتەمین خەلیفەی بنەماڵەی عەبباسیەکان بوو لە نێو سالانی (١٩٨-٢١٨ک/٨١٣-٨٣٣ز) خەلافەتی عەبباسی گرتە دەست، کەسێکی نزیک بوو لە زاناو فقیهەکان، تەواوکاری ڕێگەی باپیری (أبو جعفر المنصور) بوو لە وەرگێڕانی کتێبی زانستی و فەلسەفی. (الطبري: تأريخ الرسل والملوك،٥٢٧/٨؛المسعودي: مروج الذهب،٣٩٥/٢ ؛السيوطي: تأريخ الخلفاء،٤٩٠).

جج

جیهانی ئیسلامی، چونکه له سەردەمی ئەم خەلیفەیەدا دەسەڵاتی فارسەکان پەرەی سەندبوو به شێوەیەک تەرازووی سیستمی حوکمڕانی خەلیفه "مأمون" بەلای فارسەکاندا دەشکایەوە، بۆیه مأمون بۆ ئەوەی هاوسەنگی حوکم له دەست خۆیدا بهێڵێتەوە، دەستی کرد به کڕینی مەمالیکه تورکەکان و بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی پشتێنێکی سەربازی به هێزی لێ دروست کردن.[1]

سەبارەت به فاکتەرەکانی گرنگی دان به مەمالیک ئەوە ئەو نموونەی سەرەوە و لاوازبوونی خیلافەتی عەباسی و ئارەزوو و ویستی حوکمدارانی ولایەتەکان بۆ سەربەخۆ بوون له خیلافەت هۆکار بوون بۆ زیاتر کڕین و هێنانی مەمالیکەکان بۆ پێکهێنانی لەشکر له پێناو پراکتیزه کردنی ئارەزووەکانیان، جگه له بەکارهێنانی سەربازی واته گەنج و پێگەیشتوو مەمالیکی منداڵیشیان دەکڕی بۆ ئەوەی له ژێر ڕکێفی پەروەردەی خۆیان دابێت و زۆرجار ئەم منداڵانه سۆزی دەسەڵاتدارانیان ڕادەکێشا که بەگەوره بوون و پێگەیشتنیان پلەوپایەی باشیان وەردەگرت، له میسر گرنگی زۆر به هێنانی مەمالیکەکان دەدرا و ورده ورده دەسەڵاتیان گەوره دەبوو، بەجۆرێک "ئەحمەدی کوڕی گۆلۆن" توانی دەوڵەتی گۆلۆنی له میسر دابمەزرێنی که خۆی مەمالیکێکی تورکی سەردەمی خەلیفەی عەبباسی (مأمون) بوو، ژمارەی جەنگاوەرانی لەشکرەکەی "٢٤" بیست و چوار هەزار جەنگاوەر بوون، دوای گۆلۆن "محمدی کوڕی گغیج ئەخشیدی" توانی له ساڵی (٩٣٥ز) له میسر دەوڵەتی ئەخشیدی دابمەزرێنێ که خۆی مەمالیک بوو، هەروەها فاتمیەکان له میسردا سەرەتا پشتیان به سودانیەکان دەبەست دواتر پشتیان به مەمالیکەکان دەبەست بۆ پێکهێنانی لەشکر، تا سەردەمی ئەیوبیەکان.[2]

سەرەتای چەکەرەبوون و گرتنه دەستی دەسەڵات و گێڕانی ڕۆڵی گرنگ و بەرچاوی مەمالیکەکان له میسر و شام، لەدوای مردنی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی بوو له ساڵی (٥٨٩ک/١١٩٣ز)، چونکه به مردنی سەلاحەددین دەوڵەتی ئەیوبی دابەش بوو بەسەر کوڕ و برازا و خزم و کەسیدا، له(دیمەشق و میسر و حلب و کرک و بصری و بعلبک و حمس و حما.... تاد). که بنەماڵەی ئەیوبی

(١). سعید عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص١.

(٢). سعید عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص ٢.

حوکمیان دەکردن، میراتگرەکانی سەلاحەددین لە نێو خۆیاندا بوو بەشەڕیان و ململانێی یەکتریان دەکرد، هەریەکەیان دەیویست ئەوی تر لە ناوببات و دەسەڵات و ناوچەکەی فراوان بکات. ئەمە لە لایەک و لە لایەکی ترەوە ململانێی حوکمدارانی بنەماڵەی زەنگی لە(موسڵ و سنجار و حصن کیفا و ئامەد و بنی سکمان) دژ بە ئەیوبیەکان بوونە هۆی ئەوەی هەریەکەیان ڕاستەوخۆ هەوڵی خۆ بە هێزکردنی بدات و کەرەسەی ئەم بە هێز بوونەش جەنگاوەرانی مەمالیک بوون.(١)

بەم شێوەیە لە دوا ساڵانی سەدەی (١٢) دوازدە و نیوەی یەکەمی سەدەی (١٣) سیازدە، ڕوو لە زیادبوونێکی بەرچاو بوون، نەک تەنها لە بواری سەربازییەوە، بەڵکو لەبواری سیاسیش ڕۆڵی گرنگیان دەبینی، لە ساڵی (٥٩٥ک/١١٩٨ز) سوڵتان (عەزیز عوسمان) کوڕی سەلاحەددینی ئەیوبی کۆچی دوایی کرد، سوڵتان عادلی برای سەلاحەددین ویستی لە شامەوە بچێت حوکمی دەسەڵاتی میسر وەربگرێ وەک میراتگر، بەڵام مەمالیکەکانی (ئەسەدی، ساڵمی) قبوڵیان نەکرد و بانگێشتی مەمالیک (فچل)یان لە خوران کرد و دەسەڵاتی میسریان دایە دەست، لەگەڵ ئەوەشدا هاوکێشەیەک هەبوو هەر کاتێک مەلیک و سوڵتانەکان بە هێز بوونایە ئەوە مەمالیکەکان ڕۆڵ و کاریگەریان لە کاروباری دەوڵەت کەم دەبوو، بە پێچەوانەشەوە، هەر کاتێک مەلیک و سوڵتانەکان لاواز بوونایە ئەوە مەمالیکەکان ڕۆڵ و کاریگەریان زیاتر دەبوو، مەمالیکەکان ڕۆڵی هەرە گرنگیان هەبوو لە هێنانە سەر تەختی "صالح نەجمەدین ئەیوب" ئەمیش بە لادانی عادلی دووەم (٦٣٨ک/١٢٤٠ز) لە حوکمڕانی میسر، صالح کاتێک کە کوردەکان لێی دووركردنەوە پەنای بردە بەر مەمالیک.(٢)

## ڕۆڵی مەمالیکەکان لە جەنگی دژ بە خاچیەکان

لەبەر ئەوەی مەمالیکەکان هێزی سەربازی سەرەکی بوون لە میسر و شام دا، بۆیە ڕۆڵی گرنگیشیان بینیوە لە شەڕەکانی دژ بە خاچیەکان لە سەردەمی حوکمڕانیە جیاوازەکاندا وەک "ئەیوب، بیبرس، قلاون"، لە سەردەمی سوڵتان "صالح

---

(١). سعید عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص ٣.

(٢). سعید عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص ٤- ٥.

نەجمەدیـــن ئەیـــوب"دا لویســـی نـــۆیەم مەلیکـــی بە توانـــای فەڕەنســـا لە ســـاڵی (٦٤٧ک/١٢٤٩ز) فەرمانـدەیی هەڵمەتێکی خـاچی کـرد بـۆ سـەر میسـری کینـانە کە زۆرجـار بە هەڵمەتـی هەشـتەم نـاودەبرێ و بە خێرایـی شـاری (دمیـاگ)یـان گـرت، سوڵتان صالح کە لەوکاتدا زۆر نەخۆش بوو دەبوو خۆی بۆ شـەڕی لویسی نۆیەم ئامادەبکـات، بەڵام مەرگ ڕێـگەی نەدا ئەم کـارە ئەنجـام بـدات، کـاتێ لـویس زانـی (صالح) مردووە ڕووەو شاری مەنصورە هەڵمەتی برد، مەمالیکەکان بێدەنگ بوون تا خاچیەکان بە فەرماندەی (روبرت دی ئارئو) برای لـویس چـوونە نێو کۆڵانەکانی مەنصـورە، کاتێ مەمالیکەکان لێیان هـاتنە دەست ژمـارەیەکی زۆریـان لێکوشـتن و دوایان کەوتن تا (فارسکور) لەوێ شـەڕی یەکلاکەرەوە ڕوویدا ژمـارەیەکی زۆریـان لێ کوژرا و بە دیلی گیران لە نێویاندا (لویسی نۆیەم) مەلیکی فەڕەنسا هەبوو کە بە دەست بەستراوی لە ماڵی (فەخرەدین ئیبراهیم لوقمان)ی مەمالیک زیندانی کرا.[1]

دوای ئەم ســـەرکەوتنە گەورەیە (تورانشـــای کـــوڕی صـــالح نەجمەدیـــن) کە لە جێگای باوکی دەسەڵاتی وەرگرتبوو، کەوتە دژایەتی کردنـی زڕ دایکـی (شـجر الدر) و لە دژی فەرماندەکانی مەمالیک دەجوڵایەوە، ئەوەبوو (شـجر الـدر) و فەرماندەکان لەسـەر نـاوبردنی (تورانشـاە) ڕێککەوتـن گرنگتـرین فەرمانـدەکانی بە شـداربوو لەم پلانە (١- بیبرس البنقداری، ٢- قلاون المصـالحی، ٣- أقگـای الجامـداری، ٤- ایبیک الترکمـانی) ئەوە بـوو توانیـان لە (فاسـکردی) لە نـاوی ببەن، بەم شـێوەیە حـوکمی بنەمـاڵەی ئەیـوبی کۆتـایی پێهـات، (شـجر الـدر) تـورک بـوو صـالح کڕیبـوی و دواتـر خواستی بۆیە لە مەمالیک نزیـک بـوو، (مەقریـزی) دەڵـێ (وأول مـن ملـک مصـر مـن ملوک الترک الممالیک)[2] شجر الدر لەگەڵ فەڕەنسیەکان پێکهات و مەترسـی لەسـەر مصـر دروخستەوە.

### سەردەمی زاهر بیبرس

(ڤـاهر بیبـرس) نازنـاوی کەسـایەتێکە کە ڕۆڵـی گەورەی بینیوە لە جەنگـان دژی هەڵـــمەت و میرنشـــینەکانی خـــاچی... بیبـــرس دوای لە نـــاوبردنی (قگـــز) لە ســـاڵی

(١). سعید عبدالفتاح عاشور: م. ن،ص ٨.

(٢).د. سید الباز العرینی: الممالیک، مطبة دار النهضة العربیة، مصر، ١٩٦٧،ص ٤٥- ٤٦.

(٦٥٩ك/١٢٦٠ز) له دوای سەرکەوتنی له شەڕی (عەین جالوت) بەسەر تەتەرەکان، توانی دەسەلاتی میسر وەربگرێ.[1] بیبرس سەرەتا کۆمەڵێک ڕێوڕەسمی ناوخۆیی ئەنجامدا، که بریتی بوو له لێدان و ناوبردنی نەیارانی و ڕێکخستنەوەی لایەنە جیاکانی بەڕێوەبردن، ئەمە سەبارەت به سیاسەتی ناوخۆ، بەلام سەبارەت به سیاسەتی دەرەکی ئەوە چەندین کاری ئەنجامدا بۆ به هێزکردنی دەسەلاتی و دوورخستنەوەی مەترسی لەسەر میسر، ئەم کارانەی ئەنجامدا.

١. هاوپەیمانی بەست لەگەڵ تتاری مەغۆل دژ به تتاری فارس.

٢. هاوپەیمانی بەست لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆمی بیزەنتی وەک پەناگیریەک بۆ سیاسەتەکەی.

٣. دامەزراندنەوەی خیلافەتی عەبباسی له میسر و شام، ئەمەش بۆ شەرعیەتدان بوو به حوکمەکەی.

٤. پێک نەهاتن لەگەڵ تتاری فارس، چونکه به بکوژی خەلیفەو پارچه پارچه کردنی خیلافەت یا ڕاستر دەوڵەتی ئیسلامی دا دەنان، ئەمەشی وەک پروپاگەندەیەک به کاردەهێنا بۆ سەرنج ڕاکێشانی موسڵمانان.

٥. له ساڵی (٦٧٦ك/١٢٧٧ز) هێرشی کردەسەر سەلاجقەکانی ڕۆم، چونکه یارمەتی تتارەکانیاندا و سەرکەوتنی گەورەی بەسەردا هێنان.[2]

بەسەرنج دان لەم (٥) پێنج خاڵە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە که بیبرس ڕووبەڕووی دوو مەترسی گەورە بوەتەوە ئەوانیش(تتار و خاچیەکان) بوون که هەردوو له زۆربەی کاتدا هاوپەیمانی یەکتر بوون دژ به دەسەلاتی ئیسلامی، ئەم هاوپەیمانیەتیە لەسەر بنچینەی بەرز واژۆ کرا و بەردەوام بوو، وەک هاوپەیمانی نێوان (پاپا و هۆلاکۆ) هەروەها هاوپەیمانی تتار لەگەڵ میرنیشنی ئەرمینیای بچووک که مەسیحی بوون، ڕەنگە (دوو قوزخاتون)ی ژنی هۆلاکۆ که مەسیحی نەستوری بوو کاریگەری هەبووبێ، بۆیە هۆلاکۆ هەر شارێکی بگرتایە گیان و ماڵی مەسیحیەکانی دەپاراست، بۆ تێگەیشتن و ئاسانکاری له کردە سەربازییەکانی بیبرس دژ به خاچیەکان به شێوەی خاڵ دەیانخەینە ڕوو:

---

(١). د. سيد الباز العريني: م.ن،ص ٤٩.

(٢). سعيد عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص ٤٢- ٤٤.

١. بیبرس دوای خۆ قایم کردن خۆی بۆ شەڕی خاچیەکان یەکلا کردەوە، چونکە باکور و باشووری شام و کەنارەکانیشیان لەژێر دەستدا بوو، ئەوە بوو لە ساڵی (٦٥٩-٦٦٠ک/١٢٦٠- ١٢٦١ز) هێرشی کردەسەر میرنشینی (ئەنتاکیە) بۆ سەرکوت کردنی شا (بوهیموندی شەشەم)، بیبرس خەریک بوو شارە کە بگرێت، بەڵام (هیپوم) مەلیکی ئەرمینیای بچووک بە هاوکاری تتار نەیانهێشت ئەم کارە سەربگرێ.

٢. لە ساڵی (٦٦٤ک/١٢٦٥ز) هێرشێکی گەورەی کردەسەر خاچیەکان و توانی شارەکانی (غەززە، یافا، قیساریە، وعتلیت) بگرێت هەروەها ئارسوفیشی دوای بەرگرییەکی توند گرت، دواتر ڕووی کردە (عەککا)، بەڵام (هیوی سێیەم)ی مەلیکی قودس تدخلی کرد و هیواکەی سەری نەگرت و گەڕایەوە.

٣. لە ساڵی (٦٦٥ک/١٢٦٦ز) بیبرس توانی شارەکانی عەککاو قەڵای سەختی (مترین) بگرێت، دواتر هێرشی کردەسەر (صف) و گرتی، هەروەها "صوتین، وتبین" و شاری رملە و هەندێ شوێنی نزیک ترابلسی گرت.

٤. لەشکرێکی گەورەی بە فەرماندەی "أمیر قلاون و مەلیک مەنصور ئەیوبی" بۆ سەر مەملەکەتی ئەرمینای بچووک نارد و توانیان پایتەخت بگرن و کوڕێکی "هیپومی مەلکی ئەرمنیا" بکوژن و یەکێکی تری بە دیل بگرن، هەروەها پایتەختیان سوتاند ئەمەش لە ساڵی (٦٦٥ک/١٢٦٦ز) بوو.

٥. لە ساڵی (٦٦٦ک/١٢٦٧ز) هێرشی کردەسەر "گبریە و عەککا و یافا و شقیق دانونی" و دەستی بەسەردا گرتن سەرکەوتنەکانی ساڵی (١٢٦٨ز) بەگرتنی میرنشینی ئەنتاکیە پشت ئەستور تر کرد، کە توانیان دەستکەوتێکی گەورە و نزیکەی (١٠٠) هەزار کەس بە دیل بگرن.

٦. ساڵی (٦٦٩ک/١٢٧١ز) هێرشی کردەسەر میرنیشنی (تەرابلوس) و گرتی، هەروەها قەڵای کوردان و قەڵای ڤرینی سەختیش گرت.

٧. هێرشێکی دەریایی کردە سەر قوبرص، بەڵام بە هۆی دۆخی ئاووهەوا هەوڵەکەی سەری نەگرت.

٨. ساڵی (٦٧٠ک/١٢٧١ز) ئاشتی کاتی لەگەڵ خاچیەکان کرد، بەڵام هەر خۆی ئەم ئاگر بڕەی شکاند و لە ساڵی (٦٧٤ک/١٢٧٥ز) هێرشی کردەسەر ئەرمینیای

بچووک و ساڵی (٦٧٦ک/١٢٧٧ز) هێرش کردەسەر ڕۆمی سەلجوقی و تتارەکان لە شەڕی (ئیلستین) تێکیشکاندن و هەر ئەو ساڵەش خۆی مرد.[١]

## سوڵتان (ئەشرەف خەلیل)ی کوڕی قلاون

سوڵتان سیف الدین هەر لە ژیانیدا بوو کوڕەکەی (علا و الدین)ی کردە جێنشینی خۆی، بەڵام (علا و الدین) کە بە (ملک الصالح) ناسرابوو لە ساڵی (٦٨٧ک/١٢٨٨ز) مرد بۆیە دەبوایە جێنشینی خۆی بدات بە کوڕی دووەمی کە بە ناوی (الاشرف خلیل بن قلاون) ناسرابوو، بەڵام(سیف الدین) ڕازی نەبوو جێنشینی بدات بە (خەلیل) بۆیە کاتێ داوایان لێکرد سوڵتان (سیف الدین) وتی "أنا ما اولی خليلا على المسلمين" چونکە ئەمیرەکان خۆشیان نەئەویست لەبەر ئەوەی هەردەم گاڵتەی پێدەکردن و تاوانبار بوو بەوەی دەستی هەبووە لە کوشتنی یا مردنی (علا و الدین- ملک صالح)ی برای، و کاتێ (سیف الدین) مرد، خەلیل داوای لە قازی (عبدالقاهر)ی خاوەن دیوان کرد کە کوا تقریرم؟ قازیش تقری بۆ هێنا بەڵام واژۆی سوڵتان (سیف الدینی) پێوە نەبوو بۆیە وتی (ان السلفان اقنح ان ان يعگینی فأعگانی الله) دواتریش ئەمیرەکان سوێندیان بۆ خوارد و بوو بە سوڵتان (الاشرف خلیل بن قلاون).[٢]

خاچیەکان بە هەواڵی مردنی سوڵتان (سیف الدین)خۆشحاڵ بوون چونکە پێیان وابوو شاری عەککا لە ژێر هەژمونی هێرشی مەمالیک ڕزگاری بوو، بەڵام سوڵتان خەلیل سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو لەشکرەی کە باوکی ئامادەی کردبوو بۆ هێرش و گەمارۆدانی شاری عەککا هەمان ئامانجی پێ بەجێ بهێنی، هەروەها نامەی بۆ حوکمدارانی شام نارد کە هێزەکانیان کۆبکەنەوەو لە دەوری شاری عەککا یەکتر بگرنەوە، ئەوە بوو لەشکرێکی یەکجار زۆر لە دەوری شاری عەککا کۆبووەوە کە ژمارەیان (٦٠) هەزار سور و (١٦٠) سەدوشەست هەزار پیادەبوو، بەچەک و تفاق و کەرەستەی گەمارۆدان گەمارۆی عەککایاندا، لە بەرامبەردا خاچیەکان خۆیان کۆکردەوە و نزیکەی (٣٠- ٤٠) هەزار جەنگاوەر لە عەککا

---

(١). سعید عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص٦٢- ٦٤، و د. خاشع المعاضیدي واخرون: الوطن العربي والغزو الصلیبي،ص ٢٣٣- ٢٣٧.

(٢). سعید عبدالفتاح عاشور: م.ن،ص٧١- ٧٢.

کۆبوونەوە، هەروەها مەلیکی قبرس بە خۆی و (٢٠٠) سوار و (٥٠٠) پیادە گەیشتە عەککا، بەڵام زۆر نەمایەوە و گەڕایەوە قبرس، هەروەها لەشکری خەلیل بە مەنجەنیق توانیان کەلێنێک بکەنە شورای عەککا و لەوێوە بچەنە ژوورەوە، شەڕی گەرم ڕوویدا و سیخوریەکان زۆریان کوژران و ئەوانی تر ڕایانکردە ناو بەلەمەکانی دەریا، بەڵام زۆریان نوقم بوون لەبەر بارگرانی، بە گرتنی عەککا سەرجەم قەڵاو شوێنە سەختەکان چۆڵ کران و ئیتر خاچیەکان لە شامدا نەمان، بەم شێوەیە لە ئابی ساڵی (٦٩٨ک/١٢٩٨ز) هەموو شارەکان کەوتنە دەست سوڵتان خەلیل.[١]

(١). د. خاشع المعاضيدي واخرون: م.ن،ص ٢٥١.

## هەڵمەتی سێهەمی خاچپەکان

داگیر کردنی وڵاتی شام لە لایەن خاچپەکانەوە نزیکەی سەدەیەکی خایاند، ئەوان لە بارێکی بە هێز و هێرشی بەربڵاودا بوون، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە نورەدین مەحمود زەنگی سەرۆکایەتی جیهانی ئیسلامی وەرگرت و هەوڵ و کۆششی دەدا لە پێناو گۆڕینی باڵانسی هێزەکانی نێوان هەردوو لادا، بەم جۆرە نورەدین مەحمود بەرەی ئیسلامی لە باری بەرگریەوە گۆڕی بۆ هێرشبردن، و خاچپەکانی کردە ئامانجی هێرشەکانی،[1] نورەدین مەحمود پێی وابوو هەرگیز ناتوانرێت بەرەی ئیسلامی بخرێتە ئاستی هێرش بردن گەر یەکێتی وڵات بەدی نەیەت، بۆ سوود وەرگرتن لە سەرچاوە مادی و مرۆییەکان لە پێناو خزمەتکردنی جیهاددا، نورەدین مەحمود پاش ئەوەی توانی یەکێتی نێوان میرنشینەکانی جەزیرە و موسڵ و وڵاتی شام بەدی بهێنێت، بوو بە خاوەن هێزێکی هێرشبەر کە لە ڕێگەیەوە توانی مەترسی بۆ میرنیشینەکان دروست بکات و ئەو میرنیشینانەی دەکەوتنە باکووری شامەوە سنورداریان بکات بە جۆرێک نەوێرن بە تەنها لە دژی بجەنگن،[2] نورەدین مەحمود بڕیاریدا وڵاتی میسر بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، لەگەڵ "املریک" کەوتبووە ململانێ بۆ گرتنی میسر، چونکە نورەدین مەحمود پێی وابوو هەر لایەک دەستبگرێت بەسەر میسردا، دەبێت بە براوەی جەنگ دوا جاریش نورەدین مەحمود توانی دەست بگرێت بەسەر میسردا و بیخاتە سنوری دەوڵەتە یەککگرتووەکەیەوە،[3] نورەدین مەحمود لەم هەنگاوەیدا چەند ئامانجێکی سەرەکی هەبوو، گرنگترنیان:

١. سوود وەرگرتن لە سەرچاوە ماددی و مرۆییەکان بۆ بەهێزکردنی بەرەی جیهانی ئیسلامی.

٢. دوورخستنەوەی خاچپەکان لە میسر بۆ ئەوەی نەتوانن سود لە سەرچاوە گەورەکانی وەربگرن بۆ بە هێزکردنی خۆیان.

٣. ژیاندنەوەی گۆڕەپانی بزووتنەوەکانی باشوور کە لە ماوەی کۆتایی سەردەمی فاتمیەکاندا فەرامۆش کرابوو، بە مەبەستی ناچارکردنی دوژمن بۆ ئەوەی

---

(١). د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص١٧٦.

(٢). خاشع المعاضيدي: الحياة السياسية في بلاد الشام خلال العصر الفاطمي، بغداد، ١٩٧٥، ص٢٠٠.

(٣). د. قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، عالم المعرفة (١٤٩) الكويت، ١٩٩٠، ص ١٤١.

له چەند لایەکەوە شەڕ بکات، بەم جۆرەش هێزەکانی لە سنورەکانی جەنگدا دابەش دەبن دواجار لاوازیش دەبن،[1] لەو کاتەی کە نورەدین مەحمود خۆی بۆ هێرشێکی توند دژ بە خاچیەکان و دەرکردنیان لە وڵاتدا ئامادەکرد، پاش ئەوەی توانی یەکێتی سیاسی لە میسر و شامدا بینا بکات کۆچی دوایی کرد، لە پاش نورەدین مەحمود سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی هاتە گۆڕەپانی ڕووداوەکان و لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو کاری دەکرد، ماوەی دەسەڵاتەکەی بە درێژبوونەوەی دەسەڵاتی نورەدین مەحمود دادەنرێت، توانی بە ئازایەتی و ئەزموونیەوە وەک هەنگاوێکی سەرەتایی یەکێتی وڵات بگەڕێنێتەوە، هاوکات کاریکرد بۆ ئەوەی خاچیەکانی ناوچەی باشووری وڵاتی شام لەناوببات،[2] سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی کاریکرد بۆ بە هێزکردنی بەرەی ئیسلامی و ئامادەکردنی بۆ جەنگێکی یەکلاکەرەوە لەگەڵ خاچیەکاندا، بە جۆرێک سەرکەوتنی هێزی موسڵمانانی تیادا مسۆگەر بێت، بۆیە کاریکرد بۆ دروستکردنی بارودۆخێکی لەبار تا خاچیەکانی گەیاندە دۆڵی "حەتین"، لە ساڵی (٥٨٣ک/ ١١٨٧ز) شەڕێکی گەورە و بەر فراوان لەم دۆڵەدا ڕوویدا لە نێوان لەشکرەکەی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی و لەشکری خاچیەکاندا، لەپاش کوشتارێکی زۆر، لەشکری سەلاحەددینی ئەیوبی سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا لە دەرئەنجامە گرنگەکانی ئەم جەنگە لە ناوبردنی سوپای خاچیەکان و نەهێشتنی مەملەکەتی بەیت ولمەقدیس و دروستبونی مەترسیەکی گەورە بوو لە سەر تەواوی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵاتدا،[3] خاچیەکان پێیان وابوو ئەگەر بیانەوێت پاش شەڕی حەتین لە ڕۆژهەڵاتدا بوونیان هەبێت ئەوا دەبێت ئەوروپا بە زووترین کات هەڵمەتێکی نوێیان بۆ بنێرێت، بۆیە چەند نێردراوێک گەڕانەوە ئەوروپا و باسی بارودۆخ و بەسەرهاتی خاچیەکانیان کرد لە ڕۆژهەڵات و وتیان مانەوەیان پەیوەستە بە گەیشتنی هێز، یەکێک لە نێردراوەکان سەرۆکی (اسقفیە صور) بوو کە بە "صوسیس" ناو دەبرا، نێردرا بۆ لای پاپا و پادشاکانی ئەوروپا بۆ ئەوەی مەترسی بارودۆخی خاچیەکان باس بکات، ئەمەش کاریگەری باشی هەبوو، چونکە پاپا و پادشاکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا قایل بوون بە دەرکردنی بڕیارێک بە ناردنی

---

(١). د. قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوە،ص١٤١.

(٢). رانسیمان: تأریخ الحروب الصلیبیه، ج ٢/ص ٦٤٣.

(٣). رانسیمان: هەمان سەرچاوە، ج ٣/ص ٦٨.

هەڵمەتێکی نوێی خاچپەکان بۆ ڕۆژهەڵات و ڕزگارکردنی شاری قودس لە دەستی موسڵمانان، یەکەم هێز کە گەیشت ئەو هێزە بوو کە پادشای صقلیە "ولیەمی دووەم" ناردبووی کە لە "٣٠٠" سوار پێک هاتبوو،سەرەڕای زۆری هەوڵەکان بۆ بە خێرایی ناردنی سوپا بەڵام هەڵمەتەکە زۆر درەنگ کەوت، هێزەکانی فەڕەنسا و ئینگلتەرە تا هاوینی ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) نەکەوتنە ڕێ، هەردوو سوپاکە لە (٥٨٦-٥٨٧ک/١١٩٠- ١١٩١ز) وەرزی زستانیان لە دورگەی صقلیە بردەسەر،[1] بەڵام سوپای ئەڵمانیا کە بەهێزترینیان بوو بە سەرکردایەتی "ئیمپراتۆر فردریک بەربەرۆسا" لە (٥٨٥ک/ ١١٨٩ز) بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتەڕێ بۆ بەشداری کردن لە هەڵمەتی سێهەمی خاچپەکان، بەمجۆرە سوپای سێ وڵاتی گەورە و بەهێزی ئەورووپای ڕۆژئاوا بە سەرکردایەتی پادشاکانیان بۆ فریاکەوتنی خاچپەکان لە ڕۆژهەڵات و گەڕاندنەوەی شاری قودس بۆ ژێر ڕکێفی خۆیان پێشکەوتن، سوپاکانیش بەمجۆرە بوون:

١. سوپای ئەڵمانیا- بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆر- فردریک بەربەرۆسا.
٢. سوپای فەڕەنسا- بە سەرکردایەتی پادشا- فیلیب ئۆکستس.
٣. سوپای ئینگلیزی- بەسەرکردایەتی پادشا- ریتشارد شێردڵ.

ئەم سوپایانە هێزی هەڵمەتی سێهەمی خاچپەکانیان پێکدەهێنا، لەبەر ئەوەی سوپای ئینگلتەرە و فەڕەنسا لە یەک کات و لە یەک تەوەرەوە هاتن کە ئەویش ڕێگەی دەریایی بوو، یەک سوپای گەورەیان پێکهێنا، ئەوە بەشی یەکەم بوو، بەشی دووەم سوپای ئەڵمانی بوو کە لە وشکانیەوە هاتن و کاریان تەنها گەڕان و بەدواداچوونی ئەو ڕێگە و بانانە بوو کە بەشی یەکەمی سوپاکە "فەڕەنسا و ئینگلتەرە"ی پێدا دەهات لەو ناوچانەی هاوسنووری وڵاتی ئیسلامی بوو تا دەگەیشتن بە خاچپەکانی عەککا،[2]

فردریک بەربەرۆسا سەرەنجی زۆر لە مێژوونووسانی هەموو سەردەمەکانی ڕاکێشاوە، لەبەرئەوەی پیاوێکی زۆر ئازا و لێهاتوو و هاوکات سوار چاکی

(١). د.سعيد عبدالفتاح عاشور:الحركة الصليبية،ج٢/ص٨١٢.
(٢). د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن،ص ١٧٧.

سەردەمی خۆی بووە، جگە لە قارەمانی و جوامێری لە ڕادەبەدەر و ئارەزوومەندی بۆ شەڕ و حەز بە سەرکێشی کردن، لەگەڵ خەڵکدا بە بیرو بۆچوونی خۆی نەک بە یاسایەکی وشک دادپەروەر بوو، لەو بارەیەوە مێژوونوس نیشر دەڵێت "لە دوای شارلەمان ئەڵمانیا پاشای وای لە بە توانایی و فەرمانڕەوایی بە هێز و دڵ نەرمیدا بەخۆوە نەبینیوە"،[1] ئەمانە لە کەسێتی بەربەرۆسادا بەدیدەکران بۆیە بە نموونەی سەرکردە و سوارچاکی ئەو سەردەمە ناودەبرا. لە هەڵمەتی سێهەمی خاچیەکاندا سوپای ئەڵمانی کە گەورەترین سوپا بوو بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتە جووڵە و بە باشی مەشق و خۆڕێکخستنی خۆی کرد بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆری ئەڵمانی فردریک بەربەرۆسا و بە هاوکاری کوڕی دووەمی فردریک میری سوابیا، بەربەرۆسا لە هەڵمەتی دووەمدا بەشداری کردبوو، بۆیە ئاکامەکانی هەڵمەتی دووەم کاریگەری لە سەری دروستکردبوو، سوپاکەی لە ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا لە لایەن دانیشتوانی گوندەکان و چەتە بلغار و حزبەکانەوە ڕووبەڕووی ناڕەحەتی بووەوە، کاتێ سوپاکەی گەیشتە ئەدەنە لەوێ تا کۆتایی مانگی مارسی ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) مایەوە، پاشان بە هاوکاری پاپۆڕەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی پەڕیەوە بۆ وشکانی ئاسیا.[2]

## هەڵوێستی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بەرامبەر سوپای ئەڵمان

یەکەم پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆری ئەڵمانی و بیزەنتی "اسحاق ئەنجیلیوس" ئەو کاتە بوو کە ئیمپراتۆری ئەڵمانی هەستا بە کۆکردنەوەی سوپا، بەمجۆرە ئیمپراتۆری بیزەنتی باڵوێزێکی نارد بۆ ئەڵمانیا بۆ ئەوەی بەیەکەوە پەیمانێک ببەستن و کار بکەن بۆ پەڕینەوەی سوپای ئەڵمانیا بە خاکی بیزەنتەدا،[3] لەگەڵ ئەوەشدا بیزەنتیەکان هەستی دوژمنکاریان بەرامبەر ئەڵمانەکان هەبوو، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

---

(١). د. اسمت غنيم: الدولة الايوبية والصليبيون، دار المعرفة، القاهرة، ١٩٨٨،ص٤٧.

(٢). ه- ا- ل، فشر: تأريخ اوروبا "العصور الوسطى" ق١، ت- السيد الباز العريني وسيد مصطفى زياده، دار المعارف مصر، القاهرة، ص١٨٧.

(٣). رانسیمان: هەمان سەرچاوە، ج٣/ص٣٣.

١. به تێڕوانینی بیزەنتەکان بۆ نازناوی ئیمپراتۆری لە دوای شارلەمان لە ساڵی (٨٠٠ز)کە لە لایەن پاپا لیوی سێهەمەوە کرا بە ئیمپراتۆر، کەسی تر ئیمپراتۆر نیە تەنها ئیمپراتۆری بیزەنتە نەبێت.[١]

٢. هاوپەیمانی نێوان ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی (فردریک بەربەرۆسا) و نۆرمانەکانی صقلیە کە دوژمنی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتە بوون.[٢]

٣.هاوپەیمانی بیزەنتەکان لەگەڵ سەلاحەددیندا، لە بەرئەوەی بیزەنتەکان چاویان بڕیبووە ئەوەی سەلاحەددین پاش دەرکردنی خاچیەکان جێگە پیرۆزەکانی شاری قودسیان بداتێ.[٣]

٤. هەڵوێست وەرگرتن لە فردریک بەربەرۆسا کاریگەری زۆری هەبوو لە ڕەفتاری کاتی هەڵمەتی سێهەمیدا.[٤]

لە ئەنجامدا ئیمپراتۆری بیزەنتی کەسێکی نارد بۆ لای سەلاحەددینی ئەیوبی بۆ ئەوەی هەواڵی گەیشتنی هێزی ئەڵمانی بۆ ئەدەنەی پێ ڕابگەیەنێت، هەروەها پەیمانیدا بە سەلاحەدین نەهێڵێت سوپای ئەڵمانیا تێپەڕێت بۆ ئەنادۆڵ، بەڵام بەهێزی سوپای ئەڵمانیا بیزەنتیەکانی ناچار کرد تا وشکانی ئاسیا هاوکاری سوپاکە بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپراتۆری بیزەنتی قۆناغەکانی جموجۆڵی هێزەکانی ئەڵمانیای بە بەردەوامی بە سەلاحەددین دەگەیاند،[٥]هەرچەندە بۆ خەمڵاندنی هێزی سوپای ئەڵمانیا هەموو سەرچاوەکان کۆکن لەسەر زۆری و کامڵی و بە هێزی و مەشق و ڕێکخستنی سوپای ئەڵمانیا، بەڵام سەرچاوەکان لەسەر ژمارەی سوپاکە ڕا جیاوازن، هەندێک لە سەرچاوەکان به (١٠٠- ٣٠٠) هەزار سەرباز خەمڵاندویانە، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان بە (١٠٠-١٥٠) هەزار دەیخەمڵێنن، ئەمەش خەمڵاندنێکی قبوڵکراوە.[٦]

پاش ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا بە تەواوی پەڕینەوە بۆ کەناری ڕۆژهەڵاتی دەردەنیل، لە کۆتایی مانگی مارسی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) بە هاوکاری بیزەنتەکان

---

(١). د. اسمت غنيم: هەمان سەرچاوە،ص ٤٨.

(٢). د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج٢/ص ٨١٣

(٣). د. عاشور: م.ن،ج ٢/ص ٨١٣

(٤). أبو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، ج٢/ص١٥١.

(٥). رانسيمان: م.ن،ج ٣/ص٣٢؛ عاشور: م.ن،ج ٢/ص٨١٢

(٦). د. اسمت غنيم: م.ن،ص٤٩.

گەیشتنە وشکانی، لەگەڵ چەند گۆڕانکاریەکدا، بەهەمان ڕێگەدا ڕۆیشتن کە هەڵمەتی دووەمی خاچیەکانی پێیداتێپەڕ بوو، ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەو بەشەی ڕێگەکەیە کە خاکی سوڵتانی سەلجوقیە ڕۆمەکان بوو، ئەم ڕێگەیە لە پاش دەردەنیلەوەیە لە کەناری دەریاوە کە خاکی ڕومە بیزەنتیەکانە،[1] دەست پێدەکات تا دەگاتە شاری ئەفیسوس لە باشووری شاری ئەزمیر، دانیشتوانی ناوچەکە لەبەر رق وکینە هێرشیان دەبردە سەر بەشی کۆتای سوپاکە،[2] ئەمەش وایکرد ئیمپراتۆر فردریک لە دژیان چەند هەنگاوێ بنێ و سزایان بدات، سەرباری ئەو هێرشانەی ڕووبەڕووی بووەوە هێزەکە بەردەوام پێش دەکەوت، ئەمەش بەهۆی سەرکەوتنی تەواوی بەسەر هێزی سەلجوقیەکاندا کە نەیانتوانی ڕێگە بگرن لە هێزەکانی ئەڵمانیا، سەرکردەکانی سەلجوقیە ڕۆمەکان چەند نەخشە و پلانێکیان دانا بۆ هێرش بردنەسەر سەرگەردانەکان (ئەوانەی هاتبوون و داوای خواردنیان دەکرد)، هەرچەندە نەخۆشی بڵاو بویەوەو چەندین زیانی گەورەی بە سوپای ئەڵمانی گەیاند، لەگەڵ ئەوەشدا سوپاکە بەردەوام بوو لە پێشکەوتنیدا تا گەیشتە شاری قونیەی پایتەختی دەوڵەتی سەلجوقیە ڕۆمەکان، لەوێدا ڕووبەڕووی هێزەکانی (قگب الدین ملکشای) دووەمی کوڕی سوڵتان قلج ئەرسەلانی دووەم بوونەوە،شەڕێکی قورس لە نێوانیاندا ڕوویدا، تیایدا هێزەکانی ئەڵمان لە (٥٨٦ک/ ١١٩٠ز) توانیان هێزی سەلجوقیەکان بشکێنن و بچنە شارەکەوە،ماوەیەکیش لەوێ مانەوە و هێزەکەیان دووبارە ڕێکخستەوە و پاش (٥) ڕۆژ بەجێیان هێشت و بەرەو قرمان چوون و توانییان بگەنە ئەوێ، لە قرمان هێزەکە بە نێو دۆڵ و گەروەکانی شاخەکانی تۆرۆسدا تێپەڕ بوو، بەبێ ئەوەی ڕووبەڕوی هیچ بەرەنگاربوونەوەیەک بێتەوە،[3] پاشان بەرەو باشوور کەوتەڕێ تا لە مانگی حوزەیران چووە ناو دەشتی سلۆڤیا کە دەکەوێتە کەناری باکوری دەریای سپی ناوەڕاست، لێرەدا ئیمپراتۆر فردریک بەربەرۆسا لەگەڵ هێزە تایبەتەکەیدا پێش سوپاکەی کەوت و بەرەو شاری سلوقیە بەڕێکەوت تا گەیشتە ڕووباری (کالیکادنوس)، کاتێ ویستی بپەڕێتەوە تیایدا نوقم بوو پاش ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا چوونە ناو ناوچەی ئەرمینیای بچووکەوە

---

(١). د. اسمت غنیم: م.ن،ص٤٩.

(٢). د. اسمت غنیم: م.ن،ص٤٩.

(٣). أبن واصل: مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٧٥،ج ٢/ص ٣١٩

(كه دانيشـــتوانەكەى ئەرمەن بــوون و خزمەتـــى كـــارگێرى زۆريـــان بەو شـــوێنە كردبـــوو)،[1] مێژوونوســـــان بـــاس لەو تـــرس و دڵە ڕاوكێـــيە دەكەن كە تووشـــى موســـڵمانان بـــوو، كاتێـــك موســـڵمانەكان بيســـتيان ئيمپراتـــۆر بەربەرۆســـا بە ســـەركردايەتى زيـــاتر لە (١٠٠) هەزار خـــاچى بـــۆ ڕزگـــاركردنى شـــارى قـــودس گەيشتوەتە ئەرمينيا، سەلاحەددين بۆ خۆى تووشى بارێكى دەروونى خراپ هات، ئەوكات بڕياريدا بە ڕووخاندنى شوراى "گبريە، يافا و ارنون و قيسارية و صيدا و جبل" و گواستنەوەى دانيشتوانەكەى بۆ شارى بەيروت.[2]

بەربەرۆسا لە كاتى پەڕينەوەى لە دەرياى كاليكادنوس لە ئەرمينيا خنكا، لەم بارەيەوە چەند گێڕدراوەيەک هەيە هەنديكيان دەڵێن "لە كاتى پەڕينەوەيان خۆى هەڵـداوەتە نـاو ئـاوەكە چـونكە زۆر گەرمـاى بـووە"، بەڵام راى دووەم دەڵێـت "ئەسپەكەى فڕێى داوەتە نـاو ئاوەكە و بەربەرۆسا جل وبەرگى جەنگى لە بەردا بووە كە زۆر قورس بوون بەو هۆيەشەوە خنكاوە"، بەڵام گێڕانەوەى سێهەم دەڵێت "لە كـاتى مەلەكـردن خنكـاوە"،[3] بە هەرحـاڵ مردنـى خـاڵێكى گرنـگ بـوو بـۆ سـەر دەروونى موسڵمانان، پاش مردنى ئيمپراتۆر كوڕەكەى بەناوى "فردريک" كە پێشتر ميرى سوابيا بوو سەركردايەتى سوپاكەى گرتە ئەستۆ، ئەو سوپايەى بڕواى بە سەركردايەتى ئيمپراتۆر فردريک بەربەرۆسا هەبوو، ئەو هەموو ماوەيەى بڕى هەر لە كاتى هاتنيان تا مردنى ئيمپراتۆرى ناوبراو، بەڵام جگە لە بەرگرى كردنى سـەرما و گەرما و هيلاكى و نەخۆشى و برسێتى تا ئەو كاتە نەگەشتبوونە ئامانجەكەيان،[4] هەموو ئەم هۆكارانە سەركردەى نوێى ڕووخاند و نەيتوانى دەسـەڵاتى بەسـەر ئەم سـوپا مانـدوەدا بشـكێت، بـۆيە دەبينين هەنـدێ لە ميرەكـانى لەگەڵ سـەربازەكانيان گەڕانەوە بۆ ئەوروپا،[5] بەم شێوەيە سوپاى ئەڵمانى كەم بوويەوە، هەندێكيشيان لە سلوقيە بەجێمان،[6] ميرى نوێ سەركردايەتى پاشماوەى ئەو سوپايەى كرد و چوو بەرەو وڵاتى شـام بـێ ئەوەى بير لە خـواردن و پێداويسـتى ئەم سـوپايە بكـاتەوە،

---

(١).د. اسمت غنيم: هەمان سەرچاوە،ص٥٠.

(٢). ابن شداد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، ص ١٢٣.

(٣). د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ص،ج ٢/ ص٨١٨.

(٤). رانسيمان: م.ن،ج ٣/ص ٤١.

(٥). عاشور: س-پ،ج٢/ص٨١٩.

(٦). رانسيمان:س-پ،ج٣/ص٤٢.

ئەمەش بــوو بە هــۆی برســێتی و بڵاوبــوونەوەی نەخۆشـــی و کەمبــوونەوەی ژمارەیـان،[1] پێش ئەوەی میر فردریک پێشڕەوی بکات بەرەو ئەنتاکیا هێزەکەی دابەشکرد بۆ سێ گروپ تا بە ئاسانی ڕێ ببڕن، کاتێک گروپی یەکەم بە ژێر قەڵای بەفراسدا تێپەڕین هێزی موسڵمانان هێرشیان کردە سەریان و (٢٠٠) سەربازیان لێ گرتن، دواتر نامەیان نارد بۆ وڵاتی شام کە سوپای ئەڵمانیا هێزی سوارەی زۆر کەمە، هاوکـات برسـێتی و نەخۆشـی بـوو بە بەشـیان و هـیچ توانایەکیـان نەمـا، هەروەها چەکیشیان کەم بوویەوە، ئەمەش بۆ خۆی چاکترین هاندان بوو بۆ ورەی موسڵمانان، پاش گەیشتنی هەواڵ بە میرەکانی شام هێزێکیان ڕەوانە کردە سـەریان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و (٥٠٠)یان لێ گرتن، لەو کاتەدا سوپای ئەڵمـان کەوتەڕێ بەرەو شــوێنێک کە پێــدەوترا "مینــان"،[2] لەوێ فەرمانــدەکەیان توشـــی نەخۆشیەکی سەخت هات کە بووە ڕێگر بۆ پێشکەوتنی سوپاکە، هەروەهـا خراپی باری سوپاکەی وایکرد خۆی و پاسـەوانە تایبەتەکانی و نزیکەی (٧٠) سوار لەگەڵ چەند تیمارکەرێکدا بەرەو ئەنتاکیا بڕۆن و لەوێ بمێننەوە تا چاک دەبێتەوە، بۆ ئاسانکردنی ڕۆیشتنی سوپاکەی هەستا بە دابەشکردنی بۆ سێ بەش، پاشان یەک لە دوای یەک کەوتنەڕێ،[3] پاش ئەوەی گەیشتنە نزیک ڕووباری عاصی لە ناویانـدا پەتـا بڵاوبـوویەوە کە بـوویە هـۆی زیـانێکی زۆر،[4] ئەمە وایکـرد نەتـوانن بـگەنە ئەنتاکیـا، پـاش ئەوەی فردریـک چـاک بـوویەوە بە سـوپاکەیەوە کە نـزیکەی چەنـد هەزار سەربازێک دەبوو گەیشت.

### هەڵوێست و کاردانەوەی موسڵمانان

هەواڵــی ســوپای خاچیەکــان بەردەوام دەگەیشــتە ســەرکردە ئیســلامیەکان، بەتـایبەت ئەو بەشـەی کە لە سـوپای ئەڵمـانی پێکهـاتبوو کە پـێش بەشـی دووەم کەوتبــووە ڕێ و لە وشــکانیەوە دەســتی بە جــوڵە کردبــوو، زۆری ئەم ســوپایە

---

(١). د. دريد عبدالقادر: سياسة صلاح الدين في مصر والشام والجزيرة، ص٣٢٥.

ج

(٢). ابو شامە: هەمان سەرچاوە،ج ٢/ص ١٥٦.

(٣). هەمان سەرچاوە،ج ٢/ ص١٥٦.

ج

(٤).د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج٢/ص ٨١٨.

کاریگەری هەبوو لەسەر هەردوولا "خاچپەکان و موسڵمانان" لە ناوچەی عەککا، چونکە لە لایەکەوە ورەی خاچپەکانی بەرزکردەوە لە لایەکی ترەوە کاریگەری هەبوو لەسەر بیرکردنەوەی سەرکردە و جەنگاوەرە ئیسلامیەکان، بەڵام باوەڕی سەرکردایەتی ئیسلامی و توانا و وزەی ناوچەی ئیسلامی وایکرد باڵانسی خۆی لەدەست نەدات و لەسەر هەڵوێستی خۆی بمێنێتەوە و هەموو توانایەکی بخاتەگەڕ بۆ بەرگری کردن لە ناوچە ئیسلامیەکان لە ڕۆژهەلات،[1] هاوکات موسڵمانان هەستیان بە مەترسی هێرشی خاچپەکانیان دەکرد لە هێرش هێنانە سەر وڵاتی شام کە لە دوو لاوە ئەگەری هێرش بردنە سەری هەبوو:

١. بەرەی باکوور- ئەو بەرەی سوپای گەورەی ئەڵمان هێرشی بۆ دێنێ، بۆیە دەسەڵاتی ئیسلامی هەستی بە مەترسی بارودۆخی میرنیشینە ئیسلامیەکانی باکووری وڵاتی شام کرد ئەگەر بێتو سوپای ئەڵمانی بگەنە ئەو ناوچە.

٢. بەرەی ڕۆژئاوا- ئەویش بەرەی دەریایە کە هەردوو سوپای فەرەنسی و ئینگلیزی بە و ئاراستەیە دەڕۆن، لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی ئەم تەوەرە وەک تەوەرەی یەکەم هێندە نەبوو.[2]

سوڵتان سەلاحەددین پاش بەراوردکردنی هێزی هەردوولا گەیشتە ئەو ئاکامەی بارودۆخی ئیسلامی ترسناکە ئەگەر وڵاتی شام لە دوو لاوە ڕووبەڕووی هێرش ببێتەوە،چونکە لەم بارەدا پێویست بوو هێزە بەرگریکارەکانی لە زیاتر لە بەرەیەکی جەنگدا دابنرێن، بەمەش هێزی موسڵمانان لە هەموو خاڵەکاندا لاواز دەبوون لە بەرئەوە پێویست بوو لەم بارودۆخەدا هێزی گەورەی ئیسلامی سەر بەسنوری سەلاحەددین کۆبکرێتەوە و پەیوەندی بکرێت بە هێزە موسڵمانەکانی ترەوە و داوای یارمەتیان لێ بکەن،[3] چونکە ئەگەر ئەم سوپایە پێکەوە کۆنەبونایەتەوە ئەوا هێزە خاچپەکان بە ڕێژەیەکی بەرچاو بەسەر هێزی ئیسلامیەکاندا سەردەکەوت، لێرەوە مەترسیەکی گەورە هەبوو لەوەی خاچپەکان بتوانن ئەو ناوچانەی لە شەڕی حەتیندا لە دەستیاندا بوو بیهێننەوە ژێر رکێفی خۆیان، سەرکردایەتی ئیسلامی توانای خۆی لەسەر بنەمای گفتوگۆ کردن و سروشتی ناوچەکە و هێز و چەکی

---

(١).د.درید عبدالقادر نوری:س-پ،ل٣٢٥.

(٢). د. نظیر حسان سعداوی: التأریخ الحربي المصري، ص٢٥٢- ٢٥٣.

(٣). محمود یاسین احمد: الایوبیون في شمال الشام والجزیرة، ص٢٥٧.

هەردوولا و کەش و هەوا بینا دەکرد... لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار چەند هۆکارێک دێنە پێشەوە هەرگیز لەبەرچاو نەگیراون و کاریگەرییان دەبێ لەسەر ئاکامی شەڕ و بە ئاڕاستەیەکی تردا دەیبەن،[1] ئەم بارەش لای هێزی ئیسلامی مەترسیدار بوو چونکە دەترسا لە گەیشتنی هێزی گەورەی ئەڵمانی کە بەرەو وڵاتی شام بەڕێ کەوتبوو، ئەگەر چی بە هۆی لەبەرچاو نەگرتنی هەندێ هۆکار ژمارەیەکی کەمیان گەیشتن،[2] و ئاکامی هەڵمەتەکە بە تەواوی گۆڕا. لەسەر ئەم بنەمایە سەرکردایەتی ئیسلامی چەند هەنگاوێکی نا بۆ بەرەنگار بوونەوەی دۆخەکە:

١. سوڵتان سەلاحەددین هەستا بە ناردنی چەند سیخوڕێ بۆ ناوچەی ئەنادۆڵ بۆ چاودێری کردنی پێشکەوتنی سوپای ئەڵمانی و ناردنی هەواڵ سەبارەت بە بارودۆخی کارگێڕی و جەنگیان.[3] ئەمە جگە لە و زانیاریانەی لە سەرچاوەی ترەوە پێی دەگەیشت ئەویش ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو کە هاوپەیمانی لەگەڵدا هەبوو، هەروەها میرە ئەرمەنەکان کە ڕقیان لە هێزەکانی ئەڵمانیا بوو. بەمجۆرە سوڵتان سەلاحەددین بە تەواوی بەئاگا بوو لە جموجۆڵی سوپای ئەڵمانی.

٢. پاش ئەوەی سوپای ئەڵمانیا گەیشتە ئەنادۆڵ سوڵتان سەلاحەددین هەستا بە ناردنی قازی"ئیبن شداد" بۆ لای میرنیشینی جەزیرە و دەوروبەری تا مەترسیداری بارودۆخەکەیان پێ ڕابگەیەنێت، دواتر ناردی بۆ لای خەلیفەی عەبباسی تا لەو قەیرانە ئاگاداری بکاتەوە.

٣. سوڵتان سەلاحەددین فەرماندەکانی کۆکردەوە بۆ وەرگرتنی ڕاو و بۆچوونیان سەبارەت بە هێرشبردنە سەر هێزە ئەڵمانیەکان پێش هاتنیان بۆ عەککا، بەڵام لەبەر لاوازییان بڕیاریاندا ئەم هێرشە ئەنجام نەدەن.[4]

٤. گەڕانەوەی هێزی ئەو میرنیشینانەی کە سوپای ئەڵمانی پیا تێپەڕ دەبێت بۆ بەرگری کردن و خەریک کردنی سوپای ئەڵمانی تا عەککا لەو قەیرانە ڕزگار دەبێت.[5]

---

(١). د. اسمت غنیم: م.ن،ص٥٢.

(٢). رانسیمان: م.ن،ج ٣/ص٤٢.

(٣). د. دردید عبدالقادر: س-پ، ل٣٢٥.ج

(٤). أبن الأثیر :م.ن،ج٩/ص٢٠٧.

(٥).أبن شداد: م.ن،ص ١٢٦.

## هەڵوێستی سەربازگەی خاچپەکان

هێزی خاچپەکان بە هۆی هێرشی بەردەوامی هێزە موسڵمانەکانەوە باری کارگێڕییان تێکچوو، لە بارودۆخێکی زۆر پشێوو ناهەمواردا بوون. هاوکات بە تەواوبوونی زستانی ساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) هێزە موسڵمانەکان بارودۆخیان باشتر بوو، بە تایبەت دوای گەڕانەوەی هێزەکانیان بۆ گەمارۆدانی هێزە ئەڵمانیەکان، هەروەها تێکچوونی کەش و هەوای ناوچەکە بویە ڕێگر لە گەیشتنی کەشتیگەلی خاچیەکان بۆ شاری عەککا و تەنها ژمارەیەکی کەمیان توانییان بگەن.[١] سەرکردە موسڵمانەکان توانییان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانیان و هاوکاری کردنی گەمارۆدراوەکان بە پێشکەشکردنی خواردەمەنی و تەقەمەنی هەندێ بەلەم ڕەوانەی عەککا بکەن، بەڵام سەبارەت بە خاچیەکان لە زستانی ساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) بارودۆخیان زۆر بە خراپی تێکچوو بە شێوەیەک برسێتی و نەخۆشی ڕووی کردبووە سەربازگەکانیان، ئەمەش بووە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانیان، سەرەڕای کوشتاریکی زۆر لە ڕیزی خاچیەکان، بەڵام بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و برسیەتی هۆکارێکی زۆر گرنگ بوو بۆ تێکچوونی باری دەروونی سوپای خاچیەکان،[٢] هەرچەندە لە لایەن سوپای فەڕەنسی و ئینگلیزیەوە یارمەتی و هاوکاریان بۆ دەهات، بەڵام سەرنەکەوتنی هێرش و پەلامارەکانیان بۆ سەر شاری عەککا بۆ خۆی خاڵی گرنگ بوو لە تێکچوونی بارودۆخی کارگێریان و بڵاوبوونەوەی برسێتی و نەخۆشی. هەرچەندە لەو بارودۆخەدا سوڵتان سەلاحەددین نەخۆش کەوت،بەڵام لەگەڵ فەرماندە و سەرکردەکانی کۆبوونەوەی کرد بۆ هێرشبردنە سەر خاچیەکان، سەلاحەددین پابەند بوو بە ڕا و بۆچوونی سەرکردەکانی بە پەلەنەکردن لە هێرشبردنە سەر خاچیەکان، بۆ ئەوەی هەموویان لە بەرامبەر شاری عەککا کۆببنەوە و سەرکەوتنی کۆتایی بەدەست بهێنن، چونکە موسڵمانان لە سەرکەوتندا بوون و بە پێچەوانەوە خاچیەکان لە شکستدا بوون و ئەمەش باشترین هەل بوو بۆ موسڵمانان.[٣]هاوکات لە ڕێی دەریاوە کەشتیەکی

---

(١). رانسیمان: م.ن،ص،ج٣/ص٦٨.

(٢). محمود یاسین:م.ن،ص٢٥٨.

(٣). د. خاشع المعاضیدي وأخرون: م.ن،ص ١٧٨.

ع

خاچی گەیشتە ناوچەکە کە "٣٠٠" ژنی زۆر جوانی ئەوروپی تێدا بوو، عماد الکسابت زۆر بە جوانی باسی ئەم بابەتە دەکات، خاچیەکان ئەوەیان وەک چەکێکی دەروونی لە دژی موسڵمانان بەکارهێناو لە نزیک سەربازگەی موسڵمانان نیشتەجێ بوون، هاوکات هەندێکیان چوونە ناو شاری عەککا بۆ بڵاوکردنەوەی خراپە و بەرەڵلایی و سەرنج ڕاکێشانی گەنجان و لاوان تا توانای شەڕیان نەبێت، چونکە ئەو کاتە شەڕ لەسەر هێز بوو، ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیە کە خاچیەکان لە جەنگدا دژی موسڵمانان (جنس)یان بەکارهێناوە.[١]

## سوپای فەڕەنسی و ئینگلیزی

بەشی دووەمی سوپای خاچیەکان پێکهاتبوو لە هەردوو سوپای فەڕەنسی بە سەرکردایەتی پاشا "فیلیب اوغسکس" و سوپای ئینگلیزی بە سەرکردایەتی پاشا "ریتشارد شێردڵ"، هەردوو سوپا لە هاوینی ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) لە بنکە سەرەکیەکانیانەوە لە ڕێی دەریاوە بەڕێکەوتن، سوپای فەڕەنسی لە جەنەوە و، سوپای ئینگلیز لە مرسلیاوە بەڕێکەوتن، هەردوولا لە دورگەی "صقلیە" یەکیانگرتەوە، سەرەڕای بوونی جیاوازی و ململانێ و ناکۆکی نێوانیان بەهۆی ئەو قەیرانەی لە ڕۆژهەلات تێی کەوتبوون، بەلام بۆ ماوەیەکی کاتی هەموو ئەو کێشانە خرانە لاوە، هەردوو سوپا لە دورگەی صقلیە زستانیان بەسەر برد، چونکە کەش و هەواکەی خۆش بوو،[٢] لە ئەنجامی ئەم مانەوەدا کە نزیکەی (٦) شەش مانگی خایاند زۆر لە سەربازەکانیان ڕیزی سوپاکانیان بەجێهێشت بۆ خۆ گەیاندن بە شاری عەککا، بە تایبەت ئەندامانی سوپای فەڕەنسی، سەرهەڵدانەوەی کێشە کۆنەکانی نێوان پاشاکانیان بوو بە هۆی کێشە و ململانێی نێوان سەربازەکان،[٣] هاوکات کردەوەکانی ریتشارد بوونە هۆی ئەوەی فیلیب ئۆگستس دورگەکە بەجێ بهێڵێت و لەگەڵ سوپاکەی بەرەو عەککا بەڕێکەوێت. لە کۆتایی مانگی ئازاری ساڵی (٥٨٧ک/١١٩١ز)دا فیلیپ ئۆگستس و سوپاکەی گەیشتنە شاری صور،[٤] دواتر

---

(١). عماد الکاتب الاصفهاني: الفتح القسي في الفتح القدسي، ص٢٢٨- ٢٢٩.

(٢). د. عاشور: م.ن،ج ٢/ ص٨٣٠.

(٣). ارنست بارکر: الحروب الصليبية، ص٨٩.

(٤). د. قاسم عبده قاسم: م.ن، ص١٤٥.

لەگەڵ میـری ئەو شـارە "کـونراد" بە سـوپایەکی چەنـد هەزار کەسـیەوە کە بە (٦)شـەش کەشتی گوێزرانەوە خۆیـان گەیاندە سـەربازگەی خاچیەکـان لای شـاری عەککا، خاچیەکان چاوەڕوانی ژمارەیەکی لەوە زیاتریان دەکرد.[١]

گەیشـتنی پاشـا فیلیـب ئۆگسـتس بـۆ سـەربازگەی خاچیەکـان لە ڕووی دەروونیەوە کاریگەری زۆری لەسەر شـەڕکەرەکانی هەردوولا هەبوو،[٢] بە تـایبەت لەسەر خاچیەکان کە ورەیـان زۆر بەرزبوویەوە، هاوکات کاریگەری سلبی لەسـەر دەروونی سوپای موسڵمانان هەبوو چ ئەوانەی لە ناو شـارەکە بوون یـان دەرەوە، فیلیـب دوای گەیشـتنی بـۆ سـەربازگەی خاچیەکـان ویسـتی ئەو هەلە بـۆ خـۆی بقۆزێتەوە و پێشنیاری کرد تـا کاتیـان بەشـەڕ کردن لەگەڵ موسڵمانانی دەرەوەی شـار نەکـوژن، بەڵکـو هێـرش بەرنە سـەر شـاری عەککـا و داگیـری بـکەن، ئەمەش هانـدانێکی دەروونـی چـاک بـوو بۆ خاچیەکـان کە لەو مـاوەدا بەرامبەر موسڵمانان زۆر شەڕیان دۆڕاندبوو، بۆیە هەموو کەرەستەکانی گەمارۆیان ئامادەکرد بۆ لێدانی شـاری عەککـا، بەشـە و و ڕۆژ بەبێ وەسـتان کەوتـنە پڕکـردنەوەی خەنـدەقەکەی نێوانیـان بە لاشـەی کوژراوەکانیـان و ئاژەڵەکـان، بەڵام هێـزی بەرگـری عەککـا نەیدەهێشت ئەو کارە سەربگرێت و کەوتنە چاککردنی خەندەقەکە.[٣]

### هەڵوێستی موسڵمانان

سوڵتان سەلاحەددین لەگەڵ سەربازەکانی کەلە نـاوچەی "شـغرعم"ی باشـووری (تـل الفخـار) بـوون، بە هـۆی ئەم هۆکـارانەوە بـاری دەروونـی سـەربازەکانی زۆر خراپ بوو.

١. پاشای فەڕەنسی گەیشتە سەربازگەکانی خاچیەکان.

٢. درێژخایەنی مـاوەی شـەڕەکان و دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە شـوێنەکانی خۆیان.

---

(١). أبن واصل: هەمان سەرچاوە،ص،ج ٢/ص ٣٤٩.

(٢). د. خاشع المعاضيدي واخرون: م،ن، ص١٧٩.

(٣). نظير حسان سعداوي:م.ن،ص ٢٥٣.

٣. هـــاتنی وەرزی زســـتان و خۆئامـــادە نەكـــردن بـــۆ ئەم وەرزە لە لایەن موسڵمانەكاوە.

ئەمەش ســەلاحەددینی ناچــار كــرد ڕێ بــدات بە هەنــدێ لە هێزەكــانی تــا بگەڕێنەوە بۆ ناوچەكانی خۆیان تا هاتنی وەرزی بەهار و خۆئامادەكردن بۆ جیهاد، گرنگترین ئەم هێزانە هێزەكانی "میرنیشینی موسڵ، میرنیشینی جەزیرە، میرنیشینی سنجار" بوون،[1] بێگومان ئەم هێزانە ڕۆڵی كاریگەریان هەبوو، چونكە بڕبڕەی پشتی سـوپای ســەلاحەددین بـوون، هاوكـات جەنگـاوەری بە توانـا و لێهاتوویـان هەبـوو، ســەرەڕای ڕێكخســتنی ڕیزەكانیــان، ســەلاحەددین هەمــوو ڕۆژ لەگەڵ هێزەكــانی دەچـوو بـۆ شــەڕی خاچیەكـان و خەریككردنیـان بە مەبەسـتی دوركەوتنەوەیـان لە شــاری عەككـا،[2] بەڵام هەوڵەكـانی بـێ ئاكـام بـوو، بـۆیە بڕیاریـدا بە گواسـتنەوەی هێزەكانی بۆ "تل كیسـان" بە مەبەسـتی نزیكبوونەوە لە گۆڕەپانی جەنگ، هەروەهـا سەلاحەددین فەرمانیكرد بە میری بەیروت "اسـامە مسـتحفظ" تـا لە دەریـاوە ڕێ بە خاچیەكـان ببـڕێ، لەگەڵ چوونەنـاو دەریـا تووشـی (٥) كەشـتیگەل بـوو كە سـوپای ئینگلیزی دەگواسـتەوە بـۆ شــاری عەككـا، لە شــەڕێكی گەورەدا موسـڵمانان توانییـان دەسـتبگرن بەســەر هەمـوو ســەرباز و شــمەكی گەشــیتگەلەكەدا، ئەو هێـزانەش كە گەڕابوونەوە شوێنەكانیان لە سەرەتای وەرزی بەهاردا لە هەموو لایەكەوە دووبارە پەیوەنـدیان كـرد بە سـوپای سـوڵتان سـەلاحەددینەوە، بەم شـێوەیە بەرەی جیهـادی موسڵمانان بە سەركردایەتی سەلاحەددین بەهێزتر بوو.[3]

## سوپای ئینگلیزی

دوای بەڕێكەوتنـی سـوپای فەڕەنسـی، "ریتشـارد شـێردڵ" بەرامبەر ڕای گشـتی مەسـیحی شــەرمەزار بـوو، چـونكە چاوەڕوان دەكرا پێش هەموویـان بگـاتە وڵاتـی شــام، بـۆیە ناچــار بـوو لە مــانگی نیســانی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)دورگەی صـقلیە بەجـێ بهێڵێـت و لە دورگەی "قبـرص" دابەزێ و تـوانی داگیـری بكـات، بەمەش شــاری

(١). المقریزي: السلوک لمعرفة دول الملوک، تحقیق، محمد مصطفی زیادة، القاهرة، ١٩٣٩، ج١/ص ١٠٥.

(٢).أبن الأثیر: الكامل،ج ٩/ص ٢١٣.

(٣). ابن واصل: هەمان سەرچاوە،ص،ج ٢/ص ٣٤٩- ٣٥٠.

عەککـای لە بیرکــرد، دوای چەنــد ڕۆژێــک وەفـدێک گەیشــتە دورگەکە کە چەنــد سەرکردەیەکی تێدابوو، لە سەروو هەموویانەوە پاشـا "جای لوزجنـان" کە نوێنەری بەرەی ئۆپۆزسـیۆن بـوو لە دژی میـر "کـونراد مـونتغیرات" میـری صـور کە لەگەڵ فیلیـب ئوگسـتس بە مەبەسـتی بـردنەوەی لایەنگـری ریتشــارد ڕێکەوتبـوو، [1]بەم شێوەیە بەرەی خاچپەکان بە ڕووکەش بوون بە دوو بەشەوە بۆ جێ بەجێ کردنـی ئامانجەکانیــان، بەڵام لە ژێــرەوە بــۆ بەدیهێنــانی بەرژەوەنــدیەکانیان یەک بــوون. ســوپای "ریتشــارد شــێردڵ" لە (٢٥) بەلەم پێکهــاتبوو لە ســاڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) ژمارەیــان دەگەیشــتە نــزیکەی (١٠) هەزار جەنگــاوەر، بەگەیشــتنیان کــاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ورەی خاچپەکان، هاوکات بارێکی دەروونی قورسی لەسـەر موسڵمانان دروست کرد. [2]

## شەڕی عەککا

خاچپەکـان لە دژی شــاری عەککـا هەمـوو شــێوازێکی جەنگیـان بە کارهێنـا، بە مەنجەنیـق و کبـاش بە شــەو و بە ڕۆژ لێیـان دەدا، بەڵام هـیچ ئاکـامی نەبـوو، بـۆیە بیریان لە ڕێگەیەکـی نوێ کـردەوە ئەویـش دروسـتکردنی تەپۆڵکەی خـۆڵی جـووڵاو بـوو بـۆ پێشـڕەوی کـردن بەرەو شــاری عەککـا، ئەم ڕێگـایە سـەرکەوتوو بـوو و کـاریگەری ڕاسـتەوخۆی هەبـوو لەسـەر بەرگریکـارانی عەککـا و بەرگریکـاران هـیچ شێوازێکیان نەبوو بۆ بەرپەرچدانەوەیان.[3] خاچپەکـان بە گەشـتنی سـوپای ئینگلیـز هەنـدێ هێرشـیان کردەسـەر موسـڵمانان بەڵام سـەرکەوتوو نەبـوون، سـەلاحەددین هێرشــی دەبــردە ســەر ســەربازگەی خاچپەکــان بــۆ دورخســتنەوەیان لە گەمــارۆی شــاری عەککــا، بەڵام بە هــۆی گەرمــی نــاوچەکە هەردوو لا لە بەرەکــانی جەنــگ کشانەوە، دوای ماوەیەک خاچپەکان دووبارە هێرشیان بردە سەر هێزی موسڵمانان بەڵام بێ ئاکام بوو، لەو کاتە "ریتشارد شـێردڵ" فێڵـی لـێ کردن بە نـاردنی نـوێنەر بۆ لای سەلاحەددین و دوای چەند ڕۆژێک لە کشانەوەی موسڵمانان خاچپەکان لای

---

(١). رانسیمان: م،ن، ج٣/ص ٩١.

(٢). أبن الأثیر: الکامل، ج٩/ص ٢١٣.

(٣). أبن الأثیر: الکامل،ج ٩/ ص٢١٤.

باکوورەوە لە کەناری دەریاوە هێرشیان کردەسەر شاری عەککا، کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتە سەلاحەددین دووبارە هێرشی کردە سەریان و شەڕ لە نێوانیاندا تا ئێوارە بەرپابوو دواتر هەردوولا کشانەوە.[1]بەهۆی زۆری ژمارەی خاچیەکان بە تایبەت لە دوای هاتنی "ریتشارد شێردڵ " و لاوازی بەرگری شاری عەککا و درێژخایەنی گەمارۆی شارەکە، هاوکات سەرکردە موسڵمانەکان بۆ دروخستنەوەی خاچیەکان لە شاری عەککا هیچ کارێکیان لە دەست نەدەهات، بەم شێوەیە بارودۆخی بەرگریکارانی شاری عەککا بەرەو خراپی هەنگاوی دەنا بە تایبەت دوای زۆربوونی ژمارەی خاچیەکان و شەڕ کردن لە دوو بەرەی جیاواز، بۆیە تای هێز بە لای خاچیەکاندا بوو. [2]جگە لە گەمارۆی شاری عەککا کە دوو ساڵی خایاند لە (٥٨٥ک-٥٨٧ک/١١٨٩-١١٩١ز)دەبینین موسڵمانان لەسەر دەستی خاچیەکان تووشی قەیرانێکی خراپ هاتن، هەرچەندە فیلیب ئۆگستس پێش هاتنی رتیشارد بۆ ناوچەکە کەرەستەکانی گەمارۆی ئامادەکرد، بەڵام نەیتوانی لەو بارودۆخە ناسکە دەرچێ کە پێویستی بە سەرکردایەتی لێهاتوو و بەتوانا هەبوو بۆ کۆتایی پێ هێنانی ئەم قەیرانە کە نزیکەی دوو ساڵی خایاند تا هاتنی "ریتشارد شێردڵ " کە هەموو خەسلەَتەکانی سەرکردەی تێدابوو، هەر بە هاتنی توانی سەربازگەی خاچیەکان کۆنترۆڵ بکات و ببێتە سەرکردەی یەکەمی شەڕی عەککا، لە هەنگاوە یەکەمەکانی کە دوای بینینی هەڵوێستی گشتی لە هەردوولا بیری لێ کردەوە بە تایبەت دوای بەرگری کردنی موسڵمانان بۆ ماوەی دوو ساڵ بریاریدا بە:

١. توند و درێژکردنەوەی گەمارۆی سەر بەرگریکارانی شاری عەککا.

٢. هاندانی هێزی خاچیەکان بۆ شەڕکردن دژ بە بەرگریکارانی شاری عەککا بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە، سەرەتا بۆ سوود وەرگرتن لە کات و بێزارکردنی موسڵمانان کە ماوەی دوو ساڵ بوو لەو ناوچەکەدا شەڕیان دەکرد، ریتشارد ڕێگای گفتوگۆی لەگەڵ سەلاحەددین گرتەبەر، ریتشارد ئەمەی وەک چەکێکی دەروونی دژ بە موسڵمانان بەکارهێنا، هاوکات هێزە دەریاییەکانی هەموو ڕێگە

(١). أبن شداد: م.ن،ص١٦٢- ١٦٤.

(٢). د.درید عبدالقادر:س-پ،ل٣٢٩.

دەریاوانیەکانیـان کـۆنترۆڵ کردبـوو، ریتشـارد تـوانی بە بیـانووی دانوسـتان و واژۆکردنـی رێککەوتنـامەی نێـوان هەردوولا سـەرکردایەتی گشـتی موسـڵمانان هەڵخەڵەتێنێت، ریتشارد بە گەیشتنی بۆ سەربازگەی خاچیەکان وەفدی نارد بۆ لای سەلاحەددین بە مەبەستی دانوستان، دوای چەند ڕۆژێک بە بیانوی نەخۆشی خۆی شاردەوە[1] و تا مانگی تەمووزی ساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) پەیوەندی پێوە نەکردن وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد مانەوەی ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە لە بەرژەوەندی ریتشارد بوو، چونکە دانیشتوان و بەرگریکارانی شاری عەککا لە درێژە کێشانی ئەم جەنگە بێزار بوون، هاوکات یارمەتی و هاوکاری بەردەوام دەگەیشتە ناوچەکە و لە خزمەتی فیلیپدا بوو بۆ هێرشبردنە سەر شاری عەککا، بەڵام ریتشارد قایل نەبوو بە بەشداری کردنی سوپای فیلیب لەم هێرشەدا،[2] فەرەنسیەکان هێرشێکی بە هێزیان بردەسەر شاری عەککا و توانییان کەلێنێ بکەنەوە، هەرچەندە موسڵمانان بەرپەچیان دانەوە و "١٥٠"یان لێ کوشتن،[3] بەڵام دانیشتوانی شاری عەککا تووشی حاڵەتێکی دەروونی خراپ هاتبوون، ناچار سەلاحەددین بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانە بڕیاریدا پەلاماری خاچیەکان بدات، هێزەکەی ئاگادار کردەوە لە بەردەوام بوونی هێرش و پەلامار، و بە شەویش هەڵمەتی دەبرد بۆ سەر سەربازگەی خاچیەکان،[4] دوا بە دوای ئەم بارودۆخە سوڵتان سەلاحەددین دوا ڕاپۆرتی شاری عەککای پێگەشت، تیایدا هاتبوو بەهۆی تێکچوونی بارودۆخیانەوە چیتر توانای بەرگرییان نەماوە،[5] لە دوای (٨) ڕۆژ لەم کارە و تێکشاندنی هێرشی فەرەنسیەکان، ریتشاردی ئینگلیزی ئەو هەلەی بۆ خۆی قۆستەوە و کەوتە هێرش بردنە سەر شاری عەککا، بەڵام هێرشەکەی سەرکەوتوو نەبوو.

---

(١). عماد الكاتب: هەمان سەرچاوە،ص٢٥١.

(٢). عماد الكاتب: م،ن،ص٢٥٣.

(٣). رانسيمان: م،ن،٣ج/ص ٩٦.

(٤).عماد الكاتب :هەمان سەرچاوە،ص٢٥٤.

(٥). عماد الكاتب :هەمان سەرچاوە،ص٢٥٥.

تالان و وێران هات جگە لە کاری تالانی و وێرانی داگیرکەران عرق یان بردنە ناو مزگەوتی ئەیوبیەکان و هەندێ مزگەوت یان گۆڕی بۆ کەنیسە[1].

## جەنگی عەین جالوت

لە تشرینی دووەمی ساڵی (٦٥٧ک/١٢٥٩ز) وڵاتی میسر لە ژێر فەرمانڕەوایی مەمالیکدا بوو بە سەرۆکایەتی (قگز) کە لە ڕووی سەربازی و رامیاری، دەسەڵاتی زۆر بە هێز بوو،ببووە تاکە سەرکردە لە وەستان بەرامبەر بە مەغۆلەکان و هێرش بردنە سەریان و ڕزگارکردنی ناوچەکە لە دەستیان واتە تاکە هیوای موسڵمانان بوو، قگز نامەی نارد بۆ مەلیک ناصری ئەیوبی بەوەی جێگرێتی و داوای لێکرد هاوپەیمان بن لە دژی مەغۆلەکان لە پێناو ڕزگار کردنی وڵاتی ئیسلام[2].

خاچیەکان لە شاری عەککا بوون بۆیە (قگز) هەوڵیدا لە گەڵیان ڕێککەوێت بەوەی لە پشتەوە هێرش نەکەنە سەر موسڵمانان لەبەرامبەردا بەڵێنی پێدان ئەگەر سەرکەوت بەسەر مەغۆلەکاندا ئەوا ئەسپەکانیان بە هەرزان پێ دەفرۆشێت.[3]

هۆلاکۆ نامەیەکی زۆر توندی بۆ(قگز) ڕەوانەکرد کە بێ هیچ کۆت و بەندێک خۆی تەسلیم بکات ئەگینا لە دانیشتوانی عێراق و شام خراپتری بەسەر دێت، بەڵام (قگز) نامەکەی هۆلاکۆ کاری تێ نەکرد و نەخەڵاتا بەو جەنگە دەروونیەی هۆلاکۆ، بۆیە فەرماندەکانی کۆکردەوە بۆ بڕیاردان بە شەڕی مەغۆلەکان و ڕزگارکردنی موسڵمانان، یەکەم کار کەکردی نوێنەری هۆلاکۆی ئیعدام کرد بۆ وەڵامدانەوەی شەڕ بە کرداری نەک بە دەروونی، هەروەها موسڵمانانی کۆکردەوە و لە وتارەکەیدا پێ ڕاگەیاندن (من بۆ جیهاد لە پێناوی خودا دەڕۆم، ئەوەی جیهاد دەکات با لەگەڵ من ئامادە بێت، ئەوەی جیهاد ناکات با بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە)، ئەم وتارە زۆر کاریگەر بوو لە ڕووی دەروونی بەسەر موسڵمانان هاوکات لە ورەی جەنگاوەرانی بەرزکردەوە بۆ شەڕکردنی مەغۆلەکان،[4] فاکتەرێکی تری دەروونی بۆ بەرزبوونەوەی ورەیان گەشتنی نامەی (صارم الدين ازبک بن عبدالله الاشرفی) کە دیل بوو لای مەغۆلەکان لە کاتی پەلاماری وڵاتی شام دواتر قایل ببوو

---

(١) . رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبيه، ج٣/ ص ٥٢٨.

(٢) . ابن تغرى البردى: م.ن، ج٧/ ص ٨٠. الصياد، م.ن،ص٢٩٦.

(٣) . رنسيمان: م.ن،ج ٣/ ص ٥٣٦.

(٤) . المقريزى: السلوک،ج ١/ ص٤٣٠.

بەکارکردن لە خزمەتیان، ئەوەی لە نامەکە ڕوون کردەوە کە ئامانجی مەغۆلەکان چیە هاوکات نوسیبوی ژمارەیان کەمە و ئەو هێزە نین لێیان بترسن،[1] بەم شێوەیە (قگز) لە میسرەوە بە ناو خاکی خاچیەکان لە تەنیشتی شاری عەککا وە بەڕێکەوت وگەیشتە نێوان نیسان و نابلس لە (١٥ ڕەمەزانی ٦٥٨ک/ ١٢٦٠)، لە موقعەی (عین جالوت) بە مەغۆلەکان گەیشتن و شەڕێکی زۆر گەورە و قورس لە نێوانیان ڕوویدا کە پێشتر مەغۆلەکان شەڕی وایان بە خۆوە نەبینی بوو لە وڵاتی ئیسلامدا، مەغۆلەکان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدران بە شێوەیەک(قگز)هاواری دەکرد و دەیگوت "وا اسلاماه"،[2]ئەو ڕۆژە تەواو نەبوو هەتا هەموو مەغۆلەکانیان کوشت و سەرکردەکەیان "کیتوبوقا" بە دیلی گیراو دواتر لەسەر فەرمانی سوڵتان کوژرا،[3] موسڵمانان بەم سەرکەوتنە زۆر دڵخۆش بوون چونکە باوەڕیان نەدەکرد بتوانن سەربکەون بەسەر مەغۆلەکاندا، هەواڵی ئەم سەرکەوتنە لە وڵاتی شام بڵاوببووە و ببووە هۆی هەڵهاتنی سەرکردەی مەغۆلەکان بە تایبەت لە شاری دیمەشق لە ترسی پەلاماری موسڵمانان، هەروەها هاوکارەکانیان تووشی سزای خراپ هاتن بە دەستی موسڵمانان لە ئەنجامی خیانەتەکانیان.[4]

### ئەنجامەکانی جەنگی عین جالوت

١. مەترسی پێشکەوتنی مەغۆلەکان بۆ خاکی میسر وەستا، دوای تێکشکاندنی هێزەکانیان لە وڵاتی شام، بەمەش میسر و وڵاتی مەغرب لە پەلاماری مەغۆلەکان ڕزگاریان بوو، چونکە هەموو پێشکەوتنێکیان لە ناو برد.

٢. گەڕانەوەی یەکێتی لە نێوان میسر و شام، ممالیک فەرمانڕەوا بوون لە وڵاتی میسر.

٣. هێزی سەرەکیان لە ڕۆژ هەڵات مایەوە.

٤. سەرکەوتنی موسڵمانان لە عەین جالوت گیانێکی نوێی پێ بەخشین لە ململانێ کردنی نصاری و بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە نێو مەغۆلەکان، لە ئێران

---

(١). ابو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، ص ٢٠٧.

(٢). المقريزى:سلوک،ج١/ص٤٣١.

(٣). الصياد: م.ن، ص ٣١١

(٤). ه- س، ص٣١٣- ٣٢١.

جج

مەغۆلەکان تا ڕادەیەک ببوونە موسڵمان و ئاینی ئیسلام ببووە ئاینی ڕەسمی دەوڵەتی مەغۆل لە ئێران و فاکتەری یارمەتی دەربوو لە نەمانی میرنیشنی خاچپەکان لە ڕۆژهەڵات.

٥. پەیوەندی نێوانیان جێگیر بوو و هەردوولا هاوپەیمانی بوون دژی دوژمنی هاوبەشیان و بنەماڵەی هۆلاکۆ[1].

تێکشکانی خاچیەکان لە هەڵمەتی پێنجەم ببووە هۆی بیرکردنەوە لە هەڵمەتێکی نوێ دژی ڕۆژهەڵات، بەڵام کێشە لە نێو خۆیان دروست بوو بە تایبەتی نێوان پاپا و فردریک و ببووە هۆی بێبەش کردنی فردریک لە بەرەکاتی کەنیسە، هاوکات لە لایەن پاپاوە بانگەشەکرابۆ هەڵمەتێک دژی فردریک، بەڵام لە هەموو گرنگتر و سەیر تر ئەوە بوو بێڕشتنی خوێن سوڵتان کامل بەیت ولمەقدیسی تەسلیم بە فردریک کرد، دوای ئەو هەموو ساڵە لە خەبات و جیهاد و خوێن ڕشتن بە ماندوبوونی سوڵتانی سەلاحەددین لە بە دەست هێنانی ئەو سەرکەوتنە گەورە بەسەر خاچیەکان و ڕزگارکردنی قودس، زۆر بە ئاسانی فردریک قودسی دەسکەوت، ئەمەش بووە مایەی نیگەرانی موسڵمانان بە شێوەیەکی گشتی لەبەر ئەو فاکتەرانەی باسمان لێوەکرد، هاوکات خاچیەکان ئەم سەرکەوتنەیان پێ ناخۆش بوو چونکە دەیانوت بە شمشێر ڕزگار نەکراوە، بەڵکو بە پاڕانەوە دەستیان کەوتووە، بەڵام ماوەی ڕێککەوتنی نێوانیان بۆ ماوەی (١٠) دە ساڵ دەرفەتێکی چاک بوو بۆ خاچیەکان لە خۆ ئامادەکردنیان بۆ هەڵمەتێکی نوێ لە دوای مردنی مەلیک کامل و تێکچوونی بارودۆخی نێو بنەماڵەی ئەیوبی لە ناوچەکانی (جەزیرە و شام و میسر)، بە سەرهەڵدانی مەغۆلەکان لە دژی جیهانی ئیسلامی هاوپەیمانیان لەگەڵ بەستن بۆ داگیرکردنی وڵاتە ئیسلامیەکان، ئەمەش بوو بەهۆی زیاتر بوونی کاری تالان و وێران و کوشتن و بڕین و بەدیل گرتن، بەڵام بە سەرهەڵدانی ممالیک و ڕووخاندنی دەوڵەتی ئەیوبی بە تایبەتی لە دوای کوشتنی تورانشاە و وەرگرتنی دەسەڵات لە شام و میسر لە لایەن ممالیک و تێکشکاندنی مەغۆلەکان لە شەڕی عین جالوت و بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە نێو مەغۆلەکان و هەڵگەڕانەوەیان لە خاچیەکان، خاچیەکان نەیانتوانی قودس ڕزگار بکەن تا جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤- ١٩١٨).

---

(١) . الصیاد: هەمان سەرچاوە ،ص ٣١٤- ٣١٨؛ رنسیمان: هەمان سەرچاوە ،ج ٣/ ص ٥٣٧.

خاچ دروشمەکان دوای شکست هێنانیان لە هەڵمەتی شەشەم و حەوتەم و دەرکەوتنی مەترسی مەغۆلەکان لە ڕۆژهەڵات و تێکچوونی بارودۆخیان لە ناوچەی شام، هاوکات بە هێز بوونی ممالیک و فراوان بوونی دەسەڵاتیان و گێڕانەوەی یەکێتی لە نێوان شام و مصر، ئەم جارە ئاڕاستەی هەڵمەتەکەیان گۆڕی بەرەو ڕۆژئاوای عەرەبی لە جیاتی (بیت المقدس) ئەویش وڵاتی تونس بوو.

## هەڵمەتی هەشتەمی خاچیەکان

لویسی نۆیەم دوای تێکشان و شکست هێنانی لە هەڵمەتی حەوتەمی خاچیەکان بۆ سەر مصر و ناوچەی شام گەڕایەوە فەرەنسا، لە ماوەی مانەوەی لە ڕۆژهەڵات کە چوار ساڵی خایاند نەیتوانی هیچ کارێک بۆ خاچیەکان بە ئەنجام بگەیەنێت، بەتایبەت سەقامگیرکردنی بارودۆخی مەملەکەتی (بیت المقدس).[1]

دوای ئەوەی لویسی نۆیەم ناوچەی شامی بەجێ هێشت، بەرەی ئیسلامی خەریکی بەرەنگاری هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان بوو کە هەموو ناوچەکانیان داگیرکرد بوو، سەرەڕای ئەنجامدانی کاری تاڵان و وێران و کاولکاری و کوشتاری بێ ئامان، بە شێوەیەک بەرەی ئیسلامی نەیتوانی هەڵوێستی کۆتایی خۆی بەرامبەر خاچیەکان بە ئەنجام بگەیەنێت، لەو ماوەیەدا کێشە و ململانێی نێو خۆیی لە نێو پاشماوەی خاچیەکاندا سەری هەڵدا و بووبە گرنگترین فاکتەر بۆ لە ناوچوونی مەملەکەتی "بیت المقدس" و کۆتایی پێ هێنانیان لە ڕۆژهەڵات.

لە ساڵی (٦٦٦ک/ ١٢٦٧ز) لویسی نۆیەم بیری لە هەڵمەتێکی نوێ کردەوە، بەڵام ئاڕاستەکەی بەرەو وڵاتی شام و مصر نەبێت، بەڵکو شوێنێکی تری دەستنیشان کرد، وڵاتی (تونس)بوو بە ئامانجی ئەم هەڵمەتە نوێیە، میر "شارل انجو" برای لویس کە پاشای صقلیە بوو ئەم بیرۆکەی ڕەتکردەوە، چونکە کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبوو لەسەر پەیوەندی بازرگانی نێوان صقلیە و تونس،[2] لە کۆتاییدا شارل ناچار بوو لەگەڵ براکەی بەشداری لەم هەڵمەتەدا بکات لە ژێر کاریگەری ئەم هۆکارانە:

١. ملکەچی و پشتگیری کردنی بۆ لویسی نۆیەمی برای.

---

(١) . ارنست باركر: الحروب الصليبية، ترجمة السيد الباز العريني، بيروت، ١٩٦٧، ص١٢٢.

(٢) . قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٠، ص١٥٩.

٢. شوێن کەوتنی هەڵهاتووە نەیارەکانی کە لە تونس بوون، ئەوانەی لە ئەنجامی وەرگرتنی دەسەڵات لە دورگەی صقلیە لەلایەن (شارل)ەوە ڕوویان کردبووە تونس.

٣. ناچار کردنی تونسیەکان لە دانی باج بە دەسەڵاتدارانی(صقلیە)کە پێشتر بە ئەباگرەی ئەڵمانیایان دەدا.(١)

لە ڕاستیدا ئەم هەڵمەتە بە پێچەوانەی هەڵمەتەکانی تری خاچیەکان بۆ یەکەم جار ئاراستەکەی بەرەو وڵاتێکی ڕۆژئاوای عەرەبی بوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خاچیەکان بەتەنها مەبەستیان داگیرکردنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی نەبووە، بەڵکو ئامانجیان داگیرکردنی تەواوی جیهانی ئیسلامی بووە، ئەمەش بەهۆی ململانێی ئایینی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت کە کەنیسەی کاسۆلیکی پاڵپشتی بوو.(٢)

لە مجمعی "کلیرمونت" لە ساڵی (٤٨٨ک/ ١٠٩٦ز)دا پاپا هاندەری بیرۆکەی درێژەدان بەشەڕ بوو لە دەرەوەی ئەوروپا، ئەمەش بۆ خۆی مەبەست و سیاسەتی دەرەوەی پاپا بوو بۆ داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی لە ژێر ئاڵای مەسیحیەت، کاریگەری ئایینی لەسەر دانیشتوانی ئەوروپا لە پێشوازی کردنی ئەم شەڕانەدا کە نزیکەی دوو سەد ساڵی خایاند بەئاشکرا دیاربوو.

لویسی نۆیەم دەیویست شکست و دۆڕاندنەکانی لە میسر و وڵاتی شام بەسەرکەوتنێک لە داگیرکردنی وڵاتێکی ڕۆژئاوای عەرەبیدا قەرەبوو بکاتەوە، وڵاتی تونس لەبەر نزیکی لە کەنارەکانی ئەوروپا و بۆچوونی هەڵە، بەوەی کە فەرمانڕەوای تونس(٣) مەیلی بۆ لای مەسیحیەکان هەیە و کەسێکی لاوازە، وای لە لویس کرد وڵاتی تونس هەڵبژێرێت و بیکات بە ئامانجی هەڵمەتە نوێکەی، بە تایبەت دوای ئەوەی براکەی میر "شارل انجلو" ببووە فەرمانڕەوای دورگەی صقلیە و بووبە بنکە و پشتی هێزەکانی لەم هەڵمەتەدا، لویس پێی وابوو ئەگەر بێت و وڵاتی تونس داگیر بکات ئەوا بارودۆخی جوگرافی و ماددی زەمینە دەرخسێت بۆ ئەنجام دانی هەڵمەتێک بۆ سەر وڵاتی مصر.(٤)

---

(١) . سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركه الصليبيه، القاهره، ١٩٦٣، ج٢/ص١١٧٧.

(٢) . هەمان سەرچاوە، ص ١٢٣٧.

(٣) .ناوی أبو عبدالله محمد المستنصر بالله الحفصي (١٢٤٩- ١٢٧٧)، بڕوانە( زامباور: معجم الانساب، ترجمة زكي محمد وأخرون، القاهرة، ١٩٥١- ١٩٥٢،ص)١١٥.

(٤) . سعيد عبدالفتاح عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص١٢٣٨.

هێزەکـانی هەڵمەتـی هەشـتەمی خاچپەکـان بە فەرمانـدەیی لویسـی نـۆیەم کۆبوونەوە و ژمارەیان بە نزیکەی (٤٠) چل هەزار دەخەملێنرا، کە پێکهاتبوون لە:

١/ (٦) شەش هەزار سوار.

٢/ (٣٠٠٠٠) سی هەزار سەربازی پیادە.

٣/ (٣٠٠) سێ سەد بەلەمی گەورە و بچووک.[1]

ئەم هێزانە لە سـاڵی (٦٦٨ک/ ١٢٧٠ز)دا لە دەریـاوەو بە ئاڕاسـتەی کەنارەکـانی تـونس بەڕێکەوتـن، کاتێـک هەواڵـی ئەم سـوپا گەورەیە گەیشـتە سـوڵتانی تـونس "المسـتغرابی زکریـا"، ئەویشـبەخێرایی هەسـتا بە وەرگرتنـی کۆمەڵێـک ئیجرائـاتی بەرگری کردن لە ناوچەکە بەم شێوەیە:

١. فەرمـانی بە کەشـتیگەلی تونسـیدا بـۆ چـاودێری کردنـی جموجـۆڵی دوژمـن و ناردنی زانیاری سەرەتایی دەربارەی جموجۆڵەکانیان.

٢. فەرمانی دەرکرد بۆ هەمـوو شـارەکان بـۆ خـۆ ئامـادەکردن و چـاکردنی پێگە کەنارییەکان پێش گەیشتنی هێزی دوژمن.

٣. نـاردنی نـوێنەر بـۆ هەمـوو هەرێـمە ئیسـلامیەکان لە (ئەنـدەلوس) و بـاکووری ئەفریقیا و ئاگادارکردنەوەیان لە هاتنی ئەم هەڵمەتە، هاوکات داوای یارمەتی لێکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزی خاچپەکان[2].

دوای گەیشـتنی هێـز و یـارمەتی لە هەرێـمە ئیسـلامیەکانەوە، سـوڵتان لەگەڵ فەرماندەکانیـدا کۆبـویەوەو بڕیـاری پێویسـتیاندا، ئەنجـامی ئەم دانیشـتنە دوو بۆچوونی لێ کەوتەوە ئەوانیش:

١.لەدەریادا ڕووبەڕووی خاچپەکـان ببنەوە و تێکیـان بشـکێنن و ناچاریـان بکەن پێش ئەوەی بگەنە وشکانی بگەڕێنەوە.

٢. ڕێـگە بـدەن بە خاچپەکـان لە کەنارەکانـدا دابەزن دواتـر گەمارۆیـان بـدەن لە وشکانیدا و لەناویان ببەن، بیانووی ئەم ڕێگایە ئەوە بـوو ئەگەر بێت و لە دەریـادا لێیان بدەن ئەوە ڕوو دەکەنە بەندەرەکانی تر کە هێزی بەرگری چاکی لێ نییە، بۆیە چـاکتر وایە ڕێگەیـان بـدەن لە بەنـدەری (قرگـاجنە) دابەزن، ئەمە دوای ئەوەی

---

(١) . أبن خلدون: تأريخ أبن خلدون، مؤسسة جمال للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩، ج٦/ ص ٩٢.

(٢) . عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١١٧٨.

هەواڵگرەکان فەرماندەکانیان ئاکادار کردبوویەوە لەوەی کە خاچیەکان لە بەندەری (قرگاجنە)دابەزن، لەکۆتاییدا سوڵتان بەم پێشنیارە ڕازی بوو[1].

لە ساڵی (٦٦٨ک/ ١٢٧٠ز) هێزەکانی خاچیەکان کە دابەش ببوون بۆ سەر حەوت کۆمەڵ لە بنکەکانیان لە صقلیە و سردینیا بەرەو تونس بەڕێ کەوتن و ئامانجیان "مرسی الحچرە" بوو لە شاری قرگاجنە، لە مانگی تەمموزی ساڵی (٦٦٨ک/١٢٧٠ز) گەیشتنە کەنارەکانی ئەو شارە بەبێ ئەوەی هێزی موسڵمانان ڕووبەڕوویان ببنەوە، خاچیەکان هێزەکانیان لە شارێکی کۆنی ڕووخا ودا دابەزند و هەوڵی چاککردنی پێگە و شوراکانیاندا، هاوکات موسڵمانانیش هەستان بە دابەش کردنی هێزەکانیان بۆ حەوت بەش بە فەرماندەیی یەکێک لە سەرکردەکانی "موحدین"، دوای بینینی بارودۆخی خاچیەکان لە ناوچەکە، سەرکردایەتی بەرەی ئیسلامی لە نیوە شەودا بڕیاری هێرشیدا و شەڕ لە نێوان هەردوولا بەرپابوو، لە ئەنجامدا "٥٠٠" خاچ دروشم کوژران و موسڵمانان کشانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان، هاوکات هێزەکانی خاچیەکان لە شوێنێکی تەسکدا گەمارۆدران و هیچ پەیوەندیەکیان بە دەرەوە نەما، تەنها لە ڕێگای دەریاوە پەیوەندییان بە بنکەکانیان لە سردینیا و صقلیەوە مایەوە، خاچیەکان لەم بارودۆخەدا تا شەش مانگ مانەوە، ئەمەش بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە ڕیزی سوپاکەیان،[2] و لەئەنجامدا هەڵوێستی کارگێریان تێکچوو بەتایبەت لە دوای مردنی لویسی نۆیەم، بەمەش خاچیەکان ئارەزووی بەردەوام بوونی شەڕیان نەما لەگەڵ موسڵمانان، بۆیە ناچار بوون داوای دانوساندن بکەن، دوای دانوساندنێک لە نێوان هەردوولا لە ساڵی (٦٦٩ک/ ١٢٧٠ز) ڕێککەوتننامەی ئاشتی یان واژۆ کرد بۆ ماوەی (١٥) ساڵ،[3] بەم شێوەیە هەڵمەتی هەشتەمی خاچیەکان بە سەرکردایەتی لویس نۆیەمی پاشای فەرەنسا کۆتایی هات، دوای ئەم هەڵمەتە خاچیەکانی ڕۆژهەڵات بێ هیوا بوون لە گەیشتنی هەڵمەتێکی نوێ بۆ ڕۆژهەڵات و ڕزگارکردنیان لەو قەیرانەی تێیدا بوون[4].

---

(١) . خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص ٢٣٦.

(٢) . ستيفن رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ترجمة: السيد الباز العريني، بيروت، ١٩٦٧، ج٣/ ص٥٠٢.

(٣) . أبن خلدون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٦/ ص ٢٩٤.

(٤) . رنيه گروسيه: الحروب الصليبية (صراع الشرق والغرب)، ترجمة: أحمد ايبش، دار قتيبة، ط١، ٢٠٠٢، دمشق، ص ٩٢.

## کۆتایی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵات

خاچیەکـان لە ڕۆژهەڵات زۆر لاواز و بـێ توانـا بـوون، ئەگەر موسـڵمانان خەریکـی چارەسـەکردنی هێـرش و پەلامـاری مەغۆلەکـان نەبوونـایە، پێشـتر لە ڕۆژهەڵات کۆتاییان پێ دەهێنان، بەڵام هێرشی مەغۆلەکان مانەوەی خاچیەکانی لە ڕۆژهەڵاتدا درێژە پێدا، تێهەڵچوون و شەڕی نێوان موسڵمانان و خاچیەکان دوای تێکشـکانی مەغۆلەکـان لە شـەڕی (عەیـن جـالوت) لە سـاڵی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز) لە سەردەمی سوڵتان "ركن الدين بيبرس" سەری هەڵدایەوە،[1] سوڵتان(بیبرس)دوای ئەوەی بارودۆخی وڵاتەکەی سەقامگیر کرد، بە فەرماندەی هێزێکی گەورە لە وڵاتی مصر بەرەو وڵاتی شام بەڕێکەوت، کاتێک سوڵتان و هێزەکەی گەیشتنە ناوچەی یافا گەمارۆیانـدا، دوای ئەوەی هێزی خاچیەکان نەیانتوانی بەرگری بکەن ناچار شـارەکەیان بەجـێ هێشـت و هەڵهـاتن، هێـزی موسـڵمانان بەبـێ شـەڕ چـوونە نـاو شـارەکە، خاچیەکـان داوای دڵنیابوونیـان کـرد لە سـوڵتان، دوای دڵنیابوونیـان لە پەیمـانی سـوڵتان قەڵای شـارەکەیان بەجـێ هێشـت و لە ڕێگـای دەریـاوە گەڕانەوە شاری (عەککا)، دواتر سوڵتان بڕیاریدا قەڵاکە بڕوخێنن، لە دوای تەواو بوونی ئەم کارە بەرەو پێگەی (شقيف) بەڕێکەوتن و توانیـان داگیری بکەن، هاوکات سوڵتان (بیبرس) دوای ئەوەی هێزی بەرگری لە (شقيف) دانا هێزێکی ناردە سەر "الباشوره" و ڕزگـاری کـرد، دواتـر هێزێکـی تـری نـاردە سـەر (دمشـق) و (گـرابلس)، ئەم هێزە بەرەو پـێگەی (الاكـراد)[2] بەڕێـکەوت و گەمارۆیانــدا، دواتــر ئەم هێـزە پـێگەی (الاكراد)ی بەجێ هێشت و (حمص) و (حماه وافاميه)ی ڕزگار کرد.[3]

---

(١) . عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٨٦.

(٢) . (حصـن الاكراد) قەڵایەکی بە هێز و پۆڵایینە دەکەوێتە سـەر چیـا، کە لە بەشـی ڕۆژئـاواوە، بەرامبەر شـاری (حمص)ەوە، ئەو چیـایەی (الجليل) کە پەیوەنـدی بە لبنـانەوە هەیە لە نێوان بعلبک و حمـص (یـاقوت الحموى: معجم البلدان، ج٢/ ص١٥٢.)

ججج

(٣) . خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٣٥- ٢٣٦.

### ڕزگارکردنی ئەنتاکیا

هێزی موسڵمانان لە ساڵی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز)[1] لە ناوچەی (امامیە)ەوە بەرەو شاری (ئەنتاکیا) بەڕێکەوتن، دوای گەیشتنی ئەم هێزە، سوڵتان سوپاکەی کردە سێ بەشەوە و هەر بەشێکیان ئەرکی خۆی هەبوو:

١. بەشی یەکەم- ئاڕاستەکەیان بەرەو بەندەری (سویدیە) بوو، ئەرکیان بڕینی هەموو ئەو ڕێگاوبانانە بوو کە شاری ئەنتاکیای بە دەریا دەبەستەوە.

٢. بەشی دووەم- ئاڕاستەکەیان بەرەو باکوور بوو بۆ بڕینی ڕێگای نێوان (ئەنتاکیاو قیلقیە) بۆ ئەوەی هیچ یارمەتیەکیان پێ نەگات.

٣. بەشی سێهەم- کەبەشی گەورەی هێزەکان بوو بە فەرماندەی سوڵتان خۆی، ئەرکی هێرش بردنەسەر شاری ئەنتاکیا و ڕزگارکردنی بوو[2].

"الکند سگبل سیمون" فەرماندەی خاچیەکان بوو لە شاری (گرابلس)، بڕیاری دا سەرکردایەتی سوپایەک بکات بۆ لێدانی هێزە ئیسلامیەکان و ڕووبەڕووبوونەوەیان لەدەرەوەی شارەکە، بەڵام هێزی موسڵمانان توانیان سەرکەوتن بەسەر خاچیەکاندا بە دەست بهێنن و فەرماندەکەیان بەدیل بگرن،[3] دواتر موسڵمانەکان لە (٤) ڕەمەزانی ساڵی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز) هەستان بە هێرشێکی گشتی بۆ سەر شواری شارەکە، دوای کوشتارێکی زۆر توانیان کەلێنێک بکەنە شورای شارەکە و لەوکەلێنەوە بچنە ناو شاری ئەنتاکیا، بەم شێوەیە یەکەم میرنشینی خاچیەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دوای "١٧١" ساڵ فەرمانڕەوایی کۆتایی هات ئەمەش گەورەترین شکست بوو بۆ خاچیەکان و بووبە سەرەتای نەمانیان لە ڕۆژهەڵات.[4]

### هەڵوێستی خاچیەکان

کەوتنی شاری ئەنتاکیا بە دەستی موسڵمانان دەنگ دانەوەیەکی گەورەی هەبوو لە ئەوروپا، بەڵام بێ هێزی و لاوازی بزووتنەوەی خاچیەکان لە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، بە تایبەت "فەڕەنسا و ئەڵمانیا و ئینگلتەرا" بووبە هۆی ئەوەی

---

(١) . أبن تغري بردي: النجوم الزاهرة ، ج٧/ ص ١٤٣.

(٢) . عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٩٤.

(٣) . رنسیمان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٥٨.

(٤) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص١٤٣.

وەلامــدانەوەی خاچیەکــان و بەتــایبەت پاپــا کە پێشــتر بانگەشــەی دەکــرد بــۆ ڕزگارکردنی (بيت المقدس) لە ڕۆژهەلات زۆر لاواز بێت، ئەم قەیرانە پاشا "اراجون جیمســی یەکەمــی" هەژانــد، بــۆیە بە کەشــتیگەلێکی گەورە و بە هێــزەوە لە ســاڵی (٦٦٨ک/ ١٢٦٩ز) لە (بەرشــەلۆنە)وە بەئاراســتەی ڕۆژهەلات بەڕێکەوت، لە ڕێــگەدا ئەم کەشــتیگەلە تووشــی گەردەلــولێکی بە هێــز هــات، ناچــار هەنـدێ لە کەشــتیەکان گەڕانەوە بــۆ بەرشــلۆنە، ئەو کەشــتیانەی مــانەوە لەگەڵ هەردوو کــوڕی پاشــا لە کۆتــایی ساڵی (٦٦٨ک/١٢٦٩ز) گەیشــتنە شــاری (عەککا) و زۆر دڵ گەرم بــوون بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسڵمانان، هاوکات (مەلیک قاهر بیبرس)یش گەیشتە نــاوچەی عەککا،[1] بیبرس بەشێکی زۆری هێزەکەی لە ناوچەکە حەشــاردابوو، تەنها هەنـدێ هێزی لە بەرامــبەر شــاری عەککــادا ئاشــکرا کــرد کە ژمارەیــان دەگەیشــتە (٣) ســێ هەزار سەرباز، لێرەدا تەکنیکێکی سەربازی بەکارهێنا بۆ چەواشە کردنی خاچیەکــان بــۆ دەرچــون و شــەڕکردن لەگەڵ موســڵمانەکان لە دەرەوەی شــاری عەککــا، لەم بــارودۆخەدا هێــزی خاچیەکــان گەیشــتە شــاری عەککــا و فەرمانــدەکانی ئــارەزووی شــەڕی موســڵمانەکانیان هەبــوو، بــۆیە بڕیــاری شــەڕیاندا، بەلام فەرمانــدەکانی خاچیەکان لە شارەکە ڕێگر بوون لە بەردەم دەرچوونیان لە شاری عەککابۆ ئەوەی نەکەونە ناو بۆسەی موسڵمانەکانەوە وەک چۆن پێشتر تیپێکی فەڕەنسی کەوتبووە بۆسەی موسڵمانەکانەوە، ناچار ئەم هێزە گەڕایەوە ئەورووپا و هیچ ئاکامێکی نەپێکا، هاوکات بارودۆخی خاچیەکانی ڕۆژهەلات بەرەو ئاقارێکی خراپ هەنگاوی دەنا.[2]

## ڕزگارکردنی پێگەی (الاكراد)

قــاهر بیبــرس لە ســاڵی (٦٥٩ک/ ١٢٦٠ز) بە ســەرکردایەتی هێزێکــی گەورە لە شــاری قــاهیرەوە کەوتە ڕێ بــۆ شــاری دیمەشــق، دوای گەیشــتنی ڕایگەیانــد کە ئامانجی ئەم هەڵمەتەی پێگەی (الاكراد)ە، بۆ ئەم مەبەستە پلانێکی دانــاو هێزەکەی دابەشکرد بۆ دوو بەش، بۆ ئەوەی دوژمــن ئاڕاســتەکەی نەزانێت، بڕیاریــدا هەردوو هێزەکە بە دوو ڕێگای جیاوازدا بەڕێ بکەون و دواتر لە شوێنێکی دیاریکراودا یەک

---

(١) . هەمان سەرچاوە، ص١٤٧.

(٢) . رنسیمان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٦٧.

بگرنەوە، بەشی یەکەمی ئەم هێزە بە فەرماندەی خۆی بوو، بەشی دووەمی بە فەرماندەی کوڕەکەی (پاشا سعید) بوو،[1] هێزەکان لە ساڵی (٦٥٩ک/ ١٢٦٠ز) لە دمەشق کەوتنە جوڵە و ئامانجە سەرەتاییەکانیان هێرش و پەلاماردانی پێگە و قەڵاکانی "جبله واللاڨيه والمرقب وعرقه ومرقيه والقلعيات وصافيتا والمجدل" بوو، دواتر ئەم هێزانە بەرەو پێگەی الاكراد کەوتنەڕێ و گەمارۆیاندا و دەستیان کرد بە هێرش و پەلاماری ئەم پێگەیە و لە سێ هێرشی گەورەدا توانیان شوراکانی پێگەکە ڕزگار بکەن و تەنها قەڵاکە لە پێشیان مایەوە، هاوکات دانیشتوانی ناو قەڵاکە ئەم هێزەیان بینی داوای خۆ بە دەستەوە دانیان کرد، بەم شێوەیە لە ڕۆژی (٢٣)ی شعبانی ساڵی (٦٥٩ک/ ١٢٦٠ز) قەڵاکەیان دایە دەستی پاشا "الڨاهر بيبرس"، دوای ئەوەی " ڨاهیر بیبرس" بارودۆخی ناو قەڵاکەی کۆنترۆڵ کرد، ترس چووە دڵ و دەروونی خاچیەکان و ناچار داوای ڕێککەوتنیان کرد،[2] پاش دانوساندن هەردوولا ڕێکەوتننامەی ئاشتییان واژۆکرد بۆ ماوەی "١٠" ساڵ و "١٠" مانگ و "١٠" ڕۆژ،[3] دوا بەدوای ئەم ڕێککەوتننامەیە هێزە موسڵمانەکان بەرەو پێگەی "ابن عەککار" لە باکووری شاری گرابلس کەوتنەڕێ و گەمارۆیاندا، لە ئەنجامدا دانیشتوان و بەرگریکارانی قەڵاکە دوای دەرچوونی خاچیەکان خۆیان دابە دەستەوە، دوای گرتنی ئەم قەڵایە هێزی موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی سوڵتان (بیبرس)پەلاماری شاری گرابلس یان دا و دانوساندن لە نێوان میری ئەم شارە و پاشا (ڨاهر بیبرس) دەستی پێکرد، لە ئەنجامدا ڕێککەوتنێکیان ئیمزاکرد بۆ ماوەی (١٠) ساڵ، دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ شاری دیمەشق بە مەبەستی گرتنی پێگەی (القرين) کە دەکەوتە نزیک شاری (صفد)، ئەم هێزە توانیان گەمارۆی پێگەکە بدەن، ناچار بەرگریکارانی پێگەکە داوای دڵنیابوونیان کرد، دوای وەرگرتنی دڵنیایی بەرگریکارانی قەڵاکە خۆیان دابە دەست موسڵمانەکانەوە، پاشا (ڨاهر بیبرس) فەرمانیدا شورای پێگەکە بڕوخێنن، دوای ئەوە هێزەکانی بەرەو (مصر) بەڕێکەوتن، لەکاتی گەڕانەوەیاندا لە نزیک شاری (عەککا) سەربازگەیان دانا و سوڵتان تەماشای ناوچەی (عەککا)ی دەکرد، دواتر لە ساڵی (٦٧٠ک/ ١٢٧١ز) کەوتەڕێ بۆ مصر دوای ئەوەی هێزەکە گەیشتە

---

(١) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٥٠

(٢) . رنيه گروسيه: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص ٩٢.

(٣) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص١٥١.

نێوان (قیساریە وارصوف) لەوێ سەربازگەیان دامەزراند و دەستیان کرد بەهێرش بۆ سەر شاری عەککا، دوا بە دوای ئەو هێرشانە فەرماندەی خاچیەکان داوای دانوساندنیان کرد، لەئەنجامدا پەیمانێکیان واژۆکرد بۆ ماوەی (١٠) ساڵ و (١٠) مانگ.

لە (٢٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٧٦ک/ ١٢٧٧ز)[1] پاشا (ڤاهر بیبرس البندقداری) کۆچی دوایی کرد، بە مردنی بەرەی ئیسلامی چالاک ترین سەرکردەی ئەو سەردەمەی لە دەستدا، بیبرس توانی لە ماوەی سەرکردایەتی کردنی بەرەی ئیسلامی مەترسی مەغۆلەکان لە ناوچەکەدا نەهێڵێت، هاوکات توانی کۆمەڵێک شار و پێگە و قەڵا ڕزگار بکات، لەوانە (قیساریە، ارصوف، صفد، گبریە، یافا، الشقیف، انگاکیە، بغراس، القصیر، حصن الاکراد، عەککا، القرین، صافیتا، مرپیە)، چەند شوێنێکی تریش لە ئەنجامی ڕێککەوتنی لەگەڵ خاچیەکاندا، بەهاوبەشی بەڕێوەیان دەبرد لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردبوون ئەوانیش (گرقب، بانیاس، انگرس) بوون، لە دوای خۆی کوڕەکەی سوڵتان (سعید ناصر الدین محمد) کە نازناوی "برکە خان" بوو شوێنی گرتەوە، بەڵام هیچ ڕۆڵێکی نەبوو لە ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی ناوچەکە، لە دوای ئەویش مەلیک (عادل)ی برای دەسەڵاتی وەرگرت، بەڵام لە هەمان ساڵدا لە دەسەڵات دەرکرا، دوای ئەو لە ساڵی (٦٧٨ک/ ١٢٧٩ز)[2] سوڵتان (منصور سیف الدین قلاوون الالفی) دەسەڵاتی وەرگرت، لە ئەنجامی جێگیر نەبوونی دەسەڵات میرنیشینی دیمەشق بە سەرکردایەتی میر (شمس الدین سنقر الاشقر) کە جێگری مەلیک (ڤاهر) بوو لە دیمەشق لە میسر جیابوویەوە، سوڵتان (منصور) لە ساڵی (٦٧٩ک/ ١٢٨٠ز) هێزێکی ئامادەکرد و بەرەو دیمەشق بەڕێکەوت، ئەم هێزە توانی یەکێتی نێوان میرنشینی دیمەشق و مصر بگێڕێتەوە، بەمەش بەرەی ئیسلامی گەڕایەوە دۆخی خۆی، دوای ئەم ڕووداوە هێزەکانی سوڵتان قلاوون لە ساڵی (٦٨٣ک/ ١٢٨٤ز) گەیشتنە پێگەی (المرقب) و گەمارۆیاندا، دوای ئەوەی هێزەکەی سوڵتان بەمەنجەنیق هێرشیان کردە

(١) . المقریزي: السلوک لمعرفة دول الملوک ، ج١/ ص ٦٣٦.

(٢) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٩٢.

سەر پێگەکە، بەرگریکارانی پێگەکە خۆیان دا بەدەستەوە، ئەم هێزە دوای ئەوەی (مرقبە)شیان لە دەستی خاچیەکان ڕزگار کرد، گەڕانەوە قاهیرە.[1]

## ڕزگارکردنی طرابلس

لە دوای پرۆسەی ڕزگارکردنی ناوچەکان، قلاوون بڕیاری دەکردنی خاچیەکانی لە شاری (گرابلس)دا، بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی (٦٨٨ک/ ١٢٨٩ز) لە شاری قاهیرەوە بەرەو دیمەشق و لە وێشەوە بۆ شاری تەرابلس بەڕێکەوت، هێزەکانی قلاوون کاتێک گەیشتنە کەناری شارەکە بە دانانی مەنجەنیق (ئاگر پەرژێن) گەمارۆیاندا و خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرش و پەلامار، دوای ئەوەی شەڕ دەستی پێکرد توانیان بچنە ناو شارەکە و دەستی بەسەردا بگرن، دوای گیرانی شارەکە قەڵا و پێگەکانی دەوروبەری بە بێ شەڕ کردن خۆیاندا بە دەستەوە،[2] دوای ئەم ڕووداوانە هێزی موسڵمانان لە سەرەتای ساڵی (٦٨٩ک/ ١٢٩٠ز) گەڕایەوە بۆ میسر.

دوای ڕووخانی میرنشینی تەرابلس کێشە و ململانێ لە نێوان (بیزا و جنوا) دەستی پێکرد، ئەم ململانێ یە پەرەی سەند تا گەشتە بەرپابوونی شەڕ لە نێوانیاندا، و گەشتیەکانیان خەریکی شەڕ بوون، ئەمەش باشترین دەرفەت بوو بۆ موسڵمانان بۆ هێرش بردنە سەر خاچیەکان، بۆیە سوڵتان فەرمانیدا بە میر "حسام الدین گرنگای" بەندەری (اللاژقیە) کە دوا شار بوو بە دەستی خاچیەکانەوە ڕزگار بکات.[3]

لە دوای کەوتنی تەرابلس خاچیەکان ترس باڵی کێشا بە سەریاندا و بەناچاری لە هەندێ شوێنی وەک (بیروت و جبلە)کشانەوە،[4] دوای ئەوەی سوڵتان (قلاوون) گەڕایەوە بۆ دیمەشق لە لایەن مەلیک (هنری دووەم) پێشوازی لێکرا کە داوای ڕێککەوتنی دەکرد و ڕازی بوو بە تازەکردنەوەی پەیمانەکەی نێوانیان، کە لە هاوینی ساڵی (٦٨٨ک/١٢٨٩ز)دا بۆ ماوەی (١٠) ساڵ و (١٠) مانگ مۆریان کردبوو،

---

(١) . قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٦٠

(٢) . رنیە گروسیە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٣

(٣) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٩٣.

(٤) . عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١١١٩.

دانیشتوانی (جنوا) کاتێک ئەم هەنگاوەی میر (هنری دووەم)یان بینی، لەگەڵ سوڵتان پەیمانی برایەتییان واژۆکرد بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە بازرگانیەکانی نێوان هەردوولا، بەمەش هەندێ ئیمتیازاتی بازرگانیان لە (ئەسکندەرییە) دەسکەوت، بەم شێوەیە ئاشتی باڵی کێشایەوە بەسەر پەیوەندی نێوان موسڵمانانەکان و خاچیەکان، کاروانە بازرگانیەکانی هەردوولا بە دڵنیاییەوە و بەبێ هیچ ڕێگرییەک هاتووچۆیان دەکرد٬ بەڵام (بندقیە)کان بەرامبەر بەم کارە نیگەران بوون.[1]

## ڕزگارکردنی شاری عەککا

ئاشتی نێوان موسڵمانان و خاچیەکان بەردەوام نەبوو بە هۆی ئەوەی خاچیەکان ئەو پەیمانەیان پێشێل کرد کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا واژۆیان کردبوو، ئەمەش لە دوای گەیشتنی هێزێکی خاچی بۆ شاری (عەککا)، ئەم هێزە کە لەشاری (بندقیە)ەوە لە هەموو ڕوویەکەوە ئامادە کرابوو، مەبەستی تێکدانی ئمتیازاتی بازرگانی (جنوا)بوو کە لە مصر دەستییان کەوتبوو، ئەم هێزە بە گەیشتنی بۆ ناوچەکە هەستا بە هێرش و پەلاماردانی جوتیارە موسڵمانەکان لە ناوچەکانی نزیک شاری عەککا، هەروەها بازرگانە موسڵمانەکان لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ شاری (ئەسکندەرییە) کە بە مەبەستی بازرگانی چوو بوون بۆ شاری (عەککا) بە دەستی ئەم هێزە کوژران.

ئەم ڕووداوانە سوڵتانی نیگەران کرد، ناچار خاچیەکان وەفدێکیان ناردە لای سوڵتان و داوای لێبوردنیان کرد، بۆ سەلماندنی نیازپاکی خاچیەکان سوڵتان داوای بەدەستەوەدانی تاونبارانی کرد، بەڵام خاچیەکان وەڵامیان نەدایەوە ئەمەش بووبە هۆی تێکچوونی ئاشتی نێوان هەردوولا، بۆیە سوڵتان فەرمانی شەڕیدا، بۆ ئەم مەبەستە هەستا بەخۆ ئامادەکردن و پلانێکی سەربازی دارشت بۆ بەرەنگاربوونەوەیان بەم شێوەیە:

١. دانانی سەربازگەیەک لە دەرەوەی شاری قاهیرە، لای مزگەوتی"التبن" وەک بنکەیەکی سەربازی.

---

(١) . هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١١٢٠.

٢. داوای لە جێگرەکەی کرد لە دیمەشق خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات،[1] سوڵتان دوای ئەوەی خۆی بۆ شەڕ ئامادەکرد بڕیاری دەرچوونیدا، بەڵام پێش ئەوەی بەرێبکەوێت نەخۆشی زۆری بۆ هێنا و لە ساڵی (٥٨٩ک/ ١١٩٣ز)دا کۆچی دوایی کرد، بەم شێوەیە ژیانی ئەم فەرماندە لێهاتووە تەواو بوو، لەوکاتەدا خاچپەکان تەنها (عەککا، صور، صیدا، عقلیت) یان بەدەستەوە مابوویەوە.

لە دوای مردنی قلاوون کوڕەکەی کە ناوی میر (اشرف خلیل) بوو شوێنی گرتەوە، لەو کاتدا خاچپەکان وەفدێکی تریان ناردە لای سوڵتانی تازە بۆ ڕاگرتنی شەڕ و داوای لێبوردنیان کرد، لەو کارەی پێشوویان بەڵام سوڵتان (اشرف خلیل) بە داواکانی خاچپەکان قایل نەبوو، بەڵکو هەواڵی نارد بۆ وڵاتی شام تا لای شاری عەککا ئامادە بن،[2] بۆ جێ بەجێکردنی ئامانجەکەی باوکی لە گەمارۆدانی عەککا و شەڕ کردن لەگەڵ خاچپەکان، هێزەکانی سوڵتان توانیان گەمارۆی عەککا بدەن، دوای ئەوەی بە مەنجەنیق هێرشیان کردەسەر شارەکە، توانیان کەلێنێک بکەنە شوراکانی شارەکەوە.[3]

سەرکردایەتی خاچپەکان پێیان وابوو تێکشکانیان لە شەڕی عەککا دەبێتە کۆتایی خاچپەکان لەناوچەکەدا، لەبەرئەوە هەموو هێزەکانیان لە ناو شاری عەککا کۆکردەوە بۆ بەرگری کردن لەشارەکە، ژمارەی هێزەکانیان لە ناو شاری عەککا نزیکەی (٨٠٠) سوار و (١٤) هەزار جەنگاوەر و (٢٥) هەزار لە حەجاج و دانیشتوان و خۆ بەختکار دەبوو.

بۆ پاڵپشتی کردنی خاچپەکان لە ساڵی (٦٩٠ک/ ١٢٩١ز) پاشای قبرص (هنری دووەم) لەگەڵ هێزێکی پێکهاتوو لە (٢٠٠) سوار و (٥٠٠) پیادە و بڕێکی زۆر کەرەستەی جەنگی گەیشتە شاری عەککا، بە گەیشتنی ئەم هاوکارییانە ورەی خاچپەکانی شاری عەککا بەرز بوویەوە،[4] (هنری دووەم) کاتێک تێبینی بارودۆخی هەردوولای کرد، بۆی دەرکەوت دۆخی خاچپەکان خراپە، لەبەرامبەردا موسڵمانان ساز و ئامادەن بۆ شەڕ کردن، بۆ دەربازکردنی خاچپەکان لەو قەیرانە هنری دووەم پەنای بردە بەر سیاسەتی ڕێککەوتن لەگەڵ سوڵتان (اشرف خلیل)، بەڵام

---

(١) . ە- س، ص ١١٢٢.

(٢) . ە- س، ص ١١٢٤.

(٣) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٨/ ص٥.

(٤) . عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١١٢٤.

دوای ئەوەی هەوڵەکانی بێ سوود بوون و نەیتوانی هیچ پێشکەوتنێک بە دەست بهێنێت، لەگەڵ هێزەکانی گەڕایەوە بۆ (قبرص).[١]

گەڕانەوەی هنری دووەم و هێزەکەی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر باری دەروونی خاچیەکان کە بە هۆیەوە ورەیان دابەزی، دوای ئەم دۆخە ترسناکەی خاچیەکان هێزە موسڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە خۆیان ئامادە کرد بۆ جیهاد و ڕزگارکردنی شاری عەککا، هاوکات هێزەکانی (سیف الدین)یش لە "تەرابلس" ەوە پەیوەندییان کرد بەهێزەکەی سوڵتانەوە، هێزی مصریەکان کە(٧٢) مەنجەنیقیان هێنابوو،[٢] لە هەموو لایەکەوە دامەزران و لە ماوەی چوار ڕۆژدا توانیان گەمارۆی شاری عەککا بدەن،[٣]دوای گەمارۆدان و لێدانی بەردەوام لەلایەن موسڵمانەکانەوە، هێزی موسڵمانان خۆیان ئامادەکرد بۆ دەست پێکردنی پرۆسەی پەلامار، دوای ئەوەی سوڵتان (اشراف خلیل) بڕیاری هێرشیدا، توانیان بەرەو شوراکانی شاری عەککا پێشکەون، بەڵام پێشتر خاچیەکان لە ژێر کاریگەری لێدانی موسڵمانەکاندا بەجێیان هێشتبوو بەمەش موسڵمانەکان توانیان لەماوەیەکی کەمدا شاری عەککا ڕزگار بکەن، خاچیەکان تەنها هەندێ قوللەیان بە دەستەوە مابوو ئەوانیش سواری (الداویە و الأسبتاریە)ی لێی بوو، هێزە موسڵمانەکان توانیان گەمارۆی ئەوانیش بدەن، ناچار داوای دڵنیابوونیان کرد، بەڵام لە ئەنجامی ڕەفتاری هەندێ لە هێزە ئیسلامیەکان دووبارە گەڕانەوە ناو قوللەکانیان و جارێکی تر موسڵمانان گەمارۆیان دانەوە، دووبارە سوڵتان ئەمانی پێدان و شاری (عەککا)یان بەجێ هێشت، بەمەش موسڵمانەکان پرۆسەی ڕزگارکردنیان تەواوکرد، سوڵتان لەو کاتەی شاری (عەککا)ی گەمارۆدا بوو هێزێکی بە فەرماندەی (علم الدین سنجر الصوای الجاشنکیر) نارد بۆ شاری (صور) بۆ بڕینی ڕێگای عەککا و ناردنی زانیاری لەسەر جموجۆڵی خاچیەکان، بە کەوتنی شاری (عەککا) شاری (صور) داوای دڵنیابوونی کرد، دوای وەرگرتنی دڵنیایی بەبێ شەڕ خۆیان دا بەدەست هێزی موسڵمانەکانەوە، دواتر شوێنەکانی تری ناوچەی شام ڕزگار کرا، "علم الدین سنجر" توانی شاری (صیدا)ش ڕزگار بکات، هەروەها سوڵتان فەرمانیدا بە تێکدانی

---

(١) . أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٨/ ص٦.

(٢) . ە- س، ج٨/ ص٥.

(٣) . المقريزي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٦٥.

قەڵای (جبیل)، دواتر بەرەو شاری (انگرسوس) بەڕێکەوتن و بە هەمان شێوە ڕزگاریان کرد[1]، بەم سەرکەوتنانە جیهانی ئیسلامی ڕزگاری بوو لە مەترسی و شەڕ و هێرش و پەلامار و هەڵمەتی خاچپەکان، کە بۆ ماوەی "٢٠٠" ساڵ جیهانی ئیسلامی تووشی قەیرانێکی خراپ کردبوو، لە خوێن ڕشتن و دەردەسەری و ئاوارە بوون و تالان و وێران و کاولکاری، جگە لە کوشتارێکی زۆری هەردوولا (موسڵمانان و خاچپەکان).

## هەڵمەتی نۆیەمی خاچپەکان

کۆتاییهاتنی شالاوی هەشتەمی خاچپەکان بە مردنی لویسی نۆیەم بوو. دوای ئەو بیبرس خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵمەتەکەی ئامادە نەکرد و بۆ جاری دووەم بەرەو تەرابلوس چوو، بەڵام بوهیموندی میری ئەوی داوای ئاشتی کرد و سوڵتانیش بەوە ڕازیبوو، چونکە شالاوێکی نوێی خاچی بەسەرکردایەتی میر ئیدوارد هات و گەیشتە عەککا، ڕێککەوتنی نێوان بیبرس بوهیموندیش بۆ ماوەی دەساڵ بوو. سوڵتان بیبرس هێرشی بردە سەر عەککا کە (هێزی سێیەمی گەورە) و دوژمنی سەرسەختی ئیسلام و خاوەن چاوچنۆکی خاچی بەرپرسی بوو، خاچپەکان ئەوێیان کردبوویە بنکەیەک تا لەوێوە هەنگاو بنێن و بگەن بە وڵاتی شام (لەوکاتەی دەچوونە ناو دەریاوە)، بەڵام کەشتیگەلی ئیسلامی بە هۆی گەردەلولێکی دەریاییەوە تێکشا.ئەرمەنیەکان دوای جەنگی ملازگرد کیلیکیایان بە جێهێشتبوو، کاتێک سەلجوقیەکان لە ئاسیای بچووک ئەوێیان بە جێهێشت، ئەرمینیەکان لەوێ دەوڵەتی ئەرمینیای بچووکیان دامەزراند کە بەردەوام پاڵپشتێکی خاچپەکان بوو، بۆیە بیبرس هێرشی بردە سەر، ئەو دەوڵەتە لە دژی بیبرس دەوەستاو پاڵپشتی خاچپەکانی دەکرد و نەیدەهێشت تەختەو ئاسن بچێت بو میسر، بیبرس بەسەریدا سەرکەوت و ژمارەیەک لە سەرکردەکانی بەدیلگرت، لەوانە کوڕی (هیسومی یەکەم)بەوە ئەودەوڵەتە لەوەو بەدوا لاواز کەوت.تێبینی ئەوەدەکرێت ئەو دەوڵەتانەی بیبرس هاوپەیمانی لەگەڵ بەستبوون پاڵپشتی خاچپەکان نەبوون ئەوەش واتای هاوپەیمانی بوو، چونکە ئەگەر بڕوانینە دەوڵەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوا هەمیشە پاڵپشت و هاندەری

---

(١) . رنیە گروسیە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٤.

خاچیەکان بوو، کاتێک فەرەنسی و ئینگلیزەکان سەرکردایەتی شالاوی هەشتەم و نۆیەمی خاچیەکانیان دەکرد نیمچە بێلایەنی نواند.چونکە یەکەمیان بەڕێبەری لویسی نۆیەمی پاشای فەرەنسا بوو و دووەمیش بەسەرکردایەتی ئیدواردی سەرکردەی ئینگلیزی بوو، کاتێک سولتان مەنسور قلاون بوو بە فەرمانڕەوا مەرقەب و دەوروبەری قەتعکرد و میری خاچی تەرابلوسیش لێی ترساو لەسەر خواستی سولتان بینا نزیکەکانی وێرانکرد، سولتان مەنسور قلاونیش چوو بۆ دیمەشق و لەوێوە بۆ تەرابلوس و گەمارۆی داو گرتی، لە کاتێکدا بەدرێژایی ئەو ماوەیە لە دەست خاچیەکاندا مابوویەوە.قلاوون بڕیاریدا عەککا بگرێت، بەڵام پێش ئەو مرد، کاتێک ئەشرف سەلاحەددین خەلیلی کوڕی هاتە سەر دەسەلات لە میسرەوە بەرەو عەککا چوو سەربازانی دیمەشق و تەرابلوس و حەممای کۆکردەوە و فەتحیانکرد و خاچیەکان لە ڕێگەی دەریاوە ڕایانکرد، ئەشرف توانی صیدا و صوریش بگرێت.پاشان نوێنەری خۆی لەسەر دیمەشق و بەیروت دانا، دواتر ترجبیل و تەرسوسی کەوتە دەست، خاچیەکان لە کەناراوەکان و ولاتی شامدا هیچ شوێنەوارێکیان نەما، دواتر هێرشی بردە سەر ڕۆم و هێزێکی نارد بۆ کیسرەوان چونکە مەسیحیەکانی ئەو ناوچەیە پاڵپشتی مەسیحیەکانی دیکە بوون.[1]

### ئەنجامی لایەنی ژیاری و فیکری

ڕۆژهەڵات بە شێوەیەکی گشتی و وڵاتی شام و جەزیرە بە شێوەیەکی تایبەتی لە ڕۆژگاری بەر لە هاتنی هەڵمەتەکانی خاچیەکان، لەسەرجەم لایەنەکانیدا لە سەردەمێکی گەشەسەندوودا دەژیا، لە کاتێکدا ئەوروپا بە شێوەیەکی گشتی لە چەرخە تاریکەکانیدا دەژیا و بە قۆناغێکی تایبەتدا تێدەپەڕی کە لە مێژوودا بە "چەرخە تاریکەکان" ناودەبرێ، شەڕی خاچیەکان ماوەی (٢٠٠) ساڵ زیاتری خایاند و لەم ماوەیەشدا دەیان و بگرە سەدان شەڕ و ڕووبەڕوو بوونەوە و ئاگر بەست و هانا بۆ یەکتر بردن و... تاد ڕوویداوە، لە ئەنجامدا چەندین کارلێکی جیا جیا لە نێوان هەردوو ژیاردا ڕوویدا، ئاشکرایە کڵێسا لەو سەردەمەدا لە ئەوروپا لە هەردوو لایەنی ئاینی و دونیایی بالادەست بوو، واتە هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و

(١).جفری برون:پوختەی مێژووی ئەوروپا، و.نهاد جلال حبيب الله،چاپی یەکەم،٢٠٠٩،ل ٢٦٨-٢٦٩.

سیاسی لە دەست بووە، هەموو ئەو زانست و فەلسەفە و مەعریفانەی قەدەغە کردووە کە لەگەڵ ڕەوتی دەسەڵاتی کڵێسادا نەدەگونجا هەروەها هەردەم هەوڵی ئەوەی داوە کە بونیادە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکەی کۆمەڵگای ئەوروپی لەسەر ڕێڕەوی ڕاستەوخۆی نەخشە بۆ کێشراوی کڵێسا، بە شێوەیەکی هێمن و لەسەرخۆ و دوور لە بیرکردنەوە و قوڵ بوونەوە لە دیاردەکان و ڕووداوەکان هەنگاوبنێت، ئەویش بە ڕەتکردنەوەی هەر هەنگاوێک کە ئاماژەبوایە بۆ فیکری سیاسی، هەمان پرانسیپشیان لەسەر مەزهەبەکانی خودی مەسیحیەتیش پراکتیزە دەکرد، کە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان کاریگەری لەسەر بەشێک لە کۆمەڵگای ئەوروپی ماوە، هەرچی جیهانی ئیسلامییە یا بە شێوەیەکی ڕاستر ڕۆژهەڵات ئەوە بە بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئاینی ئیسلامی کە ئەوانیش خیلافەتی عەباسی لە ڕۆژهەڵات و فاگیمی لە میسر و ئومەوییەکان لە ئەندەلوس (ئیسپانیا)بوون، ژیاری ئیسلامی لە سەدەی (١٢)ی زاینیدا تاکە ژیای پێشکەوتووی دونیا بوو، بە پێچەوانەی ئەوروپا کە لە دواییەکانی ژیاری دابوو.

دەتوانین گرنگترین ئەو خاڵانەی وەک دەرئەنجامی شەڕی خاچیەکان لە ڕووی ژیانییەوە دەست نیشان دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە ئاماژەی بۆ بکەین، خاچیەکان کاریگەر بوون بە پیشەسازییە تازەکان و ڕەنگەکان (سبوغ)، و جل و بەرگ و زرێپۆشی سەربازی و هێما سەربازییەکان و مۆسیقای سەربازی و کۆتری نامە بەر، هەروەها لە بیناکاریدا کاریگەری زۆری موسڵمانانەکانیان لەسەر بوو، هەروەها مەسیحیەکان لەکاتی گەڕانەوەیان بۆ ئەوروپا چەندین شتی وەک مەنجەنیق و قامیشی شەکر و خشڵی جوانکارییان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد، [١] خاچیەکان فێری بە کارهێنانی تیروکەوان و شێوازی گەمارۆدان بوون، هەروەها خاچیەکان لە شەڕەکانیاندا فێری بە کارهێنانی بارووودبوون و شمشێری عەرەبیان هەڵگرت بە تایبەت یەمەنیەکەی کە بە سووکی لەکاتی کارهێنانیدا ناسراوە، هەروەها فێری دروست کردنی پێگە و قەڵا جەنگییەکان و هێرش بردنە سەری بوون،[٢] هەر چەندە دەبێ ئەوەش بزانین کە شوێنەوار و پاشماوەی بیناسازی ئەورووپی هەر لە کۆنەوە تا سەردەمی شەڕی خاچی لە سەدەکانی (١٢- ١٣ز)دا پێشکەوتوتر بووە

---

(١). نجيب العقيقي: المستشرقون، مطبعة دار المعارف، القاهرة، ١٩٦٤، ج١/ص١٣٧.

(٢). د. خاشع المعاضيدي واخرون: م.ن،ص٢٦٠.

له بیناسـازی ئیسـلامی هەروەک نجیـب العقیقـی دەڵێت "خاچیەکـان لەگەڵ خۆیانـدا ئەنـدازەی بونیادنـانی سـەربازییان لەگەڵ خۆیانـدا هێنـا لە ئیتاڵیـا و نورمانـدییەوە، شـوێنەواری ئەم قەڵا و پـێگە سـەربازیانە تـا ڕۆژگـاری ئەمڕۆمـان مـاونەتەوە، لەوانەش (قەڵای کورد) و(قەڵای مرقب) و (سقیف ئارنون) و کڵێسای (بترس بوخیا) لە بیـروت و چـاککردن و بینـاکردنی بەشـێک لە کڵێسـای ڕۆژی هەڵسـانەوە (یـوم القیمـامە)،[1] خاچیەکـان کـاریگەربوون بە ڕۆژهەڵات و زۆر نزیـک دەبـوونەوە لە زانسـت و هـونەر و وێژە، زۆرجـار لە ڕووی فەلسـەفە و بیرکـارییەوە راوێژیـان بە موسڵمانان کردووە، هەروەها چەندین بابەتیان وەرگێراوەتە سەر زمانەکانی خۆیـان وەک "الف لیله ولیله" و "کەلیله ودمنه" و"المکلی الگبی- لعلی بن عباس" ئەمە یاسـن ئیستفانی ئەنتاکی وەرگێڕاوە،[2] هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێن کە سـەرجەم مرۆڤـایەتی قەرزاری ڕۆژئـاوایە بە تـایبەتی قەرزاری ژیـارە یۆنـانی و ڕۆمانیەکـان بە هەمـوو پێکهاتەکانیـانەوە، هەروەهـا لە ئەنجامەکـانی تـری ژیاریـدا گرنگیـدان و پێشـکەوتنی جوگرافیا و مێژوو بوو، هەڵبەتە هەر یەکێک لەم دووانە هاوشـانی یەکتـری بووین جوگرافیا بۆ دۆزینەوەی ڕێگا و شـارەزا بـوون لە وڵاتـانی ڕۆژهەڵات وەک شـام کە بـاس لە بـارودۆخ و شـارەکانی و ڕێگاکـانی دەکـات بـۆ هەڵمەتەکانیـان، بە تـایبەت بازرگان و موژدەدەرەکان لە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا کـاریگەری زۆریـان هەبـوو بـۆ ئەوەی زانیـاری زیـاتر دەربـارەی جوگرافیـای ئەو وڵاتە وەربگـرن و ڕەوانەی وڵاتەکانی خۆیانی بکەن کە هیچ شارەزاییان لەسەریان نەبووە.[3]

### ئەنجامی لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی

پێکهاتەی کۆمەلایەتی کۆمەڵگاکانی ئەوروپا تا ئاستێکی زۆر لە ڕووی بونیاد و پێکهاتەوە لە یەکتر نزیک بوون، چونکە هەر لە سـەردەمی ڕووخـانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیەوە موڵکدارە بچووکەکان نەیانتوانی پارێزگاری و وەبەرهێنانی زەوییەکانیان بکەن ناچار یا بەنایان دەبردە بەر موڵکدارە گەورەکان یا کڵێسـاکان یـاخود لە ژێر چەتری فەرماندەکی سەربازی کاریان دەکرد، بەم شێوەیە گەورە و نۆکەر دروسـت بوو تا کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست درێژەی کێشا، بەڵام لە سەردەمی شـەڕی

---

(١).نجیب العقیقي: م.ن،ص ١٣٧.

(٢). نجیب العقیقي: م.ن،ص ١٣٨.

(٣).د. خاشع المعاضیدي واخرون: م.ن،ص ٢٦١.

خاچیەکان ئەم نۆکەرە کە لە ڕووی مێژووییەوە بە (رقیق) ناسرابوون، لە ئەنجامی خراپی گوزەرانیان بە هیوای باشکردنی ژیانیان و ڕزگاربوونیان لە ژێردەستی لە شەڕی خاچیدا بەشداریانکرد، ئەوە بوو خەڵکێکی زۆر بەشداریان کرد و ئەوروپایان ڕووەو ڕۆژهەڵات بەجێهێشت، ژمارەیەکی زۆریان مردن و بەشێکی تریشیان پیشەیەکی تری هەڵبژارد، بەم شێوەیە کشتوکاڵ لە ئەوروپا پشتگوێ خرا و دۆخی خراپ بوو چونکە بەشێکی زۆری جوتیارەکان لەکەنارەکان نیشتەجێ بوون، لە هەمان کاتدا شارەکان گەشەیان کرد، بەم شێوەیە سیستمی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپا هەرەسی هێنا و لاواز بوو، سیستمی دەرەبەگایەتی تەنها سیستەمێکی کۆمەڵایەتی نەبوو، بەڵکو سیستمێکی سیاسیش بوو چونکە دەرەبەگە گەورەکان جۆرێک لەسەربەخۆییان هەبوو، بە تایبەت لە ڕۆژئاوای ئەوروپا، تەنانەت مەلیک بۆی نەبوو حوکمی رەهایان بەسەردا بدات، شەڕی خاچیەکانیش هەرەس هێنانی ئەم سیستمەی خێراترکرد، چونکە دەسەڵاتی مەلیکەکان بە هێز بوو لە بەرامبەردا دەرەبەگەکان لە دوولاوە زیانیان لێکەوت لە لایەک زەوییەکانیان فەرامۆش کرا و لە لایەکی ترەوە پارەوپول و هێزێکی زۆریان لە شەڕی خاچیەکاندا لە دەستدا لە بەرامبەردا مەلیک هەر بە هێزتر دەبوو، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە مەلەکەتی بە هێز پەیدابێت.[١]

هەروەها کڵێسا هێز و توانایەکی وای پەیداکردبوو کە ململانێ کردن لەگەڵیدا سەرکێشی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەردوولا پەیوەندی توندیان هەبووە، چونکە بەرژەوەندییەکانیان هاوجوت بوو، بۆ دەبینین ڕاهیبەکان لە جیاتی کاری تەبشیری کە کۆڵەکەی فیکری خاچی بو و ئاسانکاریان بۆ نزیک کردنەوەی پەیوەندی نێوان پاپا و مەلیکەکان دەکرد واتە لە کاری ئاینی لایان دابوو ڕوویان کردبووە بوارێکی تر کە ئەویش ڕاگرتنی هەردوولا بوو،[٢] دەبێ ئاماژە بەوەش بدەین کە ڕق و قینێکی زۆر لە نێوان هەردوولا ئەوروپا و ڕۆژهەڵات دروست بوو، ئەمیش لە ئەنجامی جۆشی کوێرانەی خاچیەکان بووە بە پلەی یەکەم چونکە لە گرتنی شاری قودس کوشتارێکی زۆری موسڵمانان و دانیشتوانی قودسیان کرد هەروەک

---

(١).د. خاشع المعاضيدي واخرون: ه- س، ص٢٦٣.

(٢). د. أحمد دراج: المماليك والفرنج، مطبعة دار الفكر العربي للطباعة، القاهرة، ١٩٦١، ص١٢.

مێژوونوسی شەڕی خاچیەکان دەڵێ کاتێ شاری قودس گیرا ئەمیرەکان نامەیەکیان بۆ پاپا ناردوو تێیدا هاتبوو (اژا اردت ان تعرف مایجری لأعدائنا، فیق انه فی معید سلیمان جامع عمر کانت خیولنا نفوچ الی رکبتها فی مجد من وما و الشرتین)[1] ئەمەش ئەوەمان لا دەردەخات کە ئەم شەڕە دورو درێژەی نێوان هەردوولا بە شێوەیەکی سەرەکی تەنها ئامانجی سیاسی و ئابووری لە پشت بووە و لایەنەکانی تر بە پلەی لە خوارتر بوون و گرنگی سەرەکیان نەبووە، هەروەک ئەو نزیک بوونەوە و هەوڵدانەی پاپا بۆ ئەوەی "حەبەشە بخاتە نێو مەزهەبی کاسۆلیکی و بە یەکەوە هێرشێکی وشکانی و دەریایی لە هەموو لایەکەوە بکەنە سەر میسر و داگیری بکەن،[2] لەگەڵ ئەمەشدا بازرگانی گەشەی کردوو و هاتوچۆی کاروانەکان و گەشتەکان زۆر ئازاد بوون و تەنانەت کێشەی شەڕ و شۆڕیش دوورخرابوونەوە، ئەم بازرگانیە بووبە هۆی ئەوەی کە چەندین شاری ئەورووپی وەک (جەنەواو بەرشلۆنە و بندقیە) ببوژێنەوە، بەم شێوەیە ئابووری لە ئەورووپا گەشایەوە و شارەکانی ئەورووپا تائاستێکی زۆر لە کاروباری ناوخۆیان سەربەخۆبوون و بوون بە یەکەیەکی سیاسی و ئابووری گەشاوە،[3] بەلام زۆر جار بازرگانی بە تایبەتی و ئابووری بە گشتی بۆ مەبەستی سیاسی و سەربازی بەکار دەهات وەک بە کارهێنانی دابڕینی ئابووری بەسەر میسر و لێدانی بەندەرەکان ڕێگری دەریاوانی بۆ ئەوەی ئامادەسازی بکەن بۆ هێرش بردنە سەر میسر.[4]

### ئەنجامەکانی لایەنی ئابووری

هەڵبەتە هەر جەنگ و شەڕێک وەک دیاردەیەکی وێرانکەر ئەنجامی تێکدان وماڵ وێرانی بە دواوە دەبێ و لە هەردوو لایەنی شەڕکەریش خەرجێکی زۆری پێویستە بۆ دابین کردنی تەدارەکی جەنگ و ئامادەکردنی سەربازەکان و دابین کردنی پێداویستیەکانیان و... تاد. سەبارەت بە شەڕی خاچیەکان، هەردوو لایەنی شەڕکەر کە یەکێکیان لە پێگەی بەرگریی کردندا بوو ئەوتریان (خاچیەکان) لە

---

(١).محمد عمارة: معارک العرب ضد الغزاة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ،١٩٧٥، ص٢٥.

(٢). د. أحمد دراج: م.ن،ص٢٥.

(٣). د. خاشع المعاضيدي واخرون: م.ن،ص ٢٦٤.

(٤). د. أحمد دراج: م.ن،ص ٩.

پێگەی هێرش و هەڵمەتدا بووە و ڕێگایەکی دور و درێژیان بڕییوە تا گەیشتونەتە ڕۆژهەڵات کە لەوانەیە هەزار کیلـۆمەتر بێـت بە تـایبەت بـۆ ئەو سـەردەم کە ئامرازەکـانی گواسـتنەوە و گەیانـدن زۆر سـاکار و سـەرەتایی بـووە و خەرجێکـی زۆری پێویسـت بـووە، بـۆیە هەر لە سـاڵی (٥٤٢ک/١١٤٧ز) لویسـی حەوتەم بـاجی تـازەی دانـا و لە دوای ئەویـش (هنـری دووەم) مەلیکـی بەریتانیـا لە سـاڵی (٥٦٢ک/١١٦٦ز) ئەم بـاجەی بە نـاوی (دەیەکـی چاکسـازی ئـاینی- عشـور إصـلاح الدینی) گەشەپێدا ئەم باجەیان گرنگی خۆی بوو چونکە بۆ یەکەمجار باج لەسەر گواسـتراوەکان دانـرا، کە بە سـەرەتای سیسـتمی تـازەی بـاج دادەنرێ، بە هەمـان شێوە کڵێساش باجی لەسەر پیاوە ئاینییەکان دانا بە ناوی (دەیەکی شـەڕی خـاچی- عشور حرب الصلیبیه).[١]

بازرگـانی لە نێـوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوا ژیـایەوە و تەنـانەت نـاوچەی شـام و میسر ببوون بە ناوچەی بە یەکگەیشتنی بازرگانی و بە بـازاڕێکی جیهـانی، تەنـانەت محمد عمارەی مێژوونووسی شەڕی خاچیەکـان سـەبارەت بە دەسـەڵاتی خاچیەکـان لە ڕووی بازرگـانی دەڵێ (كانت خزائن مصـر تحت تصـرفنا، سلكه اورشـليم كانت أمنه من جهه البر المصـرى، وسـالك الجركـان صـرا كمـا إن المـوانى المصـريه كانت كلها مفتوحه لقيول مراكبنا، وتجارهـا كـانوا ينقلـون الـى مـوانى بلادنـا غـلات اراچيهـا، وهژه اعتاد كانت كليه الفوائد لنا، وكانت الجزيه والغرات نأتى لنا بأنتقام).[٢]

### ئەنجامی لەسەر جیهانی ئیسلام

هەڵمەتەکـــانی خاچیەکـــان کـــاریگەری زۆری کردەســـەر جیهـــانی ئیسـلامی،گرنگترینیان ´جهـاد´ی لە پێنـاو خـودا زینـدوکردەوە کە ئەمەش گیـان و سـۆزی موسـڵمانانی خرۆشـاند و یەکـی کـردن، بە کارهێنـانی پڕوپاگەنـدە بـۆ بەرزکـردنەوەی ورەی خەڵـک بە تـایبەت دوای گیرانـی قـودس بـۆ ئەوەی ڕووەو قـودس بچـن و ڕزگـاری بـکەن ئەنجـامێکی دیـکە بـوو، هەروەهـا لە ئەنجـامی ئەو جەنـگە مـاوە دوورو درێـژەدا سـەرکردە و فەرماندەکانی موسـڵمانان بەهرەیەکـی

(١). د. خاشع المعاضيدي واخرون: م.ن،ص٢٦٤.

(٢). وەرگیراوە لە محمد عمارە: م.ن،ص ٢٨.

باشیان له جەنگ و هونەرەکانیدا پەیداکرد و له هەمان کاتیش پەیوەندیەکی گشتی له نێوان خو و نەریت و سروشتی موسڵمانان له لایەن مەسیحیەکان و به پێچەوانەشەوە دروست بوو، پاشان پەیوەندی موسڵمانان لەگەڵ ئەوروپا و میرنشینە مەسیحیەکانی ناوچەکەدا هاتە کایەوە، ئەنجامێکی دیکەش بریتی بوو له دروست بوون و هاتنەکایەی چەندین دەوڵەتۆکە له میسر و شام، له هەمان کاتیشدا بوو به هۆی لاوازبوون و لەناو چوونی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و هەروەها دەوڵەتی ئیسلامیش له ئاکامی چەندین ساڵ شەڕی بەردەوام لاواز بوو به تایبەت دوای دەرکەوتنی مەغۆلەکان.[1]

## ڕووخاندنی دەوڵەتی ئەیوبی

دەسەڵاتی سەلاحەددین ناوچەی نێوان دیجلە و نیلی گرتبووەوە، بەڵام پاش کۆچی دوایی سەلاحەددین (٥٨٩ک/١١٩٣ز)، دەوڵەتی ئەیوبی له نێوان کوڕ و براکانیدا دابەشکرا، ساڵی (٥٩٢ک/١١٩٦ز) ناکۆکی و دووبەرەکی کەوتە نێوان کوڕەکانی و براکانییەوە، هەر چەندە ئەم ناکۆکییە درێژەی خایاند، بەڵام سیاسەتی گشتی ئەوەبوو ئاشتی بپارێزن و بازرگانی گەشە پێ بدەن له نێوان ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان و ناوچەی خاچیەکاندا، هەر لەم ڕوانگەیەوە ڕێدرا به بازرگانەکانی بوندوقیە بازاڕ و میوانخانە له ئەسکەندەرییەدا بکەنەوە.

دووبەرەکی نێوان ئەیوبیەکان و چەند خێزانێک له بنەماڵەی ئەیوبیەکان، هۆیەکی کاریگەر بوو بۆ خاچیەکان، تا ئەو شار و ناوچانەی سەلاحەددین ڕزگاری کردبوون داگیری بکەن، له ساڵی (٧٣٠ک/١٣٢٩ز) قودس کەوتە ژێر دەسەڵاتی خاچیەکان، بەڵام خاچیەکان نەیانتوانی سوود لەم هەلە وەربگرن، بەڵکو ناکۆکی کەوتە نێوان سەردارەکانیانەوە به تایبەت پاش برینی یارمەتی ئەوروپا بۆ خاچیەکان، له ساڵی (٦٥٩ک/١٢٦٠ز) حوکمڕانی ئەیوبیەکان له شام به دەستی مەغۆل کۆتایی هات و له ساڵی (٧٣٢ک/١٣٣١ز) کۆتایی به ئەیوبیەکانی میسر هات و کەوتە ژێر چاودێری مەمالیک.[2] دامەزراندنی دەوڵەتێکی وا گەورە و به هێز له

---

(١). د. خاشع المعاضیدي واخرون: م.ن،ص ٢٦٥- ٢٧٣.

(٢). محمد ئەمین زەکی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ب٢/ ص١٣٣؛ صالح قەفتان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥٨.

ناو جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی لە وڵاتی میسر کە خاوەن شارستانیەتێکی یەک جار گەورەیە، خۆی لە خۆیدا کارێکی ئاسان و کەم نەبووە و پێویستی بە هەوڵ و خەباتی بەردەوام هەبوو بۆ پاراستنی ئەم دەوڵەتە گەورەیە و پارێزگاری لە

جیهانی ئیسلامی و لە چاوگرتنی بەرژەوەندی گشتی لە ئایین و ڕەگەز و ئابووری و کۆمەڵایەتی و شارستانی، ئەگەر بنەماڵەی ئەیوبی کوردی نەبووایە هەر زوو عەرەب و ئیسلامەکانی ناوچەکە لە ناو دەچوون بەهۆی هێرشەکانی خاچیەکانەوە، چونکە توانای بەرهەڵستکاری ئەو شاڵاو و پەلامارە گەورانەی ئەوروپیەکانیان نەبوو، ئەمەش بەهۆی نەبوونی سەرکردەیەکی عەرەبی بە توانا بۆ سەرکردایەتی ئەو هەموو شەڕانە، بەپێچەوانەوە کۆمەڵێک سەرکردەی کوردی بە توانا لە فەرمانڕەوایی کارگێری و فەرماندەیی هێزە سەربازیەکان لە مەیدانی جەنگ دژی خاچیەکان و بەرگری کردن لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات سەریانهەڵدا بوو.

## ئەنجامەکانی جەنگە خاچییەکان

هێرش و پەلاماری خاچیەکان بۆ سەر رۆژهەڵات، لە ئەنجامی کۆمەڵێک هۆکار و فاکتەری گرنگی تێکەڵ بە یەک بوو کە هانی دان بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم شەڕە پیرۆزە، لەوانەش خراپی سیستەمی دەرەبەگایەتی و ویست و هەوڵدانی جوتیاران و کۆیلەکان بۆ ڕزگاربوون لە برسێتی و هەژاری و بیرکردنەوە لە تالان و دەستکەوتنی سەرمایەی زۆر لە ڕۆژهەڵاتی دەوڵەمەندا، باشترین بەڵگەش بۆ ئەو حاڵەتە بڕینی هەزاران کیلۆمەتر بوو بە بیانووی ڕزگارکردنی گۆڕی مەسیحی نەزانراو کە بە خۆی ڕۆژهەڵاتی بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە ڕۆژئاواوە نەبووە، ئەمە جگە لە بیانووی گێڕانەوەی (خاچی خاچان- صلیب الصلبوت) کە مەسیحی لەسەر خاچ دراوە، هاوکات بەشداری کردنی دەیان میر و پاشا و خانەدان و پیاوە ئاینییەکانی ڕۆژئاوا لەگەڵ بازرگانەکانی ئیتاڵیا بۆ ئاسانکاری گواستنەوەی خاچیەکان لە ڕێگای دەریاوە بۆ ڕۆژهەڵات، جگە لە کاریگەری پاپا و کڵێسا لە وروژاندنی هەست و سۆزی ئەوروپیەکان، کە ئەمەش بۆ خۆی ڕۆڵێکی زۆری بینی لە پروپاگەندەی دەروونی و کۆنترۆڵ کردنی مێشکیان بۆ جێبەجی کردنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیان دوور لە بەرژەوەندیەکانی مەسیحیەت لە قاڵبی سیاسەتی دەرەوەدا، ئەمە لەلایەک و لە لایەکی تر پشێویی و نائارامی و ئاڵۆزی ناوچەکە بەهۆی ناڕێکی میرنیشینەکان لەناو خۆیاندا، و دەست تێوەردانی زلهێزەکان لە کاروباری دەسەڵاتی فاتمی و بیزەنتی، هەروەها لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسی بەدەستی سەلاجقە تورکەکان، جگە لە قەڕامیتەکان کە لە تێکچوونی بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی (المشرق الاسلامی) ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، هاوکات نەبوونی سەرکردەیەکی بەهێز و بەتوانا بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەودۆخە نائارامە لەگرنگترین هۆکارەکانی هەڵمەتەکانی خاچیەکان بوون.

لەم بارودۆخە نائارام و ئاڵۆزو پڕ پشێوییەی کە لەناوچەکەدا ڕوویدا بوو بەتایبەت لە میسر و وڵاتی شام، سەرکردەیەکی بەتواناو لێهاتوو دروست بوو، سەرەڕای ئەوەی لە نەتەوەی عەرەب نەبوو، توانی بەرەی ئیسلامی یەکبخات و هێز و ئومێد بۆ موسڵمانان بگێڕێتەوە و پاش سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر خاچیەکاندا گەورەترین شانازی بۆ ئیسلام و موسڵمانان و نەتەوەی کورد تۆمار بکات،

بەرادەیەک دۆست و دوژمنەکانی شایەتی لێهاتویی و گەورەیی و کارامەیی دەدەن، ئەو سەرکردە گەورەیەش سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبیە.

سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی یەکێکە لە کەسایەتیە هەرە گرنگ و بەناوبانگەکانی مێژووی ئیسلام و شەڕی خاچیەکان، ئەم ناوە لە کۆتایی سەدەی ٦ی کۆچی و ١٢ی زاینی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی هەژاند، و کەسایەتیەکەی جیهانی ئیسلام و ڕۆژئاوای ئەوروپی داگیرکرد، وەک سەرکردەیەکی بە توانا و لێهاتوو جێگای شانازی هەموو موسڵمانان و، هاوکات جێگای مەترسی خاچیەکان بوو، سەلاحەددین خاوەن مێژوویەکی پڕشنگدار و پڕ لە سەرەورییە، جگە لەوەی کە گەورەترین و ناودارترین سەرکردەی مێژووی کورد و ئیسلام بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ڕەنگە کەسێک تا ئێستا لە مێژووی ئیسلام بە ئەندازەی سەلاحەددین کاریگەری نەبوو بێت لە پاراستن و یەکخستنی ڕیزەکانی بەرەی ئیسلامی و ڕووبەڕووبوونەوەی گەورەترین مەترسی لەسەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی.

ئاشکرایە شەڕ و هەڵمەتی خاچیەکانیش بە ئامانجی ڕزگارکردنی میرنشینە مەسیحیەکانی ڕۆژهەڵات بوو لە دەستی موسڵمانەکان، بەمەش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕووبەڕووی بزووتنەوەی داگیرکاری بوویەوە لە لایەن ڕۆژئاوای ئەوروپای مەسیحیەوە، بە شێوەیەک پێشتر هیچ وڵاتێک یان ناوچەیەک هەڵمەتی لەم شێوەیەی بە خۆیەوە نەبینیو و، هەوڵیاندا لە ژێر پەردەی ئایین هەموو مەرامەکانیان جێبەجێ بکەن.

لەڕاستیدا پاپا بە خۆی هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی خاچیەکان بوو، بە هۆی ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە سەرووی بەرژەوەندییە گشتیەکانی مەسیحیەتەوە دادەنا، و لە ژێر پەردەی ئایینەوە مەرامە سیاسیەکانی خۆی جێبەجێ دەکرد، هاوکات لە پێناوی پاراستنی پلەوپایەی دونیایی خۆی کاری دەکرد نەک بۆ ئەو دوارۆژەی کە لە ڕواڵەتدا بانگەشەی بۆ دەکرد.

شەڕی خاچیەکان لە ناوەڕۆکەوە شکستی نەهێنا چونکە ئەم شەڕانە بە هەڵمەتی داگیرکاری ڕۆژئاوای مەسیحی بۆ ڕۆژهەڵات کۆتایی نەهات، بەڵام بە دەست بە سەراگرتنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بەسەر ڕۆژئاوا لەو کاتەی سەلجوقیەکان لە شاری (نیقیە) نیشتەجێ بوون، بە سەرەتای کۆتایی هاتنی

